## لەم ژمارەیەدا



الاشراف الفني : ص . ع


رۆشـــنبیری نـــوێ
گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتی مانگانەیە
دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات

سەرنووسەر
اسماعیل رسول

جێگری سەرنووسەر
فائق جمیل

# بەیادی سالی سەرکەوتنەوە

● هەر لەدێرزەمانەوە . . لەچاخی داریۆشەوە بگرە . تا شاعەباسی بزورگ و تا چاخی قاجارەکان و چاخی نادرشاو ئینجا حەمەرەزاو دواجار خومەینی . عەجەمە رەگەزپەرستەکان ویستویانەو ئەیانەوێ گەلانی (دراوسێ)یان بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە . . بۆ ئەم مەبەستەش هەزاران ئاژاوەو ئاشوب و شەڕو پیلان و هەرەشەو هێرشیان ناوەتەوەو لەم ناوچە گرینگەدا . بوون بە شملی شەڕی میللەتان و بەرۆکی پاشەرۆژی ئەو میللەتانەیان گرتوە . .

هەر بۆ نموونەو بەس : وابوو بە (٣٠٠) سال و مەسەلەی سنووری نێوان ئەم عیراقەی ئێمە وئەو ئێرانەی ئەوان تادێ ئالۆزتر دەبێ و دەپەنمێ و لە بازنەیەکی بۆشا ئەسوڕێتەوە . . جارەهای جاریش ئەبێتە مایەی هەڵگیرساندنی ئاگری بێ ئامانی جەنگ . . !

● بەم دواییەش . کاتێ کە رژێمی زیوال زیوال بوونی حەمە رەزای شای تاوانکارو نەفرەتلێکراو روخاو رژێمی خومەینی جێی گرتەوە . عیراقی ئێمە . بەگەل و حیزب و شۆڕش و سەرکروەکەیەوە . ئەم مەسەلەیەی وەك مەسەلەیەکی ناوەخۆو سەر بە ئێرانی دایەقەلەم و پڕ بەدڵیش نیازخوازی خۆیشی دەربڕی . کە حوکمگێرە تازەکانی تاران و قوم . لە واقیعی هەرەتازەی ئەم عیراقەی ئێمە تێبگەن و لاپەڕەیێکی تازەو پاك . لە



پێوەندیی دۆستایەتی نێوان ئێمەو خۆیان بکەنەوەو گۆشتەزون بەزامەکان بێنن‌و کۆنەوێنە ڕەشەکەی . ڕژێمە چەپەڵەکەی حەمەرەزای ڕاکردوو بسڕنەوە ورووبکەنە هەوارێکی خاوێنی هاوسێتی‌و دۆستایەتی‌و برگەو بەندەکانی . ڕێکەوتنەکەی «جەزایر» جێبەجێ بکەن‌و تاو بە خەباتی هاوکۆی گەلی عیراق‌و گەلانی ئێران . لە دژی ئیمپریالیزم و زایۆنیزما بدەن . .

عیراق . زۆر بەئارامەوە هەوڵی بێ‌پایانی دا . تا ئەو حوکمگێڕە سەیرانە . بخاتە سەر ڕاستە شەقامی مێژووی مرۆڤایەتی . کەچی هەموو هەوڵە پاکەکانی بێ‌هودەو مایە پووچ‌و بێ ئەنجام دەرچوو ۳۳ بنەك هەرئەمە . بگرە بەڵکو ئەو حوکمگێڕە ملهوڕانە هەر لەیەکەم مانگەی ڕوخاندنی کۆنە ڕژێمی شاوە . دەستیان بە هەڕەشەکردو ئاگری

دووبەرەکی یان خۆش کردەوەو کۆنە برینەکانیان خستە سوێ‌و دەساوێژە ئیعلامیەکانی خومەینی . لە ڕۆژنامەو تەلەفزیۆن‌دا . دەستیان کرد بە جوێندان‌و بە پڕۆپاگەندەی ناڕەواو بە بوختان‌و بەدرۆ ملیان بە شاڵاوهێنانەوەنا . بۆ سەر عیراق‌و بۆ سەر حیزبی بەعس‌و بۆ سەر شۆڕش‌و بۆ سەر شۆڕە سوارانی ئەو شۆڕشە . .

● لە جیاتی ئەوەی بێن‌و



چارەسەری زانستانەو پلانی وردەکارانە بۆ ئەو ملیۆنەها گیروگرفتە ئاڵۆزانە بدۆزنەوە . کە رژێمی شای ناپاك جیّ‌ی هێشتبوون . لە جیاتی ئەوە . ئەم رژێمە تازەبابەتە . رۆژ دوای رۆژ ملهوڕترو بەکەشوفشتر ئەبوون ورووییان لە ئازاردانی گەلی عیراق‌و شۆرشی عیراق کرد . دەستیان بۆ سەر خاکی پاکی عیراق درێژکرد . . کەچی عیراق هەر بەرگەی گرت‌و رێگەی پشوودرێژی گرتەبەرو گەلّی یادداشتنامەی نارەزایی بۆ حکومەتی تاران رەوانە کرد ، تا دەس لەو کارە نارەوایانە هەڵگرێت‌و واز لە پەلپگرتن بێنێ‌و یاری بە ئاگر نەکات . .

ئەمیش هەر بێسوود بوو . . کاری دوژمنایەتی‌و دەسدرێژی چەپەڵی تاران تا دەهات فراونتر دەبوو . تا بەجاریّ کاسەی عیراق پڕبوو . کار لەکار ترازاو بەچاری ناچاری . هێزە چەکدارەکانمان . بە بڕوایەکی پۆلایین‌و بە مەچەکێکی ئاسنینەوە ، بەرپەرچی ئەو پێدرێژیانەی مێژەر بەسەرانی قوم‌و تارانی دایەوەو بەرەنگاری چەتەکانی هات‌و هەندیّ لەو خاکانەی کە بەناهەق داگیرکرابوون رزگارکردو گەلّی شوێنی تریشی لە نێو قوولایی خاکی فارس‌و لە پێناوی خۆپاراستن‌و بەرگری لە خۆکردنا خستە ژێر دەست‌و دیموکراسی . ئەو سیناریۆیەی کە ئەهریمەن‌و بەچکە ئەهریمەنەکانی قوم‌و تاران داینابوو . بۆ خۆیان بوو بە مایەی بەڵاو کارەسات . بەمایەی شلەژان‌و تۆقاندن‌و شێتگیربوون . . بەمەیش عیراقی شۆرشگێڕ قادسیەی دووەمی بەرپاکردو لە قادسیەی صەداما . گەورەترین دەسکەوتی مێژوویی . وەدەس‌هێناوبوو بە سەرشارێکی تازە . لە رەوتی بزوتنەوەی شۆرشی گەلی بەجەرگی عیراق‌و سەرجەمی نەتەوەی عەرەب‌و رووبەڕوی نالەبارترین‌و کینەدارترین دوژمنێکی خوێنخۆرو رەگەزپەرست بووە ئەوەیشی بۆ دنیا ئاشکرا کرد . کە جەنگاوەری عیراقی بەچ گیان‌و ورەیەکەوە . بەچ بەخشش‌و لەخۆبوردنێکەوە . رووئەکاتە شەڕو لەمەرگ‌و لەشەهیدبوونی پڕ لە سەرفرازی سلّ ناکاتەوە . .

● هەر لێرەدا . ئەو کەسەی بەوردی لەهەمو لایەنێکی ئەم جەنگەو هۆیە مێژووییەکانی ئەم جەنگەو بەدرێژایی سالّێکی رەبەقی ئەم جەنگە . وردبێتەوەو بەوردییش لەکارە عەسکەریەکانی هێزە چەکدارە دلێرەکانی . بەرەکانی جەنگ رابمێنیّ . ئەگاتە گەلّی راستی‌و گەلی ئەنجامی ئاشکراو دیاریکراوەوە . لەوانەیش :

داستانی قادسیەی صەدام‌و لەئەنجامی رووبەڕووبوون‌و راکشانی بەردەوام‌و بەدرێژایی (١٠٠٠) کیلۆمەتری سنوورو لە ماوەی سالّێکی تەواوا . بەلّگەی ئەوەی دابەدەستەوە کە هێزی چەکداری عیراق ، خاوەن توانایەکی بیّ بن‌و یەکجار بەرزەو لە جەنگیشا لە پێشی هەرەپێشەوەی سەرانسەری سوپاکانی رۆژهەلاّتی ناوەڕاستەوە ئەوەستێت . .

هەر ئەو داستانو رووبەڕوبوونەش . بوەو ئەبێتە مایەی یەکالاکردنی هێزوتوانای هێزە عەسکەریەکانو ئەوەیشی دووپاتکردەوە . کە بەهیچ کلۆجێ ئۆردوی عەجەم . ناتوانێ جێ بە سوپای تێکۆشەری عیراق لێژ بکات . . چونکە سەرەرای ئەوەی . ئەم شەرەی عیراق . شەرێکی عادیلانەو رزگاریخوازانەیە . لەهەمان کاتیشا گەلێ هۆی سیاسیو مێژوویی بۆتە سەرچاوەی سەرکەوتنە پەیدەیەکانی سوپاکەمان . لەگشت کەرتو بەرەکانی جەنگدا . لەوانەیش :

راستە رێگەی تایبەتی عیراقو سوپاکەی . کە بەندە بەفیکری حیزبەوە . بەبەرنامە مەزنەکانی ئەو حیزبەوە . لە پێناوی گۆرانکاریەکی شۆرشگێرانەی بنەڕەتانەی شارستانێتی لە عیراقدا . سەرەرای ئەو دەورە دیارەی کە سەرۆکی خەباتگێرو ئازیز «صدام حسین» لە عیراقا ئەیگێرێت و بەزیرەکیو بەلێهاتوویی وبێ کۆڵدان . هەوڵی بنیادنانی ژیانێکی نوێی نێو عیراقێکی نوێو لەهەموو بوارێکی سیاسیو ئابوریو رۆشنبیریو کۆمەلایەتیو سوپاییدا . ئەدات . .

● لە پاڵ ئەوەشدا لەلایەك وابوو بە ساڵێکی رەبەقو هێزە چەکدارەکانمان . جڵەوی دەسپێشکەری لە کۆرو بەرەکانی جەنگا گرتۆتە دەستو شۆرشیش لە بزوتنەوەی سیاسیانەو دیپلۆماسیانەی خۆیدا رۆژ دوای رۆژ پێش ئەکەوێتو گەلەکەشمان سات دوای سات ، فێری مەشقکردنو فێری بەرگەگرتن وفێری هەڵگرتنی دلێرانەی باری سەرشان ئەبێتو تادێ ورەی بەرزتر ئەبێتەوە ولەخۆبوردوتر ئەبێت ، لەلایەکی ترەوە گەلی جگەرسوتاوو تێکۆشەری کوردی کوردستانی ئێراق ، گەلی بلوجستانو عەرەبستانو ئازربایجان . تاو بەخەباتی عادیلانەی خۆیان ئەدەنو داوای مافی رەوای نەتەوایەتیو مرۆڤانەی خۆیان ئەکەن وروبەڕووی بەیتو بالۆرەی کۆنەبازی «کۆماری ئەمری ئیسلامی ! !» خومەینی وموسلمانە درۆزنەکان ئەبنەوەو جەنگی رەوای ئێمەش چرکە دوای چرکە . بە توندیکار لە رێرەوی گشتی بەربەرەکانیێی سیاسی نێو ئێرانو سەنگەلای ئەکات . . بەلێ : لەپاڵ ئەمانەشدا هێشتا عیراقی سەرفراز . بەزمانی سەرکردە دلێرەکەی . سەرۆکی ئازیز صدام حسینەوە بەردەوام داوای وەستاندنی خوێنو شەر ئەکاتو جاری چارەسەری ئاشتیخوازانە ئەداتو بەمەبەستێکی چاكو بەدلێکی سافەوە پێشوازی لەهەموو «مەبەستە پاکەکانی» نێو دەولەتانی کردوەو ئەکات . بە شێوەێی ئەو چارەسەرە . ژیان بە بەرژەوەندیو بەمافە رەواکانمان لە خاكو ئاومان نەگەیەنێ . چارەسەرێکی بنەڕەتیانەی وابێت کە بەندبێ بە گیانی عەدالەتو مافە مێژووییو سیاسیەکانمانەوە . . کەچی حوکمگێرە سەرشێتەکانی تارانو ئاخوندەکانی قوم . هەر لەسەر رێبازی ملهورانەی شەرفرۆشتن دا بەردەوامن وگوێ بۆ هیچ جۆرە دەنگێکی خێرخوازانە راناگرنو بەرژەوەندی گەلانی ئێرانیان پێشێلکردوەو لەنێو خەونی ئاشوبا شاقنەو تلۆر ئەبنەوەو نایانەوێ ئەم ناوچەیە نەختێ داکاسێ ورووبکاتە بنیادنانو پاشەڕۆژێکی روناکەوە . .

هەربۆیەشە ، سەرۆکی فەرماندە (صدام حسین) لە ئەنجامی ئەو کەللەرەقیو ئەو شەرفرۆشتنەوە بەزاتێکی مەوزوعیانەوە بلێ :

«کەر فارسی دوژمن ئەیەوێ درێژە بەجەنگ بدات . با درێژەی پێبدات . تائەو رۆژە دێ . تەواوی مافە رەواکانمانی لێ ئەستینین . .» .

چونکە گەلی نەبەزی عیراقو سوپای دلێری عیراق . هەمیشەو بەردەوام . لە ئەوپەری ئامادەبوون دایە . بۆ چوونە نێو ئاتوفی جەنگو درێژەدان بەو جەنگەو لە پالیشیا بەرگری کردن لە کەرامەتو دەسەلاتداریێتی خۆی لە خاکی عیراقا . تا ئەو رۆژە دێ یا حومگێرو ئاخوندەکانی قومو تاران بەشێوەیەکی قانونیانەو ئاشکرادان بەمافە رەواکانی عیراق بنێنو واز لە شالاوی رەگەز پەرستانەی خۆیان بێننو دەس لەکاروباری ناوەخۆی ولاتەکەمان وەرنەدەنو رێز لە دەستورو عورفی نێو دەولەتان بگرن . یا هەر بەجارێ ئەم جەنگە - بێگومانیش هەروایە

ئەبێتە مایەی روخاندنی دەستەو دایەرەو چەتەکانی خومەینی ورژێمی خومەینی . کە بەمەیش بێگومان بنچینەی ئاسایشو دۆستایەتیەکی راستەقینەو پێوەندیەکی پاکی مرۆڤانە . لەم ناوچە گرگرتوەدا دائەمەزرێو گەلانی ناوچەکەیش . نەخوازەللا گەلانی ئێران دوا رۆژو ژیانی ئاسودەیان دابین ئەبێت .

بێگومان سەرکەوتن هەر بۆ دادو مرۆڤایەتیو راستیو هێزی چاکەیە . . نغرۆبوونیش هەر بۆ نێروی رەشو چەپەلو ناڕاستە . . !

● باهەر بشەکێتەوە ئالای سەرکەوتنمان لە قادسیەی صەداما .

● نەمریی بۆ گیانی پاکی شەهیدانی مافو نیشتمان .

● سلاو لە رۆلەی وەفاداری گەل ، سەرۆك صدام حسین .

# هەلبژاردەیەك لەو وتارە مێژوویەکەی سەرۆك فەرماندە دەربارەی هەلوەشانەوەی ڕێکەوتننامەکەی جەزایر

ئیمپریالیزم بە درێژایی چاخەکانی کۆن هەموو هۆیەکی دەسکەوتووی بۆ لاوازکردنی نەتەوەی عەرەبو کرنۆشی پیێدان بەکارهێناوە بۆ ئەوەی بیخاتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوەو زەویو فەرو کەلکەکانی بۆ خۆی بەکاربهێنێ مەترسی دارترین شت کە ئیمپریالیزمی بەریتانیاو فەرەنساو . ئیمپریالیزمی ئەمریکاو . هەموو هێزێکی ئیمپریالی چاخی نوێ دژی نەتەوەی عەرەب کردوویانە . دروست کردنی قەوارەی زایۆنیە . لە سایەی دۆخێکی مێژوویی زانراودا . بۆ مانەوەی پارچە پارچەیی نەتەوەی عەرەبو . لاوازکردنی . واتە تەخت کردنی ڕێگای چەوساندنەوەو دەسەلات بە سەریا پەیدا کردنە .

دوای ئەوەی کە لەزەوی خاکی فەلەستینی داگیر کراودا قەوارەی زایۆنی دروستبوو . فازانجو خواست و سیاسەتی تایبەتیشی پێکهات کە. هەندێکیانی لە قازانجو مەبەستو سیاسەتی ئیمپریالیزمەکانەوە وەرئەگرت ، لەکاتێك‌دا کە هەندێکی تر لەوان تایبەتیەکی دەستنیشانکراوی دەست ئەکەوت .قەوارەی زایۆنی لە دروست بوونی‌یەوە تا ئەمرۆ هەر لەلایەن ئیمپریالیەتی جیهانی‌یەوە نەپارێزراوە . بگرە لەلایەن ئەو زایۆنزمە جیهانی‌یەوە کە لەگەلیٚ وولاتانی جیهان‌دا هەن کە هۆی مەترسی داری بۆ دەستەلاتو کار تیٚکردن . خزمەتی ئەم قەوارەیە ئەکەن و بە هۆو بەهێز یارمەتی ئەدەنو . پیلانە فراوان کردنە دوشمنایەتی‌یەکەی دژی نەتەوەی عەرەبی بۆ ئاسان ئەکەن . قەوارەی زایۆنی نەك هەر مەخفەرێکی پێشەوەیی بۆ ئیمپریالیەت . بگرە هەر لەو کاتەدا لەم ناوچە بەکەلکەی جیهان‌دا بۆ زایۆنی ڕەگەزپەرستیو . بۆ خواستو قازانجو مەبەستی بلاوبونەوەی . بۆتە مەخفەرێکی پێشەوە .

قەوارەی زایۆنی لە ماوەی سی سال‌دا لە ڕۆژی دروست بوونیەوە تا ئەمرۆ پێویستی خویٚ لە پارچە پارچەکردنو لاوازکردنی توانای نەتەوە لە ڕاپەڕینو پێشکەوتن‌دا جیٚبەجیٚ کردووە . . هەروەك جیٚبەجیٚی‌کرد . کە هەلی بۆ ڕێکەوت بۆ دەست درێژیو بلاوبوونەوە لە خاکی عەرەب‌دا .

**هەل و مەرجەکانی شەڕی تشرین**

ئەمە لایەکی مەسەلەکەیە . لەیەکەی پێش . براینە . ڕۆژگارو هەلو مەرجی ئەو جەنگەیە کە عیراق لەشەڕی تشرینی سالی ۱۹۷۳ دا دەستی‌دایە .

ئەوەبوو بەبیٚ ئاگادارکردنی عیراقو بەبیٚ‌ئەوەی ماوەیەکی تەواوی ئەوەی هەبێت خۆی ئامادە بکات شەڕ لەگەلٚ قەوارەی زایۆنیزم‌دا هەلگیرسا ، بەگوێجان لەگەلٚ هەلویستی عیراقو‌لێپرسراوی‌ی نەتەوەیی خۆیدا ، چار نەبوو دەبوو لەم جەنگەدا بەشداری بکات ، ئیتر ئامانجو سروشتی ئەو کەسانەی نەخشەیان بۆ کێشابوو هەرچیبوو بیٚتو سروشتی پەیوەندی عیراقیش بەو ڕژێمانەوە کە لەشەڕەکەدا بەشداربوون هەرچونێك بوو بێت . لەو کاتەدا هێزەکانی عیراق لەبەرەی ڕۆژهەلات‌دا هەلیان دابوو لەدژی دەستدرێژی ئیران لە زەوی‌ی نیشتمانی لەپارێزدا بوون . جا بۆ ئەوەی عیراق هەلو مەرجێکی لەبار بۆ بەشداری کردنی هێزەکانی خۆی لە شەڕ لەگەلٚ زایۆنی‌ی دوژمن سازبکات . ئەنجومەنی سەرکردایەتی‌ی شۆڕش لە حەوتی تشرینی یەکەمی ۱۹۷۳ دا بەیاننامەیەکی دەرکرد تیٚ‌دا دووپاتیٚ کردەوە کە عیراق ئامادەیە لەگەلٚ ئیران گیروگرفتەکان بەرێگەی ئاشتی چارە سەر بکات . پاشان هێزە لێدەرەکانی خۆی ناردە سووریا . کەوا شەرافەتمەندیی پاراستنی دیمەشق لە کەوتنە دەستو ڕاگرتنی کشانی سەهیونی‌ی بۆ سەر خاکی سووریایان وەرگرت .

**براینە .**

پاش مۆر کردنی ڕێکەوتننامەی ئادار - ۱۹۷۵ گەلیٚ گفتو گۆو هاموشۆ کرا بۆ ئەوەی بەندەکانی بەجیٚ بگەیێنرێت . بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بە هێلکیشانی سنوورو چەسپاندنی کۆلەکە سنووری‌یەکانو کاروباری تری شێوە هونەری‌یەوە هەبوو .

هەرسیٚ پرۆتوکۆلە بنەرەتی‌یەکەی سەر بەو ڕێکەوتننامەیەش مۆر کران . کە بریتین لە پروتوکولی سنوور کێشانی ڕووبارو پرۆتوکۆلی کێشانی سەر لە نویٚی سنووری ووشکانیو پرۆتوکۆلٚ ئاسایشی سەر سنوور . . ئەوەبوو هەر زوو لایەنی ئیرانی کەلکی لە ڕێکەوتننامەی دیار کردنی سنووری ڕووبار لە (شط العرب) دا وەرگرت . بەلام جیٚبەجیٚ کردنی پرتوکۆلی تایبەت بە سنووری ووشکانی وەختێکی سەرباری پێویست بوو ،

ئەمەش کارێکی ئاسایی بوو .

ئێمە بۆ ئێوەی دووپات دەکەینەوە . هەروەك بۆ جیهانی دووپات دەکەینەوە . وەك چۆن لەمەوبەر وابووین . چاومان لە دامەزراندنی پەیوەندی دراوسێ باشی یە لەگەڵ وڵاتانی دراوسێدا بەتایبەتی ئێران . عێراق هیچ چاوی لەخاکی ئێران نەبڕیوە . دیسان نیازمان نیە هەرگیز بەشەر پەلاماری ئێران بدەین یان بازنەی زۆران بازی بگەیەنینە دەرەوەی سنووری بەرگری کردن لە ماف و رێزمانی و ئێمە بەوانە دەڵێین کە لە خۆبایی بوون لە ئێران کوێری کردوون و ئارەزووی گومان لێکراویان گەیاندونیەتیە ئەوەی بە نهێنی و ئاشکرا لە لایەن هێزەکانی ئیمپریالی و زایۆنیەوە ، هەڵسوڕێن . پێیان دەڵێین لەسەریانە دەرس لە رۆژانی رابوردو وەرگرن کە سوپای ئازامانی (زين القوس) و (سيف سعد) مەخفەرەکانی سنووریان بە هەڵوێستی پیاوانی ئازا سەندەوە . بانگیان دەکەین بۆ وەڵام دانەوەی دەنگی حەق و عەقڵ کە داوای پاراستنی دراوسێ باش دەکا لەگەڵ عێراق و نەتەوەی عەرەب . تەنیا بەوە دەتوانی خزمەتی گەلەکەیان بکەن ئەگەر بەراستی دڵسۆزن بۆی . هەر بەوەشی دەتوانن بیسەلمێنن شۆڕشگێڕن و نۆکەری هێزەکانی ئیستعمارو زایۆنی نین و رەگەز پەرست و دواکەوتوونین و قین لە دڵ و دوژمن نین بەرامبەر نەتەوەی عەرەب کە بیانەوێ فیتنەو ئاژاوە لە ریزەکانیان بنێنەوەو دابەش و بێ هێزی بکەن بە پێی نەخشەی زایۆن و یەکگرتوو لەگەڵیا وەك ئەنجام عێراق هەمیشە قەڵایی پۆلایین و خۆڕاگرتو دەبێ بەرووی هەموو داگیرکارو دەست درێژکاریدا عێراق هەمیشە مەرکەزی پاڵپشتی هەموو هێزێکی سەربەستی خوازو پێشکەوتن و خێر خواز دەبێ لەجیهان دا عێراق هەمیشە قەڵای نەتەوەی عەرەب دەمێنێتەوە .

## هەڵبژاردەیەك لەبەیاننامە مێژوویەکەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بۆ بەرپەچدانەوەی چاو چنۆکی رژێمی رەگەز پەرستی ئێران

نەتەوەی نەبەردی عەرەبمان .

لەو باوەڕەدابووین کە تاقە فەرمانڕەواکەی ئێران لە پەندەکانی رۆژانی رابوردوو سوود وەردەگرن پاش ئەوەی هێزە چەکدارە . نەبەزەکانمان خاکی داگیرکراومانیان لەسەر سنووری رۆژهەڵاتی عێراق رزگارکردو پاش ئەوەی دەستەڵاتی نیشتمانی بەسەر شط العرب دا گەڕایەوە بەڵام کورەزاکانی مەجووسی یەکان ئەوانەی لە کۆنەوە رقیان لە عێراق و نەتەوەی عەرەب هەڵگرتووەو دەستیان لە نەخشە گومان لێکراوەکان دا هەیە لە بێ مێشکێتی ی خۆیان و کارە دژە سوپایی یە کوێرانەکەیاندا بەردەوام بوون و لە دوو رۆژی رابوردوودا و لە ئەم رۆژەش دا چەند هەوڵێکیان دا بۆ ئەوەی هێڵی کەشتی رانی لە شط العرب و لە کۆتایی یەکانی دا لە کاربخەن ئەوانەی دەچنە سەر هێڵی کەشتی رانی لە کەناری عەرەب دا ئەویش بە بۆردومان کردنی کەشتی یە ناسوپایی یە عێراقی و بێگانەیانە کە دێنە شط العرب و لێی دەچنە دەرەوە هەروەها هێرشی ئاسمانی زۆرو فراوانیان کردووەتە سەر سوپای پاڵەوانمان و نەفیری گشتی یان راگەیاندووەو ئاسمانی ئێرانیان بەستووە ئەو کارەی کە دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە ئەوان بازنەی بەربەرەکانێی سوپایی یان فراوان کردووەتەوەو باریان گەیاندووەتە رادەی جەنگی فراوان لەبەر ئەوە ئەنجومەنی سەرکردایەتی ی شۆڕش بریاری دا فەرمان بەهێزە بەجەرگەکەمان بدرێت دەستی توندوتیژ لە بنکە سوپایی یەکانی ئێران بوەشێنێ بۆ سەرکوت کردنی نەخشەکانیان و نەخشەکانی گەورەکانیان کە دەیانەوێت خۆ لە قەرەی دەستەڵات و ئاسایشی عێراق مەزن بدەن .

ئەی گەلی مەزنی عێراق

ئەی رۆڵەکانی نەتەوەی نەبەردی عەرەب ئەی رۆڵەکانی ئێران لە هەموو نەتەوەو ئایین و تایەفەیەك . . ئێمە مەبەستمان ئەوە نەبوو زیانتان پێ بگەیەنین و هیچ تەماحیکیشمان بە خاکی ئێوە نی یە بەڵام خومەینی ی ستەمکاری دەجاڵ و دەستەودایەرەکەی ویستیان بیکەنە جەنگێکی ستەمگەری دژ بە ئێمە رقێکی بێبیانوو و نەزانراو بەرانبەر بە عێراق و نەتەوە پاڵی پێوە ناوون و ویستیان پیلان بۆ عێراق و نەتەوە دروست بکەن (انهم يكيدون كيدا واكيد كيدا) صدق الله العظيم - .

ئەی رۆڵە ئازاکانی هێزە چەکدارەکانمان . . بەیارمەتی خودا بە ئێوە سەردەکەوین وەك چۆن لە جەنگەکانی پێشوودا سەرکەوتین و دەست درێژ کەر داگیر کەرەکان ژێردەکەون ئێتر سڵاوتان لێ بێت .

**صدام حسین**
**سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی ی شۆڕش**
**فەرماندەی گشتی ی هێزە چەکدارەکان لە ٢٢ ئەیلووای ١٩٨٠ دا .**

## سەبارەت نەخشەی پێشووتری دەست در یژی لە لایەن دەستو دایەرەی خومەینیەوە دانپیانانی مسعود رجوی بەڵگەنامەیەکی نوێیە بو تاوانبارکردنی رژێمی فارس !

● لە دووژمنانی نەتەوەی عەرەبو لەوانە کەوا هەڵگری نەژادنامەی عەرەبین زۆرکەسی بێشەرمو شۆ هەن کەوا سالی بە سەر جەنگی عیراقو ئیران‌دا تێدەپەڕێ بە ئەنقەست سوورن . لەگەڵ ئەو هەموو راستیو بەڵگەنامەو نیشانەو دەرخستنەدا بەئەنقەست سوورن لەسەر ئەوەی کە ئێران نە دەستدرێژکەرەو نە ئەو دەستپێشکەری جەنگی کردووەو نەئەورۆژی ١٩٨٠/٩/٤و پێش ئەویش بۆردومانی دێهاتو شارەکانی سەر سینووری کردووە . ئەوانە لەگەڵ سووربوونی پێشویان‌دا بەئەنقەست خۆیان لەو راستیانەی کەوا پەیوەندیان بە پاشلی جەنگو هۆکانیو رەوتەکانی‌یەوە هەیە گێل دەکەن . خۆیان‌لەو وتە ڕەسمیە فارسیانەی کەوا بە ئاشکرا داوای ناردنە دەرەوەی (شۆرش)و دەستخستنە ئیشو کاری ولاتانی ترەوە گێل دەکەن . لەوەش کەوا عیراق لەم بوارەدا بە رێی بەڵگەنامەو یاداشتو بەیاننانەو پەیوەندی کردن پێش جەنگو لە کاتی جەنگدا پێی هەستاوەو چی بلاوکردۆتەوەو دووپاتکردۆتەوە خۆ گێل دەکەن دیسانەوە لە هەموو ئەو زانینانەشی کەوا پەیوەندیان بە حزبی دەعوەی بە کرێ گیراوەوە هەیە کە دەستەو دایەرەی فارس خۆیان سەرپەرشتی دەکەنو یارمەتی دەدەن خۆ گێل دەکەن ئەوانە ئێستاش وای دادەنێن کە ١٩٨٠/٩/٢٢ رۆژی دەستپێکردنی جەنگەو هەر وەك تووتی زورناکانی چی لێدەدەن ئەوە دەلێنەوەو هەر لە سەر ئەو ئاوازە راگەیاندنی فارس سەبارەت گۆڕانەکانی مەیدانی جەنگو دەربارەی ئەو گۆرانانەی کەوا لە رووی سیاسی‌یەوە وەك هەڵوێست بەرامبەر لیژنەکانی ناوبژیکارانو ئەوشتانەش کەوا لایەنی زۆری دەوڵەتانی وەك بزوتنەوەی ولاتانی بێلایەنو رێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامیو کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان کەوا پەیوەندیان پێوەی هەیە بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکی بە شێوەیەکی ئاشتیانە کە پێشکەشیان کردووە ئەمە سەرباری بانگەوازەکانی عیراقو هەڵوێستە چاکەکانی عیراق کە لەم رووەوە لە هەموو بۆنەیەكدا ئاشکرای کردووە کەوا چاوی نەبریوەتە بستە خاکێکی ئێرانو نایەوێ شێرانی‌یەکان بێدەرەتان بکاتو مەبەستیشی لەمە زیاتر نیە کەوا دان بە مانی نیشتمانیو نەتەوەی‌یەکانی‌دا بنێو پەیوەندی هاوسێی باشو هەریکاری لە سەر بنەرەتی پێویستو ئاشکرا لە نێوان ئیرانو عیراق‌دا هەبێت چی‌بلێ ئەوانیش هەر ئەوە دەلێنەوە .

بەلام ئەوانەی کە وەك واقعو گۆران دەریان خە-رەفتاریان بەقایل‌بوونی خۆیان نیەو رەفتاریان دژی زانینانەیە کەوا لایان هەیە هەروەها رەفتاریان دژی قازانجەدای عیراقو نەتەوەی عەرەبە بەتایبەتی مافەکانی‌عیراق لەخاكو ئاوی خۆی‌داو مافەکانی نەتەوەی عەرەبیش لە دورگەو ئاوی خۆی‌داو بەرگری کردن لە ئازادیو سەرفرازی . لەبەر ئەوە بە جۆرێکی ناپەسەند سەبارە بە هەموو ئەو خراپەکاری‌یەی ئێران کەوا عەرەبایەتی گرتۆتەوەو کاکلی ئیسلامی گرتۆتەوە بێدەنگ بوون بە دووبارە بەشێوەیەکی ناشیرین بەرامبەر ئەو هەرەشانەی فارس کە یەکسەر روویان لە بەحرەینو ولاتانی کەی کەنداوی عەرەبە دەنگیان لێوە نایە . هەروەها لەعاست هەڵوێستی فارسی

ڕەگەز پەرست دەربارەی سێ دورگەکەی عەرەب‌و ورتەیان لە
دەم نەهاتە دەرێ لە دوای‌دا سەبارەت زانیاری‌و خراپەکاری کە
هاریکاری نێوان فارس‌و زایۆنی لە بوارەکانی سوپاو ئاسایش‌و
بازرگانی‌دا ئاشکرا کرد دەنگیان نەکرد ! !؟ نەك هەر ئەمە بگرە
دوژمن‌و ئاژاوە ڕێکخەرەکان‌و خۆ بەدەستەوەدەران ئەو دەمە
دژی ڕاستی جوڵانەوە کەوا سەرومر بوون لە بەرگری کردن لە
ڕژێمی فارس‌و بەڵگە پەیدا کردنیان بۆ لادانەکانی‌و تاوانەکانی‌و بۆ
جوان کردنی رووە ناشیرنەکەی بەشێوەیەکی عەرەبی‌و
دەوڵەتیانەو تەقەللای دانیان بۆ سووك‌کردنی ئەو هێرش‌و تاوانبار
کردنەی کە لە لایەن دەوڵەتان‌و عەرەبەوە درابووە پاڵیان . بە
کورتی ئەوانە بەرامبەر بە ئەهریمەنی فارس هەڵوێستی پارێزەر
ڕاوەستان‌و ئەمەش جگە لەوەی کە هەڵوێستی ئاشکراو
شاراوەیان بۆ پشتگرتنی فارس‌و مانەوەی پێویست‌و درێژە پێدانی
دەستدرێژی لە رووی دارای‌و سووپای‌و پێویستی‌یەکانیەوە
یارمەتیان دەدا بەوانە هەموویان دەڵێن کە دەبێ باش‌و بە وردی
گوێتان لە وتەکانی ئەهلی بەیتی ئێران بێت بەتایبەتی ئەوانەی کە تا
ماوەیەك لەگەڵ دەستەو دایەرە چەپەڵەکەی کاربەدەستانی فارس
لە ئێران‌دا ڕۆیشتن‌و باش بینیان کە چۆن پیلانەکان درووست
دەکرێ‌و چۆن ڕاستی‌یەکان دەکرێنە درۆو چۆن تاوانەکان
ڕادەپەرێنن‌و چۆن نەخشەی دەسدرێژی بۆ سەر عیراق‌و
نەتەوەی عەرەب دەکێشرێ ئەوانە دیان کەوا مەلاکان ماوەیەك
بوو چۆن دەستدرێژیان بۆ سەر عیراق ڕێك دەخست‌و دووبارە
بینیان کەوا لە ناوخۆی عیراق‌داو لە ناوخۆی وڵاتانی کەی
کەنداودا مەلاکان خۆیان یەکسەر لە پشت ئەو کارە
نارەوایانەوە بوون کەوا ڕوویان دەداو ڕەگەزە فارسی‌یە بەکرێ
گیراوەکان پێ‌ی هەڵدەسان .

سعود رجوی سەرۆکی ڕێکخراوی مجاهدی خەڵك لە
هەموو هەموویان لە وتە ڕۆژنامەنووسی‌یەکەی‌دا بۆ ڕۆژنامەی
لۆماتانی فەرەنسای زیاتر ئەمەی رون کردەوە کە وتی
شریتی‌تۆمارکراوی هەیە کەوا بریتین لەدەنگ‌و فەرمانی ئایەت‌و
مەلاکان‌و دژی عیراق داوای کردنی کردەوەی ڕاچڵەکان
(استفزاز) دەکەن‌و هەروەها کەوتی خومەینی لە هیتلەر خراپترەو
ئەو دەستەو دایەرەیەشی کە لە دەورو پشتین هەر لە ڕێگر
دەچن . هەروەها ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تێپەر دەبێ‌و ڕاستی نوێش
سەبارەت پەیوەندی‌یە گومان لێکراوەکانی کاربەدەستانی تاران
دەربارەی ئەو دەورە پیس‌و ناشیرنەی کەوا لە ناوچەکەدا
دەیگێڕن بۆ قازانجی ئیمپریالیەت‌و زایۆنیزمی هاوپەیمانیان
دەردەکەوێ کە دوای‌یەکانیان ئەو ڕاستیانەیە کە پەیوەندیان بە
هاریکاری فارس‌و زایۆنیەوە هەیە . ئەو هاریکاری‌یەی کە بە
شێوەیەکی ڕەسمی‌و بە دوورو درێژی درا بە هەموو لایەنە
دەوڵەتی‌و عەرەبی یەکان‌و لە ڕێگەی بەشی چاردێری کردنی
قازانجەکانی ئەمەریکا لە بەغدا بە ئەمەریکاش درا دەربارەی
تێکەڵ بوونی بەم مەسەلەیەو بەتایبەتی کف ئەو بارستەی
چەکدارکردنە ر چەکی ئەمەریکاو پارچەی تەقەمەنی درووست
کراوی ئەمەریکا دەگرێتەوە . هەروەها ئەو بارستەیە بە دوورو
درێژی بە نوێنەرانی دیبلۆماسی بێگانەدرا ئەوانەی کەوان لە
بەغداد . ئەمە بێجگە لە جامعەی عەرەبی‌و بزوتنەوەی وڵاتانی
بێ‌لایەن‌و ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی .

ئێستاش دوای ڕوون‌بوونەوەی مەبەستی فارس‌و پەیوەندی
داریان‌و دەوریان‌و بارستای ئەو یارمەتی‌یە دەوڵەتیانەی ناوخۆی
ڕژێمەکەیان بۆچی تا ئێستاش دوژمنانی عەرەبایەتی‌و بەزیوەکان
لە کاربەدەستانی عەرەب لەگەڵ ئەوەی کە وێنەی
دەسەڵاتداریێتی فارس ناشیرینترو ڕەشتر دەبێ‌و مەترسی‌دارترین
مەترسی بۆ ئێران‌و بۆئاسایشی‌و بۆ ئارامی ناوچەکە درووست
دەکات . بۆچی لەسەرئەوەو دەستبەرداری لادانە
یەکلابووەکەی فارس نابن .ئایا ئەمە رقێکی سەرومرە کەوا
بەرامبەر بە عیراق‌و بەرامبەر بە عەرەب هەیە یاخود ئەمە
پێویستی‌یەکانی ناپاکی‌و شێوازی خایاندنی خزمەتی نەخشەکانی
ئیمپریالیەت‌و زایۆنیزمە لە هەموو ناوچەکەداو ئایا شایەتی
فارسەکان خۆیان کە ئەوە دەڵێن بەس نیە . ئایا وتەو هەڵوێست‌و
خراپەکاری‌یەکانی لێپرسراوانی فارس خویان بەس نیە ئایا شایەتی
ناوبژی‌کاری دەوڵەتانی وەك کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان‌و
هەردوو لێژنەی بزوتنەوەی وڵاتانی بێ‌لایەن‌و کۆنگرەی ئیسلامی
بەس‌نیە ئایا وێنەی لاوازی ئێستای ئێران لە نێوان دەوڵەتان‌و لە
لایەن‌و کۆنگرە دەوڵەتی‌یەکان‌دا بەس‌نیە . یاخود چاوەڕێ‌ی
نیشانەو ڕوون‌کردنەوەی زیاترن یان تاوانبار کردن‌و بەڵگەنامەو
پیلان‌و تاوانی زیاترن . . ئەو هیوایانەیان کە نەهانەدی‌و ئەو
گرەوانەی کە بە درێژای یا ساڵێ سەریان‌نەگرت هەمیشە هەر
نایەنەدی‌و سەرناگرن ئەمەش لەبەر هیچ‌نا لەبەر ئەوەنەبێ کە
ئەوانە لەگەڵ هیچ پووچی دان‌و دژی ڕاستین‌و لەگەل دوژمنی
ڕاستی دان‌و لەگەل دوژمنانی عەرەبایەتی‌دان‌و دژی عەرەب‌و
لەگەڵ دوژمنانی ئیسلام‌دان دژی کاکڵی نرخەکانی ئیسلام .



# جەنگی قۆلی رۆژهەلات
# تێبینی یەکانی مانگی دووانزە

● جەنگی قۆلی رۆژهەلات یەکەم جەنگە لە مێژووی تازەی عەرەبدا کە دوانزە مانگ بە بەردەوامی عەرەب سەرکەوتووە . دیسان یەکەم جەنگیشە لە مێژووی جیهاندا دوای جەنگی دووەمی جیهان کە ئەو ماوە دوورو درێژە بخایەنی و لایەنی سەرکەوتوو بە سەرکەوتووی بێنێتەوە . دوای ئەوە یەکەم جەنگیشە کە عەرەب تووشی بووەو تێی دا سەرکەوتووەو دوای سەرکەوتن و گەیشتن بە لووتکە بە هێزو باوەر بە خۆبوونەوە داوای وەستانی جەنگەکەو گفتوگۆکردنی خێرانە دەکات .

ئەم جەنگە لە پێش ئەمانەش داو لە پاشانیش یەکەم جەنگە لە مێژووی هاوچەرخ دا کە وولاتێك لە وولاتانی جیهانی سێ هەم بەرپای دەکات . بە بێ ئەوەی پشتی بە دەولەتێکی جیهانی بەستبێت . کاتێ کە بریاری دا بەرەو رووی دوژمن بوەستێ و پارێزگاری لە ناموس و گەورەیی خۆی بکات بە پالپشتی وولاتێکی گەورەو هاندانی لە لایەن هەلوێستێکی سیاسی بە هێزەوە نەبوو . بەلکو پشتی بە خۆی و ؛ وڵەی وولاتەکەی خۆی بوو .

عیراق بەم رێرەوەی دا وەکو گیانێکی ئاشکراو دیارە «بریاری خۆرزگارکردن»ی وا ئەنوێنێ کە دەولەتێکی بچووکەو رێگای سەربەخۆیی خۆی گرتووەو دوورە لە تەبەعیەت و هاوپەیوەندی یەوە . جەنگی عیراق و ئێران بە کردەوە نارەواکانی چەتە فارسەکانی ئەمرۆی تاران دەستی پی کرد ، ئەو کردەوانەی کە دووپاتی کارە بۆگەنەکانی شاو خێزانی شا دەکەنەوە ، ئەویش بە هەلپە بردنە سەر خاك و ئاوی خەلکی و داواکردنی فراوان کردن و گۆرینی نەخشەی جوغرافی و راستی یەکانی مێژوو . . .

دوای ئەوەی کە دەستی کرد بە تەقاندنەوەو پروپاکاندە کردنی درۆو دەلەسەو جەنگی چەکەمەنی جۆراوجۆر وەکو بوردمانکردنی خانەقین و مەندەلی و زرباتیەو نەفت خانەو دەستدرێژی کردنیان بۆسەر دەزگا ئابوریەکانمان و مەلبەندەشارەوانی یەکان . بەو بوغرابوونەوە کە هیچ هێزێك نی یە بتوانێ بەرهەلستی سوپای فارسەکان بکات لەوەی کە بەغدا داگیر ئەکەن . . . بەلکو رادیۆی تاران ئەم هەوالەشی گەیاند : «هێزەکانمان چەند شارێکی عیراقیان داگیر کردووە لە نێو ئەو شارانەدا . . . بەغداو . . .موسل . . .)بۆ ئەوەی وورەی سەربازەکانیان بەرز بکەنەوە . ئەو سەربازانەی کە پروپاکاندەی حکومەتەکەیان چاوی کوێر کردوون . بەم نەخشە دانراوانەیاندا لایان وا بوو کە هیچ عەرەبێك دەم ناکاتەوەو فزەی لێوە نایەت . بەلام بەگژدا چوونەوەی عیراق بە مەردانەو هێزو توانەوە بوو پێویست بە باسکردن ناکات کە چۆن بوو تا ئێستاش بەردەوامە .

لە عیراق دا شۆرشێکی نەتەوایەتی پێشکەوتنخوازو نەخشە بۆدانراو هەیە کە بزوتنەوەیەکی شۆرشگێرانەو تێکۆشەر رابەپەرێنی و بەرێوەی دەبات

ئەو بزوتنەوەیەش (حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیا لیستە . . .
لە عیراق دا سەرکردایەتیەکی قارەمان لە ناو جەرگەی دلی



میللەتەوە ڕاپەڕیوەو تاڵی و سویری ژیانی لەمەو پێشی چەشتووە .
ئەو سەرکردایەتی‌یەش سەرکردایەتی مێژوویی (صدام حسین)ە . . .

لە عیراق‌دا گەلێکی یەکگرتوو پتەو هەیەو ڕاستەوخۆ پەیوەندە بە شۆڕش‌و ئامانجە گەورەکانی‌یەوە . ئەم گەلەش بە هەموو نەتەوەو ئاینەکان‌و کەمایەتی‌یەکانیەوە لە هەموو گرەوێك گەورە ترە . . . لە عیراق‌دا سوپایەکی جەرگ قایم‌و ئازا لە نێوان بیروباوەڕی نەتەوایەتی‌و عەقیدەی شەڕو شارەزایی کاروباری سەربازی‌دا کۆبووەتەوە ئەم سوپایە پێش جەنگی عیراق‌و ئیران جەنگی تشرین‌و چەندەها جەنگی تری بینیوە .

ئەم شتانەی کە باسمان لێوە کردن بوونە هۆو پالپێوەنەر بۆ ئەوەی دوژمن چاو ببڕێتە وولاتەکەمان‌و دەست درێژکاتە سەر دام‌ودەزگا ئابوریەکانمان هەر ئەو هۆیانەشە هەموو دوژمنانی ئێمەی لەیەك سەنگەردا کۆکردۆتەوە . هەر هەمان هۆیش وای لە هەندێکی تر کردووە کە خۆبپارێزی‌و دوورە پەرێز بوەستێ . لە هەمان کات‌دا ئەو هۆیانە بە لایەنی باشەوە وای لە وولاتانی براو دۆست کردووە کە بە مەردی‌یەوە بە دەنگمانەوە بێن . بەلاَم زۆر بە دڵگرانی‌و تاڵی‌یەوە ئەڵێم هەندێ وولاتی عەرەبی تر لەگەڵ دوژمن‌دا بە یەکەوە ڕاوەستاون‌و پالپشتی ئەوان ئەگرن .

لە نێو وولاتە عەرەبەکان‌دا عیراق هیچ وولاتێکی والێ نەکردووە کە لە ڕوودا دابمێنێ . زیاد لە پێویست ئەرکیشی نەخستۆتە سەر هیچ برایەکی عەرەبی . . . لە ڕووی جیهانیشەوە . عیراق کاروباری سەربازی‌و سیاسی خۆی کە بەرێوەی ئەبات لەسەر ئەو بنچینەیە نی‌یە کە پشتی بە هاورێیەکی جیهانی بەستبێت . یان چاوەڕوانی یارمەتی لە هێزێکەوە بکات . بەڵکو عیراق لەو هەڵوێستەوە حساباتی خۆی دامەزراندووە کە دەست درێژی کراوەتە سەری . وەکو لەوەو پێش باسمان لێوەکردن‌و دووپاتمان کردەوە و تا ئێستاش لی‌ی پەشیمان نی‌یە . . . ئەگەر وا نەبوایە . . . ئەوا جەنگ پی‌ی نایە مانگی دووانزەوەو ڕێی ڕاستی نەتەوایەتی کە حزبی بەعسی خستوویەتی‌یە ڕوو ڕۆژ دوای ڕۆژ دەگەشێتەوەو دووپات دەبێتەوە .

هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی سەرکردایەتی‌و هێزو توانای بە دەسەلاَتیان هەردەم پەرە دەسێنی‌و یەکێتی برایەتی نەتەوەکان‌و ئاینەکان‌و کەمایەتی‌یەکان ڕۆژ بە ڕۆژ پتەو ترو بەتین تر دەبێ . . . . هێزە چەکدارەکانیشمان دلێرانە نەبەزانە دەچنە مەیانی جەنگەوەو مەردانە دەستی دلێرانە دەوەشێنن‌و ڕۆژ بە ڕۆژ سەرکەوتنی نوێ تۆمار دەکەن . باسکردنیان بە ئازایەتی هیچ کاتێ جی‌ی گومان نەبووە . جەنگ پی‌ی ناوەتە مانگی دوانزەیەوەو ئەوانەی کە نیازیان وا بوو بەغدا داگیر بکەن‌و دەست بەسەر عیراق‌دا بگرن . ئەمڕۆ هەموو شتێکیان لە کیس چووەو هەموو یاریەکانیان دۆڕاندووە . تەنها گرەوێ کە مابێتەوە بە دەست میللەتەکانیانەوەیە . بڕواشمان وانی‌یە کە ڕۆژگار ئەوەندە درێژ ببێتەوە نەتوانین هێزو توانای میللەتەکانیان نەبینین بۆ بردنەوەی گرەوەکە .

# یەکەم لێدوان دەربارەی دەست درێژیەکانی رژێمی فارسی بۆ سەرسنورەکانمان

**هێزی نەبەردی سنووریمان زیانێکی زۆر . بەگیانوماڵەوە . بە رەگەزپەرستە فارسەکان دەگەیەنن**

دوێنێ قسەکەرێکی رەسمی لە وەزارەتی ناوخۆدا رایگەیاند کە هێزەکانی رژێمی فارسی رەگەزپەرست . لە کاتژمێر ١٧٠٠ی رۆژی ٢٣ی مانگی رابردوودا . ئاگری تۆپەکانی ئاراستەی شوێنی هێزەکانمان کردووە لە ناوچای جوارکلاوو شوێنی مەفرەزەی تایبەتی لە نباری چیای (بمو) کە دەڕوانێتە سەر «باویسە» .

قسەکەرە رەسمی یەکە لە لێدوانێکی دا بۆ ئاژانسی دەنگوباسی عراق دا . ووتی کەوا هێزەکانمان بەرپەچی هێزەکانی رژێمی فارسی‌یان دایەوەو . تۆپبارانی مەڵبەندێکی ئوردوگای ئەم هێزانەیان کردو بووە هۆی کوشتنو بریندار بوونی دەیەها لێیان .

قسەبێژەکە لەسەری رۆیشتوو و ووتی : هێزەکانی رژێمی فارسی لە کاتژمێر ٩٣٠ ی رۆژی ٢٤ ی مانگی رابردوو . بە تۆپە ناوەندی‌یەکانیانی . شوێنی سەرسنووری (موسی الکاظم)و ئاشکگەی (احد) و (عبد الرحمن الداخل) . وە شوێنەکانی مەفرەزەی تایبەت لە بناری چیای (بمو) کە دەڕوانێتە سەر «باویسە» . بوردومان کردووە .

وە هێزەکانمان بەرپەچیان دایەوەو . دەستبەجێ بێدەنگیان کردن . . دوای چارەکە سعاتێك . هەمان هێز دووبارە شوێنەکانی – جوارکلاو–ی بۆردومان کردەوەو . هێزەکانمان یەکسەر بەرپەچی دایەوەو لێدانێکی چاکیان بە سەنگەرەکانیان گەیاند .

قسەبێژەکە رووونی کردەوە کەوا لە کاتژمێر ١٧٣٠ی رۆژی ٢٥ ی مانگی رابردوو . ژمارەیەك لە هێزەکانی رژێمی فارسی بە خۆیانو ئەجهزەی لاسلکیانەوە لە تێروانگەی ئێرانیەوە بینراون . وە بە دەبابەوە لە چوارکلاو سەرقاڵ کرانو . . تێروانگەکەش هەنگێوترا . وە لە کاتژمێر ١٧٤٥ی هەمان رۆژدا . هێزەکانی رەگەزپەرست رووی چەکی ناوەندی‌یان کردە سەنگەرەکانی (بدر الکبری) لە هەمان ناوچەدا . وە لە کاتژمێر – ١٨٤٥ – یشەوە دووبارە ئاشکگەی (عبد الرحمن الداخل) یان بە هاوەنو تۆپی ناوەندی‌یەوە بۆردومان کردەوە . وە دوای چارەکە سعاتێك تەقە وەستاو . هێزەکانمان هەردوو نێشکگەی (تیلکو) و (حوان) و تێروانگەیەكو ئوردوگایەکی هێزەکانی رژێمی فارسی رەگەزپەرستیان بۆردومان کردو زیانێکی زۆریان پێگەیاندن .

قسەکەرەکە ووتی . هێزەکانی فارسی لە کاتژمێر ٩٤٥ی

رۆژی ٢٦ی مانگی رابردوودا . به تۆپی ناوەنجی ، سەنگەرەکانی سەربازی له چوارکلاوو هەردوو ئێشکگەی (بدر الکبری) و (عبد الرحمن الداخل) یان بۆردومان کرد . وه هێزەکانمان بەرپەرچیان دایەوەو . تەقەکەش سی‌وپێنج دەقیقەی خایەند . وه له کاتژمێر ٩٥٠ی هەمان رۆژدا . هێزەکانمان . شوێنەکانی هێزەکانی رژێمی فارسی بەکرێگیراو له ئاشکگەی (هوان) و (تبەرش) و (کرونو) و (تبەدرویش) و دوو سەنگەری تۆپ‌و هاوەنی دوژمنیان بۆردوومان کردو زیانێکی باشیان پێگەیاندن .

قسەکەرەکە پەنجەی بۆ ئەوە درێژکرد کەوا هێزەکانی رژێمی فارسی له کاتژمێر ١٤٠٠ی هەمان رۆژدا . به تۆپی ناوەندی‌ی . شوێنەکانی هێزەکانمانیان بۆردومان کرد . وه هێزەکانمان بەرپەرچی دایەوەو سەنگەری تۆپەکانیان بۆردومان کردن . وه له کاتژمێر ١٦٤٥یش‌دا دووباره شوێنی سەربازی له – چوارکلاو – یان بوردوومان کردەوەو تۆپەکانمان تۆپینەی تۆپەکانیانیان بۆردومان کرد .

وه پاش چارەکه سعاتێك دەنگی تەقه نەما .

قسەکەرەکە ووتی : هێزەکانی رەگەزپەرست له کاتژمێر ٥٣٠ ی رۆژی ٢٨ی مانگی رابردوودا . به تۆپی قورس‌و دەبابەوە . سنووری کەرتی (قوارتو)و ئێشکگەی (حذیفه)یان ئاگربارانکرد . وه هێزەکانیشمان بەرپەرچیان دایەوەو . وەك ئەوان . بۆردومانی کردن .

وه له کاتژمێر ٨٠٠ ی هەمان رۆژدا . هێزەکانی رژێمی فارسی . به هاوەن‌و چەکی قورسەوە . ئێشکگەکانی سنووری (الحسین القدیم)و (المقداد) و (قتیبه الجدید) و (الأحنف الجدید) یان دەستدرێژ کرد . وه هێزەکانمان بەرپەرچی ئەم دەستدرێژی‌یەی دایەوەو . وەك ئەوان . تەقەیان لی‌کردن . تەقەکەش یەك کاتژمێرو نیوی خایەند .

وه له کاتژمێر ١٠٢٥یش‌دا دووباره هەمان هێز . به چەکی قورس‌و هاونەوە . ناوچەی نێوان هەردوو دێی (قامشلان) و (بابیر)ی بۆردوومان کردو . هێزەکانمان بەرپەرچی دایەوە .

له کاتژمێر – ٩٣٠ – یش‌دا هێزەکانی رژێمی فارسی ئاگری تۆپەکانیان بەسەر مەفرەزەی تایبەت له ناوچەی (چوارکلاو) باراند . وه تۆپەکانمان توانیان تۆپێکیان تێك‌بشکێنن‌و زیانێکی زۆریان پی‌بگەیەنن .

لەپاشان . هێزەکانمان رووی تۆپیان دایه ئارمانجەکانی دوژمن له (کردنوا) و (کنوفلامیحان) و (جکرون) .

وه له کاتژمێر (١٨١٥)ەش‌دا ، هێزەکانی فارسی له ئێشکگەی (شکروه)ەوه . به تۆپی قورس‌و دەبابەوە . ئێشکگەی سەرسنوور (یثرب) مانیان ئاگربارانددا . وه هێزەکانمان بەرپەرچی دایەوەو ئێشکگەکەیان بۆردوومان کرد ، وه دەبینرا چۆن سەربازی دوژمن بۆ دواوەوه رادەکەن‌و هەڵدێن‌و ، هێزەکانمانیش له سەنگەرەی (فیروزخان) دا تەقەو دەست رێژیان لی دەکردن .

قسەکەرەکە ووتی : هێزەکانی رژێمی فارسی له کاتژمێر ٥٣٠ی رۆژی ٢٩ی مانگی رابردوودا . هێڵەکانی تێروانگەی هەردوو ئێشکگەی (یثرب) و (الصادق) یان دایه بەر تۆپ . وه له کاتژمێر ٧٠٠ یش‌دا هەمان هێز به تۆپی قورس‌و هاوەنەوە . ئێشکگەی سەرسنوور (الاحنف)ی بۆردوومان کردو . هێزەکانمان بەرپەرچی دایەوە . تەقەکەش سی کاتژمێر بەردەوام بوو .

له کاتژمێر ١٣٠٥ یش‌دا . هەردوو ئێشکگەی سەرسنوور (قتیبة)و (الاحنف) . له لایەن ژمارەیی له چەتەکانی رژێمی فارسی بۆردوومان کران‌و هێزەکانی هەردوو ئێشکگەش بەرپەرچیان دان‌و ناچاریان کردن بەرەو خاکی ئێران سەرشۆڕ بکەنەوە .

قسەکەرە رەسمی‌یەکه ووتی : هێزەکانمان له کاتژمێر ٧٠٠ دا بەرپەرچی ژمارەیی له چەتەکانی فارسی‌یان دایەوه که بەرەو ئێشکگەی (قتیبة) ئەهاتن . وه دوای ئەوەی چەندیان لی زامدارو بی‌سەروبەر بوون . هەڵاتن .

قسەکەرەکە زیاتر لەسەری رۆیشتوو و ووتی : فرۆکەیەکی شەرکەری سەربە فارسەکان له کاتژمێر ٢٠٠٠ ی رۆژی ٢٨ی مانگی رابردوودا . له کەرتی سنووری بەسرەدا . سنووری ئاسمانیانی بەزاند . لەهەمان کاتدا پێنج ئۆتۆمبیلی سەربه رژێمی فارسی که سەربازیان هەڵگرتبوو . بەرەو ناوچەی بەرانبەر رەبیعەی نمره (١) کەوتنەری . وه هێزەکانمان دەستدرێژیان کردن‌و زیانێکی زۆریان پێگەیاندن .

قسەکەرەکە له کۆتای لێدوانەکەی‌دا . دوپاتی کرد کەوا هیچ زیانێك . نه به شت نه به گیان . به هێزەکانمان نەگەیەنرا . وه زۆر رشت‌و ئامادەن بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر دەستدرێژی‌و دوژمندارێتێك گەر هێزەکانی رژێمی فارسی رەگەزپەرستی بەکرێگیراو بیکەنه سەر سنوورمان .

# سەودای مێژوویی ناکۆکی عەرەب و فارس

ل نوێی کردوویەتی بە کوردی

●

ڕووداوەکانی جەنگی نێوان عیراق‌و ئێران زۆر بەخەستی سەلماندوویانە کە ئەم جەنگە شێوەیەکی توندو تیژی ناکۆکی نێوان عەرەب‌و فارسە . . . جگە لەوەی کە بەهەموو شێوەیەکی یاسایی‌و جوگرافیایی‌و رامیاری تەواو عەرەب خاوەنی مافی راستەقینەیە لەمەسەلەکەدا . . . هەندێ لایەنی مێژوویی تر هەن کە رێگای ناکۆکییەکە خۆش دەکەن‌و گەورەی دەکەنەوە . . . ئەگەرچی هەڵوێستی رەسمی هەندێ لەسەرکردایەتی‌یە عەرەبەکان هەوڵی سەرنگوم کردنی بنەما مێژوویی‌یەکانی ناکۆکی‌یەکە دەدەن . . . ئەویش باتاڵۆز کردنێکی دروستکراوی مەسەلەکە یا بە بەهانەی بەشداری‌کردنی ناتەواوە دژی زایۆنیزمی رەگەزپەرست دەیانەوێ ململانێ لەدژی رەگزپەرستێتی فارسی خاوکەنەوە . . . ئەو هەولانە هەموو ئەگەرچی لە دەروونێکی پاکیشەوە هەڵقولاًبن لەگەڵ ئەوەش‌دا هیچ هەل‌و مەرجێکی بەجێیان تیا نیە پەردە لەرووی پاکانە پێچ‌و پەنادارو نارەواو نابەجێکانیان رادەماڵێ‌و ئاشکرای دەکا کە مەبەست لەو هەڵوێستانەیان فرت‌و فێڵ‌و قاچ‌و قوچ‌وهەڵخەڵەتاندنی جەماوەری عەرەبە .

ناکۆکی نەتەوەی عەرەب دژی رەگەزپەرستێتی فارسی دیاردەیەکی کاتیی نیە کەلەئەنجامی بارودۆخی شۆرشگێرانەی عیراقی نوێ‌وە هاتبێتە کایەوە . . . ئەمە بەشێکی زۆر بچووکە کە بەهەموو رەگەزە دژ بەیەکەکانی‌یەوە لەزەمانی مێژوویی دەپچرێن . . . لەراستیش‌دا ئەمە بەشە رواڵەتەکەیەتی . خۆ ئەگەر هات‌و لەم دژکاری‌یەدا پرسیارکردن رەواو بەجێ‌بوو . . . ئەوە بەهەڵەدا دەچین ئەگەر لە عاستی ناکۆکی عیراق‌و ئێران‌دا لەسنووری گۆشەی یاسای ولاًتان‌دا راوەستین . . . ئەگەر راستبێ عیراق داوای مافی رامیاری‌و جوگرافیایی خۆی دەکات . . .و ئەو مەسەلە مافکارییانە هۆی راستەوخۆی بەیەك‌دا چوونەکە بێ . . . ئەوە راست‌و بەجێ نیە هەرگیز

دڵیان بەوەندە ئاوبخواتەوە . . . بەڵکو دەبێ بەقووڵایی مێژووی ئەم مەسەلانەدا بچینە خوار . . . بۆ ئەوەی بگەینە بنج و بناوانی کێشەکە لە قووڵایی مێژووی ناوچەی عەرەبیدا ، هیچ گومانیشی تیادا نیە کە ئەم ململانێیە لەپێش پەیدابوونی ئاینی ئیسلامەوە بەرپابووەو عەرەبی عیراق بەر لەپەیدابوونی ئیسلام بۆ بەرگری کردن لە ئەدگارو تایبەتێتیو خودی شارستانیەتی عەرەبیو کەسایەتی نەتەوەیی خۆیان لەدژی هێرشیو شالاوەکانی فارسەکان راوەستاونو بەرپەرچیان داونەتەوە . . .

● **تێبینییەك دەربارەی مێژوو** :-

یەکێ لەو وشانەی کە دەکەونە گێروگازی زانستیو فەلسەفییەوە وشەی (مێژوو)ە . . . هەروەها یەکێ لەو هەڵە گەورانەی کە ناکەوێتە جوغزی بۆچوونی روانینکارییەوە ئەوەیە کە مێژوو لە قەوارەیەکدا بەند دەکا . . . بەو بیانووەوە کە گوایە مێژوو کۆمەڵێ رووداوو کرداری کەڵەکە بووەو دەوری خۆی بینیوەو رەگەزەکانی ئێستا لە نەشونما کەوتوونو بوون بەهەواڵو دەنگوباسی ئاسایی . . . مێژوو بەخششێکی بەجێی رەگەزە هەرە چەسپو بتەوەکانی ژیانی نەتەوەیەو سەر بەرابوردوو ئێستاو داهاتووشەو لە رێرەوێکی یەکانگیردا پێ بەپێی ئەوانو لەبارێکی بەجێدا هاوبەشی جووڵەو خامۆشی دەکات . . . هەرگیز ناشێ مێژوو بەبەشێکی مردوو یا مۆمیاکراوی نەتەوە دابنێین . . . بەڵکو بارێکی زیندووی رۆشنبیریو دروستبوونی دەروونی هاوکۆیەو رەگەزە بنەرەتییەکانی دروستبوونی نەتەوە ئەخاتە روو . . . بەم پێیە دەتوانین ئێستاو پاشەرۆژیش بەمێژوویی ناو بەرین . . . هەروەکو فەیلەسووفی ئیتالیایی–بندیتوکروتشم–دەڵێ :

«مێژوویەك نیە رابوردوو بێ ، هەموو مێژوویەك هاوچەرخە» هەموو هاوچەرخێکیش کۆمەڵێ رەگەزی مێژوویی تیایە کە رەنگو رووی کاکڵەو جەوهەری پاشەرۆژ پێکدێنێ . . . پێ بەپێی ئەم گریمانە زانستییە دەتوانین رادەی پێشکەوتنی جیهانی ئێستا لێدەینەوە . . . شۆرشی رووسی لەدایك بوونی بیری مارکسی نیە کە لەرۆژهەڵاتی ئەورووپاوە هاتووە ، بەڵکو خەسترین دەربڕینی رەگەزەکانی نەشونما کردنی نەتەوەی رووسیە کە ئایدیۆلۆژیەتی مارکسی خستە قەوارەیەکی ئەوتۆوە کەهەموو رەنگورووی نەتەوایەتی بگرێتە خۆی . .

هەروەها لەچینیش هەمان ئایدیۆلۆژی وای لێ کرا کە لەگەڵ باری نەتەوایەتی چیندا بگونجێ . ناکۆکی نێوانی سۆڤیەتو چینیش رەنگدانەوەی چەسپترین رەگەزەکانی نەتەوەیی چینو رووسە . . . وهەر دەشبوو رۆژێ لەرۆژان بکەونە ململانێ . . .

هەر بەو پێرەوە دەتوانین قۆناخی تلۆقو پەنەمانی ئیمپریالزمی ئەمەریکایی لێکبدەینەوە . . . هەندێ لەمێژوو نووسەکان بەتایبەتی ئەمەریکایییەکان شارستانیەتی ئەمەریکایان بەزادەی دوو چەرخی رابوردوو دادەناو بەس . . . ئیتر وایان پێشان دەدا هیچ رەگو بنەمایەکی دێرینی نیە . . . شارستانیەتی ئەمەریکایی لە کاتێکدا دروست بو کە ئەورووپای سەدی هەژدەمین لەسستیو خاویدا دەژیا چ لە لایەنی سوپاییو چ لەلایەنی شارستانیەتو چ لەلایەنی رۆشنبیرییەوە بەواتایەکی مێژوویی شلو شاوبوو نەیدەتوانی نامەیەکی مێژوویی بگرێتە ئەستۆی خۆی کە مەودایەکی مرۆڤایەتیو جیهانیی دووربڕی هەبێ . . .

ئەورووپا دەیویست بەتالانو گزی مادیو رۆشنبیری شارستانیەتی خۆی دروست کات ، کۆڵیشی لەوەدا کە ئەو شارستانیەتە مێژووییو پێشکەوتوو بێ . . . هەرچەندێ لەسەدەی نۆزدەمیندا ئەورووپا گەلێ دەسکەوتن مادیو پیشەسازی وەدیهێنا بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کوێرەوەی کۆمەڵایەتیو ئابووری تەشەنەی کردو مۆرکی چینایەتی بە شارستانیەتەکەیەوە ناو لەلایەنە مرۆڤایەتییەکەی دوورکەوتەوە . . . ئا ئەمە مێژووی ئەورووپایەو لە هەمان کاتیشدا مێژووی نادیارو ناراستەو خۆی ئەمەریکایە . . . بەمپێیە رەگەزەکانی مێژووی ئەمەریکا لە رەگەزەکانی مێژووی ئەورووپا خەسترو بەهێزترە چونکە جگە لەمێژووەکەی خۆی مێژووی گەلێ زەویو نەتەوەی ترو گەلێ هێزو وزەی دی تێ رژاوەو ئامێتەی بوە . . .

مێژووی ئەورووپا لە چوار سەدەی رابوردوودا بارو دۆخی ئێستاو پاشەرۆژی ئەمەریکا شیدەکاتەوەو دەیسەپێنێ . . . لەبەر ئەوە شتێکی ئاساییە لەسەرەتای دروستبوونیدا جۆرە دیموکرایەتێکی مرۆڤایەتی ئامێز بکار بێنێ بۆ تازەکردنەوەو بووژاندنەوەی هێزو وزەی ئەوروپایی لەکۆمەڵگای ئەمەریکاییدا . دوایش بخزێتە سووچی گۆشەگیرییەوە بۆ ئەوەی ئەو رەگەزانە خەستتر بکاتو لەبەرەبەیانی دوای کۆتایی هاتنی شەری جیهانیی دووەمدا ولاتە یەکگرتوکانی ئەمەریکا بکاتە چڵێسترین ئەمپراتۆرییەت لە جیهاندا . . . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو رێرەوە مێژوویییەی لە چوار چێوەی شارستانیەتی ئەورووپاوە گەیشتە ئەمەریکا . . . لە بۆتەی کۆمەڵگای

ئەمریکادا هەر مایەوەو بوو بەگەلەکۆمەیەکی سەختی ئەو رەگەزە بەهێزانەی کە پەیژەیەکی رەوشتکاری پێکەوەیان دەبەستێ کە بناغەکەی لەسەر خۆپەرستی‌و فەلسەفەی بەرژەوەندی تاکە کەسی دامەرزاوەو هەروەکو کیسنجەر وتوویەتی (کوێرەوەری گیانبی) لە خودی کەسایەتی دانیشتوانی ئەمریکادا دروست کردووە . . .

**● نارەسەنایەتی مێژووی شارستانیەتی فارسی :**

هەوڵماندا پێرەوێکی خەست‌و خوڵ بۆ خوێندنەوەی مێژوو بچەسپێنین . . . بەلام هەولی شیکردنەوەی مێژووی کەسانی تر نادەین بەڵکو هەول دەدەین کە کارێکی وابرەخسێنین رووداوەکان خۆیان لەرێرەوێکی بەجێو پوختەوە لە خۆیان بدوێن‌و پەردە لە رووی خۆیان هەلمالن . . .

«فارسی»و «ئێران» زاراوەیەکە ئیمپریالیزم دروستی کردووە بۆ ئەوەی لە پەنایەوە بوار بۆ دەسەلاتی رەگەزپەرستێتی فارسی بەسەر نەتەوەکانی تردا بکاتەوە . . . وەختی خۆی فارس (ئیمبراتۆریەتی قورش)-۲۵۰۰-پ ز/ بوونێکی کۆمەلایەتی‌و رۆشنبیری دژوار بوو یەکێتی‌و گونجاندنی تیا نەبوو شایانی باسیشە ئەو دوو دیاردەیە مەرجی بنەرەتی‌و سەرەکین بۆ هەلگرتن‌و بلاوکردنەوەی پەیامی مێژوویی . . . دەولەتی فارسی لەوەختی دروستبوونیەوە ئیمبراتۆریەتێکی لە لای رۆژهەلاتی شارستانیەتی عەرەبی‌یەوە . . . دامەزراندبوو ئەو ئیمبراتۆریەتە ئیمبراتۆریەتێکی سوپایی فارسی بوو کۆمەلێ لەو وەچەو بنەچانە فەرمانرەوایی‌یان کردوە کە توانیویانە بەپێی تاقیکردنەوەکانیان دەزگا رۆشنبیری‌و کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌یەکان بخەنە ژێر رکێفی دەزگا سوپایی‌یەکانەوە . . .

دیاردەی هەرە سەیری ئیمبراتۆریەتی فارسی لە هەموو مێژوودا ئەوەبوە کە هەمیشە پشتی بەکۆمەلێ چەکداری نۆکەرو بەکرێ گیراو بەستووە کە فارس نەبوون‌و بەپارە گرتوونی . . . ئەمەش وای لە سوپاکەی کردبو کەببێتە دژوارترین نموونەو دڕندەترین سوپای وێرانکارو دوژمنی شارستانیەت . . . جوانترین نموونەی ئەو دڕندەیی‌یەش ئەو هێرش‌و شالاوە نالەبارانە بوو کە رەگەزپەرستێتی فارسی کردیانە سەر شارستانیەتی بابل‌و هەتاتوانیان کاول‌و وێرانیان کرد .

بەلام لەگەل ئەوەش‌دا کە مۆرکی رەگەزپەرستێتی فارسی مۆرکێکی سوپایی بوو . لاوازوبی‌هێزبوو . . . شەرەکانیان لەگەل عەرەب‌و نەتەوەکانی تردا شلۆقی لایەنی سوپایی‌و باری کۆمەلایەتی‌و رۆشنبیری‌و شل‌و شاوی بوون‌و خوو نەریتی فارسەکانی ئاشکرا کردو سەلماندی کە لاوازن . . . ئەوە بوو لەشەری -ذی قار- دا کە لەگەل عەرەب‌دا کردیان‌و لە شەرەکانی گەل رۆمەکانیشدا تێکشکان‌و دەزگا سوپایی‌یەکانیان پرش‌و بلاو بوونەوەو ترس دایگرتن . . . هەرچەندێ ئیمبراتۆرەکانی فارسی بەسەرگەرمی‌یەوە هەولی ئەوەیان‌دا کە جۆرە ئایدیۆلۆژیەت‌و باوەرێکی‌وا بێننە کایەوە لەگەل رەگەزپەرستێتی‌و لووت بەرزێتی خۆیان‌دا بیگونجێنن بۆ ئەوەی بتوانن باری ناناسوودەیی‌و پاشاگەردانی کۆمەلگای هەرەسهێناوی پێ‌بپارێزن‌و بیکەنە کوتەکێك خزمەتی بەرژەوەندی دوژمنکاری‌و بەربلاوی خۆیان بکات دژی نەتەوەکانی تر . بەلام ئەو کارە کەلکی نەبوو رۆژگار ئەوەی سەلماند کە دەزگای سوپایی بەتەنیا ناتوانێ ئاسوودەیی لە کۆمەلگادا بەرپا کات . . .

یەکێ لەو رێگایانەش کە بۆ پینەو پەرۆکردنی باری شلۆقیان هێنایانە کایەوە ئاینی زەردەشتی بو کە لەسەر بیناغەی پەرستنی شتێکی هەستپیکراو دامەزراوەو کەکەلکی هەیە ئەو شتەش ئاگرە . . .

مەجووسییەت ئەگەر چی لەبیرو باوەردا فەلسەفەکاری دەکاو وادەگەیەنێ کە رووناکی‌و تاریکی جمك‌و دوانەن . . . هتد

بناغەی جۆرە ئاژاوەیەکی رەوشتیاری‌و کۆمەلایەتی دامەزراندوە ئەو ئاژاوەیەش لە بیروباوەری جوولانەوە تازەکانی فارسەکان‌دا وەکو (قرمطی)و (بەهائی)و -بابی-و حەشاشی یەکان‌دا سەری هەلداوەو دەرکەوتووە . . . راستی‌یەکەشی ئەوەیە ئەو بزووتنەوە گیانیانەی کە لەناوەرۆك‌دا دوژمنی ئیسلام‌و عەرەبن لەبناغەدا لەسەر بەرەلایی ئارەزووی دەروونی مرۆڤ دامەزرابوون‌و هاتبوونە کایەوەو ببوونە چەرخی لەدایك بوونی جۆرە بەرەلایی‌یەکی کۆمەلایەتی‌و ئابووری .

بیروبـــاوەرەکـــانی (مـــانی) ش-۲۱۵-۲۷۲- لەزەردەشتی‌یەوە پەرە پێداوەو ئاینی-مانی-دامەزراندوو . . . وبیروباوەری زەردەشتی خستۆتە بۆتەی بیری رامیاری‌یەوە ئەویش بۆ ئەوەی رێگا بۆ رەگەزپەرستێتی فارسی خۆش کات . . . لەو مەسەلەیەش‌دا-شاپور-شا-پشتی دەگرێ . . .

مانی دەستی کرد بەئامێتە کردنی ئاینە کۆنەکان‌و مەسەلەی (دوانەیی گەردوون)- رووناکایی‌و تاریکی-لەمجووسییەت‌و (پەی

پی‌نه‌بردن) ی له بوزیبه‌ت‌و (سیانه‌ی پیرۆز)ی له عیسایی‌یه‌وه وه‌رگرت‌و بۆ ئه‌وه‌ش که له‌نرخ‌و به‌هاو پیرۆزی په‌یامی پێغه‌مبه‌ران‌و ئاینه ئاسمانی‌یه‌کان بشکێنێ گه‌لێ درۆو ده‌له‌سه‌ی بۆ هه‌ڵبه‌ستن به‌راده‌یه‌ك وتبووی حه‌زره‌تی عیسا شه‌یتان بووه . . .

له گه‌ڵ په‌یدابوونی - مزده‌ك - دا - ٤٨٧ - ٥٢٣ - ز . . . ئایدیۆلۆژیه‌تی ره‌گه‌زپه‌رستێتی فارسی گه‌یشته ترۆپك‌و به‌وه‌ش له‌رووخان‌و هه‌ره‌سی هێنان نزیك بوونه‌وه . . . مزده‌ك فه‌لسه‌فه‌ی زه‌رده‌شتی‌و مانی تێکه‌ڵ‌و ئامێته کردو ئـاینی مـزده‌کی دامـه‌زرانـدو له‌سه‌رده‌می-قباذ - شا-دا-٤٨٨-بوو به‌ئاینی ره‌سمی ده‌وڵه‌ت‌و خه‌ڵکی فارسی به‌ره‌و پیری چوون‌و به‌مه‌ش باری کۆمـه‌لایـه‌تی کـه‌وتـه مه‌ترسی‌یه‌وه . . .بیروباوری مزده‌کی له‌سه‌ر بناغه‌ی به‌ره‌لایی کۆمه‌لایه‌تی دامه‌زراوه‌و هیچ خووره‌ووشتێکی به‌رزی کۆمه‌لایه‌تی تیا نیه . .

مێژوو نووسی عاره‌بی-ابن الندیم-ده‌ڵێ :(مزده‌ك فه‌رمانی پی‌دان که به‌ئاره‌زووی ده‌روونی خۆیان رابوێرن‌و بخۆن‌و بخۆنه‌وه‌و جووت بن‌و هاوبه‌شی ژن‌و خێزانی یه‌کتر بکه‌ن له‌رابواردن‌دا) ئه‌وه‌شی خوو نه‌ریتێکی کرژوکاڵی مرۆڤه‌و مرۆڤایه‌تی له قۆناغه سه‌ره‌تایی‌یه‌کانی‌دا پیادا تێپه‌ریبوو . . .

ئا ئه‌مانه‌یه کۆڵه‌که سه‌ره‌کی‌یه‌کانی شارستانیه‌تی فارس ئه‌و شارستانیه‌ته پووچه‌ڵه‌ی که له گه‌ڵ سه‌ره‌تای ده‌رکه‌وتنی ئاینی ئیسلامی مه‌زن‌دا . هه‌ره‌سی هێنا . . . شه‌ری قادسیه ململانێیه‌کی مێژوویی بوو له‌نێوان شارستانیه‌تێکی تازه هه‌ڵکه‌وتوودا که هه‌موو هه‌ل‌و مه‌رجێکی به‌رده‌وامی‌و مێژوویی تیا بوو له‌نێوان قه‌واره‌یه‌کی شارستانیش‌دا که هه‌موو ره‌گه‌زه‌کانی داته‌پین‌و هه‌ره‌س هێنان‌و ته‌فروتوونا بوونی تیادا کۆبوو بۆوه . . . له‌وانه خواست‌و ئاره‌زووی ده‌روونی‌و ئاژاوه‌و رقه‌به‌رایه‌تی‌و ده‌زگایه‌کی سوپایی که‌پێشه‌ی وێرانکاری وتالان‌کردن بوو به‌ترسی‌و له‌رزده‌ژیا . . .

به‌کورتی تای ته‌رازووی ململانێکه له‌گه‌ڵ لایه‌نی ره‌گه‌زه‌کانی قۆناخی مێژوویی نوێ‌دا بوو . . ئه‌و قۆناخه‌ی که عه‌ره‌ب‌و ئیسلام ناوه‌رۆکی جه‌وهه‌ری بوون‌و مرۆڤایه‌تیش مه‌به‌سته‌که‌ی‌و هه‌نگاوی خێرخوازی‌و خۆشه‌ویستی‌و ئاشتیيانه‌ی ناو شارستانیه‌تێکی تازه‌ی جیهانی دروست کرد که هه‌تا ئێستاش له مێژووی مرۆڤایه‌تی‌دا به‌رزو بڵندو جێگای شایانی خۆی هه‌یه . . .

له شه‌ری قادسیه‌وه تاوه‌کو ئێستا ره‌گه‌زپه‌رستێتی فارسی‌پیش ده‌خواته‌وه‌و بیرله تۆڵه کردنه‌وه ده‌کاته‌وه‌و هه‌رکاتێکیش مه‌به‌سته‌کانیان بۆ هه‌مووان ئاشکرا ده‌بێ ئه‌وه ئیتر سه‌رکوت ده‌کرێ وه‌ك چۆن بزووتنه‌وه‌کانی قه‌رامیته‌و بابکی‌و به‌رمه‌کی‌یه‌کان په‌رده‌یان له‌روو هه‌ڵماڵ‌راو بۆ هه‌تاهه‌تایه قه‌لاچۆ کران‌و له‌ناو بران . . .

لێره‌دا پێویسته ئاورێکی مه‌وزووعی له که‌سایه‌تی فارسی بده‌ینه‌وه ئه‌ویش له‌و لایه‌نه‌وه که مرۆڤی فارسی به‌گرێیه‌ك له جۆری گرێ‌ی-ئه‌لماساوا-ی جووله‌که گه‌مارۆ دراوه به‌لام چیه گرێکه وای له جووله‌که کردوه که‌زیاتر په‌یکه بخۆن‌و فارسیشی والێکردوه که به‌لایه‌ك‌دا برۆن بگونجێ بۆ ئه‌وه‌ی که‌بتوانن شێوه‌یه‌کی تیادا بدۆزنه‌وه که باری لێژی سیاسی‌و ئه‌یدیۆلۆژیانی تیادا راستکه‌نه‌وه . . دوای تێکشکانی یاخی بوونه گه‌وره‌کانی قه‌رمه‌تی‌و به‌رمه‌کی‌یه‌کان ، فارسه‌کان که‌وتنه ئه‌وه‌ی یارمه‌تی‌و هێز له هۆزو تیره درنده‌کان وه‌رگرن بۆ تێکشکاندنی یه‌کێتی ئیسلام‌و عه‌ره‌ب‌و ده‌وڵه‌ته‌که‌یان . . . ئه‌وه‌بوو هه‌ندێ له‌سه‌رکرده‌کانی فارسی زۆر نامه‌ردانه بۆ داگیرکردنی به‌غدا له‌گه‌ڵ هۆلاکۆدا یه‌کیان گرت . . . .ئه‌و کاره‌ش ئه‌وه‌ی ده‌ربری که فارسه‌کان له ئیسلام‌و عه‌ره‌ب داخ له دڵ بوون‌و ویستیان تۆڵه بکه‌نه‌وه . . .

به‌لام ئه‌و کاره هیچ دادی فارسه‌کانی نه‌داو له‌ناکاو ده‌وڵه‌تی مه‌ری سپی‌و مه‌ره‌ی ره‌شی ولاتی فارسیان گه‌مارۆداو وه‌کو هه‌ڵۆ له‌سه‌ری نیشتنه‌وه‌و فارسیان شه‌ت‌و په‌ت کرد . . . دوای ئه‌و ساش ده‌وڵه‌تی مه‌ری سپی که تورك بوون به‌ناوی ئیسلامه‌وه زه‌وی عه‌ره‌بیان داگیرکردو ئه‌م کاره‌ی ئه‌وانیش له‌ره‌گه‌ز په‌رستێتی فارسه‌کان که‌مت نه‌بوو . .

فارسه‌کان به‌تایبه‌تی شاکانی سه‌فه‌وی ویستیان ده‌ورێکی شانوگه‌ری بنوێنن‌و به‌ناوی ئاینی ئیسلامه‌وه کار بکه‌ن به‌لام ئه‌م کاره دادی نه‌دان‌و ئه‌و رێره‌وه‌ی گرتبوویان کانی به‌سه‌ر چووبوو . . .

شیعه‌ش که تیپێکی ئیسلامی‌یه له‌ناو عه‌ره‌ب‌دا سه‌ری هه‌ڵداوه‌و نه‌ش‌ونمای کردوه‌وه بیرو باوه‌رێکی ئیسلامی‌یه‌و هه‌رگیز له‌قه‌واره‌ی دووکۆڵه‌که‌که‌ی شارستانیه‌ت‌و تایبه‌تێتی نه‌ته‌وه (عه‌ره‌ب‌و ئیسلام) لای نه‌داوه‌و ئیمامه‌کانی شیعه گه‌لێ جار دژی هه‌وڵه‌کانی فارسی بۆ بربرکردنی یه‌کێتی ئیسلام . راوه‌ستاون‌و دژی هه‌موو شتێکیش که بووبێته هۆی لاوازی ده‌وڵه‌تی عه‌ره‌ب راوه‌ستاون . . . تاوای لێ هات فارسه‌کان له‌سه‌رده‌می عه‌باسی‌یه‌کان‌دا بۆ به‌دیهێنانی خواسته گلاوه‌کانیان که‌وتنه

بەربەرەکانی کردنی شیعە . . .

مێژووش باسی دەکات کەچۆن– الفضل بن سهل الفارسی– هانی مەئموونی داو پشتگیری کرد بۆ لەناوبردنی ئیمام رەزا کە جێگری مەئموون بوو لە فەرمان رەوایی‌دا . . . شیعەی فارسی بارێکی رامیاری کاتی‌یە مەبەستی شل‌و خاوکردنی نیشتمانی عەرەبی‌و نەتەوەی عەرەبە بۆ ئەوەی بتوانی لەو رێگایەوە ئیمبراتۆرییەتی فارسی دروست کەنەوەو کەنداوی عەرەبی‌و ولاتە عەرەبی‌یەکان بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە . . . شایانی باسە فەرمانرەوا سەفەوی‌یەکان لەکاتی ناکۆکی‌یان‌دا لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی‌دا ئەم دەورەیان گێڕاو ئیتر ئەم کارە بەسەر نەتەوەی عەرەب‌دا تێناپەری‌و بەندوباوی شیعەیەتی فارسی هەتا هەتایە خاك پۆش دەکرێ . . . لە کردەوەو رەوشتی رۆژانەی فارسی‌دا دەربارەی پیاوانی ئاینی شیعە هەڵویستی وا دەبینی کوتوپڕ دەزانی ئەمە کارێکی رەگەز پەرستانەیەو بەهیچ جۆرێك پەیوەندی بەئاینەوە نیە . . هەموو ئەوانەی کە لە شارە پیرۆزەکانی عێراق‌دا دەژین‌و پەیوەندی فارسیان بەعەرەبەوە لەبیرە ئەو راستی‌یە دەزانن . . . بەتایبەتی ئەوانەی کە لە سالانی شەستی ئەم سەدەیەدا لەناکۆکی‌یەکەوە نزیك بوون بینییان چۆن ململانێکە بوو بە ناکۆکی نێوان (عەرەب‌و عەجەم) ئەمە بارێکی رامیاری نیە بۆ سرپۆش کردنی تەماو ئامانجی دیاری کراو لە ناوچەکەدا؟ئەمە دووفاقەیی نیە کە بەناوی ئیسلامەوە دەکرێ هەروەك چۆن مونافەقەکانی سەردەمی پێغەمبەر درووی خوای لێ‌بێ دووفاقەیی‌یان دەکردو دوورووییان پێشان دەدا . . ؟

ئەگەر بەوردیش لەمەسەکە بکۆڵینەوە دەبینین پەرەسەندنی باری سیاسی ئێرانی هاوچەرخ دوو لایەن دەبیەن بەرێوە . . . یەکەمیان ئیمپریالیزم کە بەهەموو جۆرێك یارمەتی دەدات ئەویش بۆ ئەوەی ئیمبراتۆرییەتی فارسی لە ناوچەی عەرەبی‌دا دامەزرێتەوەو دەسی بەسەر کەنداوی عەرەبی دا بگرێ . . . دووەمیان بەندو باوی ئاینی تیرەگەری ئامێز ئەویش بۆ لەق‌کردنی یەکێتی عەرەبی کەنداوو دوورگەی عەرەبی . . . ئەم هەموو کارانەش بۆیە دەکرێ چونکە فارس بەبڕوای پووچەڵی خۆی ئەم ناوچەیە بەجوغزی شارستانیەتی رەگەزپەرستێتی خۆی دەزانێ . . .

**رەگەزپەرستێتی فارسی هەر بەردەوامە :–**

دەوڵەتی ئێرانی نوێ لە ئەنجامی کوودەتایەك‌دا دروست بوو کە پەهلەوی گەورە لەبیستەکانی ئەم سەدەیەدا بەسەر قاجارەکانا کردی . . . ئاشکرایە ئەگەر یارمەتی دەوڵەتە ئەوروپایی‌یە داگیرکەرەکان نەبوایە ئەو ئەفسەرە لاوە واتە پەهلەوی گەورە نەیدەتوانی لە کارەکەی‌دا سەرکەوێ . . . ئەوەبوو بەیارمەتی بەریتانیا توانی بەسەر قاجارەکان‌دا سەرکەوێ چونکە ئەوان بوونێکی وارێك وپێکیان نەبوو کەبتوانن خواستەکانی بەریتانیا ئەنجام بدەن‌و بەرژەوەندی‌یەکانی بپارێزن . . . ئەو قۆناخەش واتا قۆناخی سەردەمی قاجارەکان‌و سەدەی نۆزدەهەم دەوڵەت‌و کۆمەڵگای فارسی رووبان لەکزی‌و ئاژاوەیەکی سەیر کردبوو ئەو بارەش بو بەبوارێك بۆ سەرهەڵدانەوەی بزووتنەوە رۆحی‌یە فارسی‌یەکان‌و هەرەس‌هێنانی کۆڵەکەی کۆمەلایەتی‌و پاشا گەردانی رەوشت . . . ئەوەبوو بزووتنەوەی –بابی–و–بەهائی– وەکو رێکخراوی نهێنی سەریان هەڵ‌دا شایانی باسە بنەرەتی ئەو بزووتنەوانە لەسەر بیروباوەری ئاینە کۆنەکانی فارسی دامەزرابوو بەلام لەژێر پەردەی ئیسلام‌دا کاریان پێ‌ دەکرد . بەلام ئاشکرایە ئەم کۆمەڵە بزووتنەوانە بەزۆری زۆردارەکی نەیێ نەیانتوانیوە هەموو فارسی بهێنە ژێر دەسەلاتی خۆیانەوە . . . ئەو بزووتنەوانە لەئەنجامی لووت‌بەرزی‌و خۆپەرستی تیرەگەری‌یەوە هاتۆتە کایەوەو داموو دەزگاکانی ئیمپریالیزم زۆریان کەڵك لێبینیوەو شایانی باسیشە کە بابیەکان‌و بەهائیەکان پەیوەندی بەهێزیان لەگەڵ ماسۆنی‌و زایۆنی‌دا هەیە . . .

لەنێوان ئەم بزووتنەوانەدا کۆڵەکە بنەرەتی‌یەکانی کۆمەڵگای فارسی دەرکەوتن‌و گرێ کوێرەی رق‌و کینەیان لە نەتەوەی عەرەب ئاشکرا بوو . . . کەپەهلەوی گەورەش کوودەتاکەی سەرکەوت بیناغەی دەوڵەتێکی نوێ‌ی لەسەر کۆڵەکەی رەگەزپەرستێتی دامەزراند . . . بەلام دەوڵەتەکەی پەهلەوی ئەگەر هەر پشتی بەفارسەکان بەستایە لاوازو بێ دەرەتان دەبوو لەبەر ئەوە کەوتە ئاین‌و ئۆیین‌و ناوێکی تری لە دەوڵەتەکەی نا . . . ئەویش ئەوەبوو ناوی نا دەوڵەتی ئێران . . . ئاشکراشە هەر لە گەڵ سەرکەوتنی پەهلەوی گەورەدا دەوڵەتە گەورەکان کەوتنە دانان‌و نەخشەکێشانێکی وا کە دوڵەتە تازەکەی فارس بتوانێ هەموو گەل‌و نەتەوەکانی تری ئێران بخاتە ژێر توانا‌و دەسەلاتی خۆیەوە . . .

لەراستیش‌دا ئێرانی فارسی توانی ئازربایجان‌و کوردستان‌و بلوشستان‌و تبریز بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوەو پاش ئەوساش فارسەکان بە یارمەتی بەریتانیا لەساڵی ١٩٢٥ دا توانیان ئەحواز بەزەبری هێزی

سوپای داگیر بکەن . . .

**عەرەب و فارس :-**

ئایە ئەو کارانە هەمووی لە پێناوی چی‌دا بوو؟ بشێ تەنها پەرەسەندنێکی ئاسایی ناوچەیی بێ؟ یاخود ئەنجامدانی سیاسەتێکی ئیمپریالیزمانەی رێك و پێك بێ . . .؟

باجارێکی تریش نەخشەی سیاسی ناوچەکە بخوێنینەوەو پێ بەپێی پێشەکییەکان بگەینە ئەنجام . . . ئیستعماری بەریتانی-رۆژهەڵاتی ناوەراست- بەمەڵبەندی رامیاریی خۆی دەزانێ . لەراستیش‌دا لە لیستەی نەخشەکانی‌دا نەبوو کە دەوڵەتی عوسمانی بڕووخێنێ چونکو دەیزانی رووخانو هەرەسهێنانی ئەو دەوڵەتە مسۆگەرەو گومانی تیادانیە . . . هەر وەها نیازیشی نەبوو دەوڵەتی ئێران داگیرکات چونکە ئاشکرابوو کۆیلەی خۆیەتی و لەبۆتەی ئیمبراتۆرییەتەکەی‌داو بەترس و سڵەمینەیەکی زۆرەوە دەیویست دەسەلاتی خۆی بەسەر ناوچەی عەرەبی‌دا بسەپێنێ . . . جا لێرەدا بۆمان هەیە بڵێین : بۆ؟ بەڵام ئەوەمان بەسە کە بزانین چۆن . ؟

(لەناوچەی عەرەبی‌دا نەتەوەیەکی گەورە هەیەو هەموو هەل و مەرجێکی یەکێتی تیایەو ئەگەر ئەم نەتەوەیە یەك بگرێ دەبێتە مەترسی‌یەکی گەورە بۆ ئەورووپا لەبەر ئەوە دەبێ لەشێکی نامۆ لەدڵی ئەم نەتەوەیەدا بچێنرێ بەجۆرێك کە خۆرهەلاتی لە خۆرئاوای جیاکاتەوەو بەشەرو جەنگی بەردەوامەوە خەریکی بکات) ئەو قسانەی ناو دووکەوانەکەی سەرەوە برگەیەك بوو لەخوتبەیەکی-بالمرستون-ی سەرەك وەزیرانی بەریتانیا کە سالی-١٨٤١-لە ئەنجومەنی گشتی بەریتانیادا دوای تێکشکانی محمد علي پاشا خوێندییەوە . . .

هەر بەهەمان جۆر لە سالی-١٩٠٧-دا وەزیری دەرەوەی بەریتانیا لـــەراپۆرتی-لـــیژنـــەی شارەزا ئیستعماری‌یەکان-دا ئەو بیروڕایەی دووبارە کردەوە . . . ناشمانەوێ لێرەدا باسی پرۆژەی زایۆنی و ئەو ئامانجانە بکەین کە زایۆنیزمی لەپێناودا لە ناوجەرگەی کەرتەی عەرەبی‌دا چێنراو دامەزرا . . . چونکە ئەو باسە لە ناوچەکەدا ئاشکرایە . . .

بەلام پرسیارێکی رەوا هەیە خۆی خۆی دەسەپێنێ و دەبێ ئەو پرسیارە هەربکرێ . . .پرسیارەکە وەلامی‌ئەوەش ئەداتەوە ئایا لەناوچەکەدا کێ نوێنەری رێرەوی مێژوویی‌یە . . . نەتەوەی عەرەب . . . یاخود . رەگەزپەرستێتی فارسی . . .؟

پرسیارەکەش ئەمەیە : ئایا بەریتانیا یارمەتی عەرەبی نەدا لەشۆرشیان‌دا دژی دەوڵەتی عوسمانی؟ ئـــیتر . . . بۆچی . . .؟!

● نامەکانی نێوان حسین-مکماهون . . . یاریدەدانی چاوەڕوان کراوی‌بەریتانیا بۆ (حسین) ی شەریف دژی دەوڵەتی عوسمانی ئەسەلمێنێ . . . بەلام ئەو کارە وەکو لوتکەی کێوێك بوە کەبێ لەسەر ئاو بووبێ و ناوجەرگی کێوەکەش بنکی کێوێکی رەشی تیا جێگیر بووبێ کە دەبێتە بزمارێك لە لەشی نەتەوەی عەرەب‌دا دادەکوترێ . . .

لەکاتێك‌دا کە بەریتانیا گەلێ گەل و ولاتی غەیرە فارسی بەئێرانەوە نوساندو لەکاتێك‌دا کە ناوبراو بە مەترسی رووسی-لەئێران دوور خرابەوەو هەموو باریك بۆ راپەرینێکی پیشەسازی لە ئێران‌دا سازکرا . . . هەروەها پەهلەوی گەورەش بەشارەزایان و چەك پالپشت کرا بۆ ئەوەی دەوڵەتێکی گەورە دامەزرێنێ . . .ئالەو کاتەدا بەلێ لەوکاتەدا بەریتانیا پاشگەز بۆوەو پشتی لە سەرکردە عەرەبەکانی هاوسوێنی کردو بەلێننامەی سایکس بیکۆی سالی-١٩١٦و سان ریموی سالی ١٩٢٠- نامەکانی نێوان حسین-مکماهۆن و دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەکگرتووی عەرەبی لە رۆژهەلاتدای کرد بەیادگارێکی پرکوێرەوەری و حسین و رۆلەکانی لەویژدانی پەنەماویان‌دا هەلیان گرت و نەتەوەی عەرەبیش پێی تلایەوەو پارچە پارچەبوونیشی بوو بەهۆیەکی سەرەکی کە نەتەوە هەمیشە بکەوێتە بەر تالان و پیلان و دەسدرێژی . . .

جائیتر باری سەرنجی ئێمە یاباری سەرنجی فارسی هەرچی چۆنێ بێ پێویستە ئەو هۆیانە شی بکرێنەوە کەوا بەریتانیای والێکرد پالپشتی رەگەزپەرستێتی فارس بکات و دژی جوولانەوەی نەتەوایەتی عەرەبی بوەستێ . . .

ئەگەر بمانەوێ لە بەلگەکانی شیکردنەوەی مێژوویی و تیۆری زانستی و ستراتیژی دوور نەکەوینەوەو لارێ نەگرین دەگەینە ئەو راستی‌یە مێژوویی‌یەی کە نەتەوەی عەرەبی حەقیقەتی سەرەکی و مێژوویی ناوچەکەو چەرخی هەلسووراندنی شارستانیەتی هەموو هەرێمەکەیە بەگشتی . .

لە بیستەکانی ئەم سەدەیەدا جیهان دووچاری ئیستعماری بەریتانی و فەرەنسی بوو شتێکی ئاسایی بوو شارەزاو زاناکانی ئیستعمار بۆ رەگەزو بنەماکانی پێشکەوتن و بزووتنەوەو بەش بەش بوون و هێزو لاوازی

ناوچەکە بگەڕێن و لێ ی بکۆڵنەوەو ئەنجا دەسی بکەن بەبنیاتنانی بارێکی واکە بتوانی وزەو هێزو یەکێتی ڕەگەزەکانی ناوچەکە پرش و بلاو بکاتەوەو خۆی چۆنی بوێ وای لێ بکات . . .

ئیستعمار هەستی بەوە کردبوو کە-یەکێتی هێزو توانایە-لەبەر ئەوە لەم ململانێ یەدا بەپێ ی بەرژەوەندی ستراتیژیەتی خۆی لە ناوچەکەدا ئەجولایەوە . . .

پشتگیری هەندێ لای دەکردو دژی هەندێ لا دەوەستا . . . سەبارەت بەئێرانی نوێ بەریتانیا هەڵوێستی پشتگیری یانەی نواندو هەوڵی بەرزبوونەی پیشەسازی تیادا داو پاڵپشتی یەکێتی نەتەوەیی کردو مەبەستی ئیستعماریش لەم کارەی دا هۆشمەندیارانە بوو . . بۆ ئەوەی بوو کە ئێرانی یەکگرتوو بەهێز بکات بەکوتەڵ و داردەستی سەرەکی خۆی .
عەرەب لایەکی تر بوون لە ململانێ کەدا نەتەوەی عەرەب ڕەگەزەکانی یەکێتی یان مێژوویی بوو . . . لەبەر ئەوە بەریتانیا دژیان وەستاو کەوتە کار بۆ ئەوەی بەزەبری هێز ڕەگەزەکانی یەکێتی یان پرش و بلاو بکاتەوە ئەویش لەبەر ئەوەی یەکێتی عەرەب هەرچۆنی بێت و چۆن دروست بێت هەرەشەیەکی گەورە لەبەرژەوەندی ئیستعمار دەکات . . .

ئیستعمار لەئێراندا یەکێتی دەوێ بەتەواوی و لەناوچەی عەرەبیش دا بەتەواوی پرش و بلاوی و جیاوازی دەوێ . . . ئائەمەیە باری سەرنجی ئیمپریالیزم و موعادەلە ڕاستەکەی . . .
لەڕاستیش دا بەپێ ئەم موعادەلەیە کە بەلایەنی جوگرفیایی و ڕامیاری و مێژوویی پشتگیری دەکرێ پێشکەوتنی ناوچەکە پێ بەپێ ی بەرژەوەندی ئینگلیزی و ئەمەریکی و جیهانی ناروات . . . بەڵێ بەپێ ئەم موعادەلەیە ڕەگەزەکانی جوگرافیەو مێژوو ڕامیاری بەرەو ئامانجێك دەڕۆن . . . بەرەو ئامانجێکی ڕاست و ڕاستەقینە ئەویش یەکێتی نەتەوە یعەرەبە . . . بەلام ئەم یەکێتیە ئەگەر چی ڕاستیەکی مسۆگەری مێژوویش یە بێ پێچەوانەی خواستی هێزە ئیمپریالیزمە دڕندەکانە کە تاوەکو نیوەی دووەمی ئەم سەدەیە دەسەلاتیان بەسەر ناوچەکەدا هەبوو . . . لەبەر ئەوە دژی دەوەستن . . . دوای بەریتانیا ئەمەریکا چوە ئێرانەوەو لەسەر هەمان ڕێبازی بەریتانیا ڕۆیشت و دەستی کرد بەبتەو کردنی ئێران و بەهێزکردنی یەکێتیەکەی و دوای ئەوساش پشتگیری کرد بۆ دەسدرێژی کردن بەسەر بەحرەین و کەنداوو دوورگەکان و شەتولعەرەب دا . . . بەڵێ ئەمەریکا ویستی مەڵبەندێکی ستراتیژی نوێ لەجۆری قەوارەی زایۆنی بۆخۆی دروست بکات و ئەوەبوو ڕژێمی فارسی سەردەمی شای کردبوو بە دەوڵەتێکی ئیمپریالیزمی ناوچەیی . . .

لەشەستەکان و حەفتاکانی ئەم سەدەیەدا ئێران و شای ئێران بوو بوونە داردەستی ئەمەریکاو لەلایەکی تریشەوە ئەمەریکا هیچ درێخی نەدەکرد لەبەش بەش کردنی نەتەوەی عەرەب و بۆ ئەو کارەش پەنای بۆ گەلێ ڕێبازو ئاین و ئۆین بردوە لەوانە پشتگیری کردنی ڕژێمی ناوچەیی و دروستکردنی قەوارەی کۆمەلایەتی ناوچەیی لەژێر دروشم و ناوی جۆربەجۆردا . . . ئەویش بۆ ئەوەی ناوچەکانی نیشتمانی عەرەبی بەجۆرێك نەش و نما بکەن کە هەل و مەرجی یەکێتی یان تیا نەبێ . . .

هنری کیسنجەر پەردەی لەڕووی ستراتیژیەتی ئەمەریکایی هەڵماڵی و کاتی خۆی بە (محمد المصمودی کۆنە وەزیری دەرەوەی تونسی وت :(ئەمەریکا زۆر لەوە دەترسێ پێغەمبەرێ یا سەرکردەیەکی عەرەب پەیدا بێ هەموو نەتەوەی عەرەب یەك بخات . . .) کێ بەتەواوەتی هەرەشەو مەترسی گەورەیە بۆ سەر دەوڵەتە گەورەکان و ئیمپریالیزم . . .؟
لەڕاستی و مێژووی زانستیدا بەپێ ی ڕەگەزەکانی جوگرافی و مێژوویی ، نەتەوەی عەرەب گەورەترین مەترسی یە کە ئیمپریالیزم و دەوڵەتە گەورەکان سڵی لێ دەکەن و لێ ی دەترسن . . . بەلام ئێران بەبوونی ڕەگەزپەرستێتی و نەبوونیشیەوە پاشکۆی ئەمەریکایەو لێ ی جیا نابێتەوە . . .

### ● پێشەکی ڕاست و ئەنجامی هەڵە :-

ئێمە بۆیە باسی ڕەگەزە مەوزوعی یەکان (جوگرافیاو مێژوو زۆر دەکەین بۆ ئەوەی کاکڵەی ڕاستی بخەینە ڕوو لەگەڵ ئەوەش دا ئێمە دەوری هۆ خودی یەکان لە بەڕێوەبردنی کاروبارو دووبارە کردنەوەی ڕێك و پێکی بارو دۆخی مەوزووعی و کاریگەری ئەو هۆیانە پشتگوێ ناخەین . . . جوگرافیەو مێژووی ئێران ڕەگەزپەرستێتی یەو پاشکۆی ئەمەریکاو دەوڵەتە گەورەکانە . . . بەلام ئەم دۆخە ڕاستیەکی چەسپاوو نەگۆر یا حەتمیەتێکی تەواو نیە . . .
بەڵکو هەموو گەلانی ئێران ئاواتخوازەی سەربەخۆیی دامەزراندنی دەوڵەتێکی دیموکراتین و ئەوەشیان بەو شۆڕشانە ئاشکرا کرد کە دژی شای ڕووخاو بەرپایان کرد . . . شۆڕشی گەلانی ئێران شۆڕشێکە

دژی دەسەلأتداریتی ئیمپریالیزم بەریابوەو دوای ئازادی دەکاتو هەروەکو یەکیّ ـەسەرکردە وەفادارەکانی شۆرەش بەر ـەهەتنی خومێنی بۆ سەر حوکم وتی : (شۆرشی ئیرانی دریژبوونەوەی شۆرشی عەرەبی یە) ئاەو ریبازە میژوویی یە راستو دوستە سنووریکی بۆ باری گشتی نەشو ـەی ناوچەکە دادەنا نەك ئەم ریبازەی ئیستا . . .

بەلأم چی رووی دا کە شۆرشی ئیرانی ئەو دۆخەوە بچیتە دۆخیکەوە بیتە دوژمنیکی خوینخۆری نەتەوەی عەرەبی . . . بیّ گومان شۆرشی ئیران بۆ ئەمە بەرپانەبوو . . هەموو هۆ مەوزووعیو بەجیکان ئەوە دەگەیەنن کەشۆرشی ئیران بەهۆی دراوسیتیو یەكئاینیو پەیوەندی یە میژوویی و کۆمەلأیەتیو ئابووریو کەلەپووری یەکانەوە دەبوو ریبازیکی بگرتایە کەبگونجایە لەگەلّ بەرژەوەندی نەتەوەی عەرەبدا خستنەرووی ئەو بەلگانەی کە پەیوەندی رژیمی فارسی بەئەمەریکاوە ئەسەلمینیّ ئاسان نیە . . . بەلأم تیبینی کردنی سیاسەتیان زور ئاسانە . . . ئەم رژیمە لەوەتی جلەوی حوکمی گرتۆتە دەست لە جوولأنەوەکانی دا وادیارە کە لابردنی شاو هینانی خومێنی بۆسەر حوکم یاریيەك بوەو ئەمەریکا کردوویەتی . . . لیرەدا پیویستە هەر بۆ بیر خستنەوە قسەیەکی سەرۆکی موخابەراتی مەلبەندیی ئەمەریکایی-مانسفیلد تیرنر-بخەینە روو کە لە کۆنگریسی ئەمریکایی دا ، وتوویەتی ئەویش ئەوەیە کە دەربارەی شا دەلیّ : (ئیمە وەکو باوکیك وابووین کە ئامۆژگاری کورەکەی بکات بەلأم وا دەرکەوت کە کورەکە نەخۆش بوو لە کاتی تەمیّ کردندا مرد . . .)

ئالیرەدا یاری یەکەی ئەمەریکا ئاشکرا دەبیّ ئەویش ئەوەیە ئەمەریکا کاتیّ بۆی دەرکەوت کە شا لەباری دا نەماوە خزمەتی زیاتر بەئیمپریالیزمی ئەمەریکایی بگەیەنیّ هیچی لەوە بەباشتر نەزانی کە سەرەو خواری کاتو بیرووخینیّ . . . یاخود تەمیّبکات .

لەکاتی تەمیّ کردندا دەرکەوت کەشا بەکەلکی مانەوە نایەتو دەبیّ یەکیکی تر جیگاکەی بگریتەوە . . . ئەو جیگرەش خومێنی بوو . . . شایانی باسە ئەم پیاوە نە لە شارەکەی داو نە لەو گەرەکەدا کە لەکاتی دوورخراوەیی دا چواردە سالّ تیا ژیا پیاویکی دیارو ناسراو نەبوو . . .

ئایا لەپەردەی ئاین بەولاوە شتیکی باشتر هەیە پیاویکی سیاسی فیلباز خۆی لەژیردا بشاریتەوە ... ئایە شتیك هەیە باشتربیّ لە جۆشاندنی کەفوکولّی سەرەتایی ئاینو دوایش شیواندنی زامنە ئاینی یەکان بۆ ئەوەی ئاژاوەیەکی وای لیبیتەوە دواکەوتوویی هەموو سەدەکانی رابووردووی تیکەلو ئامیتەبیّ . . .؟ ئەمەریکا چ زیانیکی لیّ دەکەویّ ئەگەر ئیران سیّو چوار سالیك لەئاژاوەدا بژی . . .؟ لەراستیدا هیچ بەلکو لەو ماوەیەدا دەتوانیّ لەنیوانیّ ئەو ئاژاوەیەدا ئەو رەگەزانە بدۆزیتەوە کەدەتوانیّ بۆ دامەزراندنی دامو دەزگای دەولەتیکی نویّ لەئیراندا پشتیان پیّبەستیّ . . دامو دەزگای بەرژەوەندی ئەمەریکایی لە ئیرانی خومێنیدا بەکاوە خۆ دروست دەبیّ بەلأم بەشیوەیەکی ریكو پیكو لەبار . . . ئەویش ئەو ناکۆکی یە دەیسەلمینیّ کە کاربەدەستانی ئیران لە گەلّ یەكدا بەرپایان کردووە . . .

بەلأم ئایە ئەمەریکا چی تری دەویّ . . .؟ دەیەویّ نەبەلیّ یەکیتی نەتەوەی عەرەب دروست بیّ . . . دەیەویّ یەکیتی نەتەوەی عەرەب بووخینیّ . . . بەلأم بۆ ئەو مەبەستەش قەوارەی زایۆنیزمو دوژمنکاری یە نالەبارەکانی دادی نەدا بەلکو بەپیچەوانەوە هەستی نەتەوایەتی عەرەبی زیاتر بۆ یەکیتی ورووژاند . . . و کۆمەلگای عەرەبی ئاگادار کردەوە کە بچنە عاستیکی کۆمەلأیەتی ریكو پیکەوە . . .ئەمەش ئەوە دەگەیەنیّ کەریبازی یەکیتی نەتەوەی عەرەب هیشتا هەر مەزووعیو میژووییو رەوایەو هەموو رەگەزەکانی تەواوە . . . بەلیّ کەدامو دەزگای سوپایی قەوارەی زایۆنی لەو بارەیەوە هیچی پیّ نەکرد . . . ئەمەریکا بۆ ریگایەکی تر گەرا کە یەکیتی عەرەبی پیّ سەرکوت کات ئەوەش شەری ئایدیۆلۆژی بوو هەروەها دروستکردنی دامو دەزگای وەهابوو کەبتوانن دوای چەك پۆش کردنیان لەلایەن ئەمەریکاوە لەناو ئیراندا شەرو ئاژاوەی ناخۆ بنینەوە . . . لیرەشدا دەبیّ ئەوەمان لەبیر نەچیّ کە بەنیسەدر چی وتوە . . . ئەبیّ لەبیرمان بیّ کە وتوویەتی : (نەتەوەی عەرەبو زایۆنیزم هاوبیرن) ئیمپریالیزمی ئەمریکاو فەرمان رەواکانی ئیران دەیانەویّ عەنزو بوخوورو گولأوی ئاینی لەرژیمی ئیران بپژینن . . . بەلأم لەراستیدا ئەم رژیمە هەرگیر پەیوەندی بەئاینەوە نیە . . . بەلکو نالەبارنزین شەپۆلی رەگەزپەرستی یە کە دوژمنایەتی دامەزرینەرانی ئیسلام عەرەب دەکات . . . رەگەزپەرستیی کۆن بۆ هەتاهەتایە سەرنگوم بوو بیّگومان رەگەزپەرستیی تازەش زۆر بەپەلە گۆری خۆی بە دەستی خۆی هەلدەکەنیّ . . .لەئیراندا . . .

لەگۆڤاری (آفاق عربیة) ژمارە ٨ی نیسانی ١٩٨١ وەرگیراوە

# هاوکارانی رژێمی فارسی کێن..؟





## کە پشت بە چەکی زایۆنیزم دەبەستن...

● ئەگەر رواڵەتو سروشتی رەگەزبەرستیو دەوری دوژمنگێری قەوارەی زایۆنیزم . بەپێی تێروانینی هەندێك لایەن . دوو بەڵگەی بەس بن بۆ رووڕەشکردنی سروشتو ئامانجی هاوکاری چەکیی زایۆنی – فارسی . ئەوە پرسیار لەمەڕ هاوکارانی رژێمی فارسی لە لستەی «کڕیارەکان» ی دەزگا

پیشەسازییە سەربازییەکاندا . لایەنێکی زیدەتری روونکردنەوەی رووڕەشی‌ی داخواز . ئاشکرا دەکات .

پێش ئەوەی باسی ئەو «هاوکاران» ە بکەین . ئەبێ ئەوە بزانین کەوا زایۆنیزمی دوژمن لە ناوەراستی پەنجاکان نەبێ . ئەگینا چەکی دروست نەکردووە . بەلاّم بە یارمەتیدانو دەستگرتن و پالّپشت‌گرتنی لەرادەبەدەری کارگێرە ئەمەریکایی‌یە یەك لەدوای‌یەکانەو هەندێ لە حکومەتانی رۆژئاوادا کە بەردەوام پێشکەشیان دەکرد . پێشکەوتنێکی «کتوپر»ی ئەم جۆرە پیشەسازییەی بە خۆیەوە بینی . وە لە ناوەراستی شەستەکاندا . پیشەسازی سەربازی‌ی زایۆنی دوژمن وای لیّهات کە پشت بە بنچینەکانی رێك‌وپێك‌و تەواو . بۆ «دروستکردنی چەکی بەرفرەی ناوخۆ» ببەستێت ! ! . . . وە هەر لە ناوەراستی حەفتاکانیش‌دا . توانی بچێتە بازاری چەکی‌ی دەولّەتانەوەو بەربەرەکانی ئەوانە بکات کە . لەم بارەیەوە . گەلێك لەوەوە لەپێشترو پێشکەوتووتر بوون .

بەلّگەی زۆر هەن دووپاتی ئەوە دەکەن کەوا ئامانجی بنچی‌ی بنیات‌نانی پیشەسازی سەربازی‌ی‌و دروستکردنی چەك‌و پالّپشتگرتنی لەلایەن ئەمریکاو رۆژئاوادا . بۆ رادانو داکردنی چەکی پێویست‌و باوکردنی پێداویستسەکانی نەبووە . دیاریترین ئەو بەلّگانە لەوەوە رەچاو دەکرێن کەوا سوپای زایۆنیزمی دوژمن . ئەو چەك‌و کەرەسە سەربازییەی کە دەزگای پیشەسازی‌ی سەربازی بەرهەمی دەکابت . تەنیا (٥٪) یان کەمێکی زیاتر نەبێ ئەگینا هیچی تری بەکارناهێنێ . لە کاتێکا کە چەکی زایۆنی . ئەوەی کە خۆی دروستی دەکات ، بربرەی پشتی چەکی سوپای رژێمێك پێك‌دێنێت ، سەرەرای ئەوەش کە پێرەیش بۆ ستراتیژیەتی ئەمریکا لە ناوچە جیاجیاکانی جیهان پێك‌دێنێ .

لە پێشەکی ئەو رژێمانەی کە بەشداری رژێمی فارسی دەکەن لە پشت‌بەستن بە پالّپشت‌گرتن‌و یارمەتی سەربازی‌ی زایۆنیەوە . رژێمی رەگەزپەرستی خوارووی ئەفەریقیایە .

بێگومان سروشتی رەگەزپەرستی‌و دەوری دوژمن‌گێری ئەم رژێمە کە لە کیشوەری ئەفەریقیادا دەیکات ، بۆ ئەوەی لەگەل سیاسەت‌و ویست‌و پیلانەکانی ئەمریکا بگونجێ‌و یەك بگرێتەوە . پێویست بە دووبارەکردنەوەی پێناساندنی‌و ئاشکراکردن ناکات .

ئەم رژێمە بە شێوەیێکی نیمچە گشتییەوە . لە چەکەکەیدا . پشت بە دەزگای پیشەسازی سەربازی‌ی زایۆنیەوە دەبەستێت . کە بەردەوام کەشتی دەریایی‌و جۆرەها رۆکێت‌و تانکی (میرکافا) پێشکەشی دەکات . سەرەرای جۆرەها تەقەمەنی‌تی کە بۆ ئەو چەشنە چەکانەی . کە پێشوو ولاّتە یەگترتووەکانی ئەمریکا پی‌ی دابوو . دەشی‌و دەست دەدات .

رژێمی سلفادۆریش . شوێنی دووەمی لستەی «کریارەکان ی» چەکی زایۆنیزم داگیر دەکات . ئەم رژێمە بە رادەی (٨٥٪)ی پێویستی چەك‌و کەرەسەی سەربازیدا . لە هەر سالێکا . پشت بە چەشنەها چەکی زایۆنیستەوە دەبەستێ .

ئەو رژێمەی کە شوێنی سی‌یەم لە لستەی (کریارەکان)ی چەکی زایۆنیزم داگیر دەکات . رژێمی گواتیمالا یە .

ئەو رژێمەی . کە لەمەوبەر . یەکێك لە رێکخراوە دەولّەتی‌یەکان ناوی «رژێمی تێژۆل» پەیرەوگر دژی بەرهەلّستەکان»ی لێ‌ناوە . هەلّبەتە ئەم ناولی‌نانەش . سروشت‌و دەوری رژێمەکە پیشان دەدات . وە ئەم ناونانەش . بەسەر ئەو رژێمانەی کە لەم لستەیەدا هەن . دەسەپێنرێت . کە کۆتایی بە رژێمی فارسەوە دێت . بەوەی کە چەشنەها جۆر چەکی سەربازی‌ی زایۆنیزم بەکاردێنێت .

لستەی «کریارەکان»ی چەکی زایۆنیزم - لە ژێر رۆشنایی سروشتی ئەم کریارانەو ئەو رۆلەی کە هەریەکێك لێیان . بە پی‌ی خواست‌و ویستی‌ی بۆگەنیانو پیلانی سەردارانیان دەیگێرن . راستی‌ی بایەخدانی زایۆنی دوژمن بە باوکردنی پێداویستیەکانی سەربازییان پیشانو ئاشکرا دەکات . بێگومان ئەمەش رژێمی فارسی دەگرێتەوەو بەسەری‌دا دەسەپێنرێت ، کە توانی زۆرترین یارمەتی سەربازی‌ی زایۆنیەوە وەرگرێت . . . لە کاتێکا کە بە شەرێکی دوژمنداری‌دا ئامانج‌روون دژی عیراق تێکۆشەر هەلّدەستێ .

پالّپشت‌گرتنی سەربازی زایۆنیزم بۆ رژێمی فارسی بەسە بۆ خالّ دانانە سەر پیتی ووشەی جۆرەها پرسیار کە بەندن بە دوورەدەو کارە نارەواکانی لە ناخۆی ئێرانو ئەو دەورە دوژمنداریيەی کە لە کەنداوی عەرەبی‌دا دەیگێرێت .

روشنبیری نوێ

# ڕاگەیاندنی جیهانی بە غدا نوێنێنەڕانی
# زیاتر لە سێ بەشی جیهان.. پشتگیری عیراق دەکەن

قەوارەی زایۆنیزم لەکاتی دروستبوونیەوە لە هێرش بردن چی بۆ سەر جوولانەوەی رزگاری‌خوازی عەرەب یا بۆ تەگەرەو کۆسپ خستنەبەر رێگای پێشکەوتن و سەرکەوتنی دەوڵەتە پێشکەوتوەخوازەکانی عەرەب نەك هەر درێغی نەکردووەو بەس، بەڵکو بەردەوام بووە لە پیلان‌و نەخشەکێشاندا بەرامبەر تێکرا وڵاتە عەرەبەکان.. وە بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی مەبەستی بۆگەنی ئیمپریالیزمی ئەمریکا.. هەمیشە لەکاردا بووە. لەبەر ئەوە پیلان‌دانان‌و هێرش‌بردنەسەر بنکەی ئۆتۆمی عراق لە ٧ ی حوزەیران‌دا بە کارێکی چاوەنوارکراو دائەنرێ.. هەروەکو نابێ هەرگیز ئەوەشمان لەیاد بچێ کە هیچ دوور نیە جارێکی تریش‌و چەند جاری تریش‌و.. هەر جارەی بە بۆنەیەك هێرش بەرێتە نەك هەر سەر عراق بەڵکو سەر هەمویەکی لەو وڵاتە عەرەبانەی کە بە گوێرەی ئارەزووو ڕێڕەوی ئیمپریالیزمی ئەمریکی ناجووڵێنەوە.

پەلاماردانی بنکەی ئۆتۆمی عیراق. بەجارێ بیروڕای گشتی عەرەبی‌و جیهانی لەناخەوە هەژاند تێکرا گشت وڵاتەکانی جیهانی‌و کۆمەڵ‌و ڕێکخراوە پێشکەوتووخوازەکانی جیهانی خستە سەر دەربڕینی ناڕەزایی بەرامبەر ئەم کارە

نابەسندەو . . گشت لا بڕیاریان‌دا کە لەمەودوا بێ‌دەنگ نەبن بەرامبەر هێرش‌و کاری نارەوای زایۆنیزم .

بۆیە گرتنی ئەم کۆنگرەی جیهانیە . کە زۆربەی دەوڵەتەکانی جیهانی تیایدا بەشداربوون لە بەغدا . . بو بە کارێکی مێژووی . . بو بە ڕۆژێکی لەبەرچاو بۆ دەربڕینی بیروڕای گشتی تێکڕا ئادەمیزادی ئەم سەرزەمینە . بەرامبەر دەست‌درێژی‌کردنی زایۆنیزم .

گرتنی ئەم کۆنگرە جیهانیە لە ڕۆژانی تەمووزی ١٩٨١ ، لەکاتی یادکردنەوەکانی شۆڕشەکانی تەمووزی ١٩٥٨ . تەمووزی ١٩٦٨ . . جارێکی‌تر نرخی گەورەو بایەخی گرنگی بە کۆنگرەکەو بڕیارە مێژوویە بەرزەکانی دا .

نوێنەرانی زیاتر لە سێ بەشی مرۆڤایەتی ، هاوکاری برایانەی تەواویان لەگەڵ عیراق‌و گەل‌و حزبەکەیدا بە ڕابەری هاوڕێی تێکۆشەر (صدام حسین) دەربڕی دژی دەستدرێژی زایۆنی‌و ئیمپریالی‌و لە پێناوی بەردەوامی‌ی ڕوانی شۆڕشگێڕی نەتەوەیی‌و سۆشیالیستی‌و بێ‌لایەنداو بەرپەچدانەوەی توندی نەخشەی پیلانگێڕانی دوژمنان .

لە ڕاگەیاندنی جیهانی بەغدادا کە لە کۆنگرەی هاوکاری جیهان بۆ پشتگیری عیراقەوە دەرچوو ، بەڕێز (سعد قاسم حمودی) سکرتێری لێژنەی هۆنینەوەو ئەندامی وەفدی عیراق خوێندیەوە پشتگیری تەواو بۆ عیراق دووپات کرایەوە ، ئاشتی‌یانەی‌و زامن‌کردنی تەکنەلۆژیای نوێی پێشکەوتوو بۆ خێری گەلەکەی‌و سوودی نەتەوەی عەرەب .

کۆنگرەکە لە ڕاگەیاندنەکەیدا عیراق بانگ کردووە بۆ دروستکردنەوەی بنکەی ئەتۆمی خۆی بەو جۆرەی لەگەڵ پێداویستەکانی پەرەسەندنی گەلی عیراق‌و گەلانی جیهاندا دەگونجێ‌و دانانی نەخشەیەکی زانستی چالاک بۆ ژیاندنەوەی بەهرەی شارەزای عەرەبی لەم ڕووەوەو هاندانی کۆچ کردوەکانیان بۆ گەڕانەوەو جێگیربوون‌و بەرهەم‌هێنان‌و دانانی بنەڕەتی چەسپاوی هاوکاری ئەتۆمی زانستی .

کۆنگرەکە (٧) ی حوزەیرانی هەموو ساڵێکی دانا بە ڕۆژی هاوکاری لەگەڵ نەتەوەی عەرەب‌و گەلانی ولاتە تازەپەرەسەندوەکان لەپێناوی بەدی‌هێنانی پەرەسەندنی زانستی‌و تەکنۆلۆژیای ئەتۆمی‌و دروستکردنی دەزگایەکی دەوڵەتان بۆ بەدواداچوونی جێ‌بەجێ‌کردنی بڕیارەکانی کۆنگرەی جیهانی پشتگیری عیراق کە بارەگاکەی لە بەغدا بێت‌و هەڵمەتی ڕاگەیاندنی جیهانی بۆ ئەم مەبەستە ساز بدرێ .

هەروەها کۆنگرەکە تێگەیشتنی تەواوی دەربڕی بەرامبەر بەو زوڵم‌و زۆرە مێژوویەی کە ئیستعمارو زایۆنی بەسەر گەلی فەلەستین‌و نەتەوەی عەرەبیا هێناوەو گەلێکی غەریب‌و چەکداری باوەڕ بە دوژمنایەتی کاری‌و ڕەگەزپەرستی هێنایە سەر خاکی فەلەستین تا جێگای خەڵکە عەرەبەکەی بگرێتەوە .

ڕاگەیاندنەکەی بەغدا پشتگیری تەواوی بۆ گەلی فەلەستین‌و شۆڕشە ڕزگاری‌خوازەکەی بە ڕابەری ڕێکخراوی ڕزگاری‌خوازی فەلەستین دەربڕی کە نوێنەری ڕەواو تاقانەی گەلەکەیەتی بۆ سەندنەوەی مافی ڕەوای خۆی لەسەر خاکی نیشتمانەکەی بە شاری قدسی پیرۆزەوە .

کۆنگرەکە دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کەوا

هێزەکانی ولاَتانی عەرەب‌و ئاسیاو ئەفریقاو ئەمەریکای لاتینی‌و ولاَتانی بێ‌لایەن لێ‌خواستراون کەوا لە هەموو روویەکەوە تەقەللاَیان بەکخەن بۆ دەرخستنی سروشتی رەگەزپەرستی‌و دوژمنایەتی بەربلاَوی قەوارەی زایۆنی‌و پچرانی پەیوەندی لەگەڵیا بۆ دوورخستنەوەی لە کۆرە دەوڵەتی‌و رێکخراوو دەستە ناوچەی‌یەکان‌و کار بکرێ بۆ دەرکردنی لە کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان‌و رێکخراوە دەوڵەتی‌یەکانی تر . . هەروەها بۆ وەستاندنی ئەو شتانەی کە دەدرێ بە قەوارەی زایۆنی‌و دەتەقێتەوە .

هەروەها کۆنگرەکە داوای بەستنی کۆرێکی تایبەتی کۆمەڵی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکات بۆ ئەوەی سەبارەت بە بۆردومانکردنی دەزگا ئەتۆمی‌یەکانی عیراق لە لایەن زایۆنی‌یەوە بدوێن .

هەروەها نەتەوەی عەرەب وزەو سامانی ئابووری‌و دارای زۆری هەیە وەك سامانی نەوت‌و پارەی پاشکەوت کەوا خراونەتە بانگی بێگانەوە کەوا موڵکی میللەتانی ناوچەکەیەو کە لە پلەی جیهانیدا دەبێتە چەکێکی بایەخدار لە شەرەکەماندا دژی یەکگرتنی زایۆنی‌و ئیمپریالیزم . . لەم رووەوە کۆنگرەکە داوای ئامادەکردنی ئەم وزانەو هەموو ئەو بەرهەمانەی تر دەکات لە شەری سەربەخۆیی گەلان‌و رزگاربوون لە ژێردەسْتەیی ئابووری‌و هەموو جۆرە دەسەلاَتێکی ولاَتە ئیمپریالی‌و زایۆنی جیهانەوەو کار بکرێ بە خستنەکارەوەی ئەم بەرهەمە دارای‌یە لە پرۆژەی پەرەپێداندا بۆ ولاَتانی جیهانی سێ‌یەم . . ئەمەش بۆ پتەوتر کردنی خەباتی هاوکۆیی سرینەوەی پاشماوەکانی سەردەمی ئیمپریالیزم‌و دەستبەسەرداگرتنی بێگانە .

بەو نیازەی کەوا کاری بەرگری‌کردن



لەم بەرهەمانە مافی تەنیا گەلانی ناوچەکەیە .

هەروەها لە هەستی کۆنگرەکەوە سەبارەت بە بایەخداریتی دەسکەوتنی زانینو زانیاریو ئەتۆمیو تەکنەلۆژی تایبەتی خۆی بۆ عەرەبو گەلانی جیهانی سێیەمو گەیشتنە قۆناغێك توانای کارکردن بەم زانینەو بێ مەرجو گرێ جێبەجێ بکرێ .

بە جۆرێك کە بۆ بنیاتنانی ئابووری ئەم گەلانەو پێشکەوتنو بەرزکردنەوەی پلەی ژیانی مرۆڤو پەیداکردنی ئەو کەرەسەو کەلوپەلو دەزگا ئەتۆمیەی . .

**لەبەر ئەوە داوا دەکات** :

**أ** – کە عیراق سەر لەنوێ بنیاتی دەزگا ئەتۆمیەکەی بنێت کەوا لەگەڵ خواستە پێشکەوتووەکانی گەلی عیراقو ئەو گەلانەدا بگونجێ کەوا پێویستی بە دەستکەوتنی پێشکەوتووی عیراقی لەم بوارەدا هەیە .

**ب** – کەوا دەستخستنی کادری مرۆڤی کەوا شارەزای زانینیو زانیاری بێ . . شارەزای‌یەکی باش . . سەرنجو راپەڕاندندار بێ لە بواری زانیاری ئەتۆمیدا . . دەرکەوتووترینی ئەو کارانەی کەوا شایەستەی بایەخ‌پێدانی عەرەبو گەلانی ترە . . کەوا کاری دەکات کە نەخشەیەکی کارو گورجوگۆڵ وەدی بهێنێ بۆ ئامادەکردنی ژمارەیەکی زۆری شارەزا لە ولاتەکانی عەربدا لە چوارچێوەی مەڵبەندی شارەزاکردنو مەشق‌کردندا بکرێتە مەڵبەندی .

**جـ** – دانانی نەخشەیەکی کارو گورجو گۆڵ بۆ گەڕانەوەی توانای عەرەبی تایبەت لە بارەی کۆچ‌کردنو هاندانی بۆ گەڕانەوەیو گیربوونیو بەرهەمدانی .

**د** – بەگورجی رووپێوکردنو گەڕانی جیۆلۆجی بەشوێن ئەو کەرەسانەی کەوا لە نیشتمانی عەرەبدا باوە . . دانانی بەرنامەی بەرهەمدانی سەرچاوەکان کەوا ڕێیان دراوە .

بەرەتەکانی هاریکاری ئەتۆمی :

**هـ** – پێکهێنانی بنەرەتی گیربوو بۆ هاریکاری ئەتۆمی زانیاریو جێبەجێ‌کردن لە نێوان ولاتانی عەرەبو مەڵبەندەکانی گەرانی ئەتۆمی لە ولاتە دۆستەکانو لە دەولەتە جۆربەجۆرەکانی جیهانی سێیەم .

هەروەها لە نێوان مەڵبەندەکانی لێکۆڵینەوەو گەرانی ئەتۆمی عەرەبیو کارکردن بۆ رێکوپێك‌کردنی بوونی تەواوکردنی شارەزای‌یەتیەکانی .

**و** – گۆڕینەوەی زانیاری سەبارەت پاراستنی ئەم مەڵبەندانەو پێشخستنی هۆ . .

هەروەها بانگکردنی ولاتانی پێشکەوتوو بۆ پێشکەشکردنی هەموو یارمەتی‌یەکی پێویست بۆ عیراقو ولاتانی عەرەبو ولاتانی جیهانی سێیەم بۆ دروستکردنی دەزگای ئەتۆم کە بۆ مەبەستی ئاشتیو قازانجی پەرەپێدانو پێشخستنو گەشەکردن بەکاربهێنرێ .

کونگرەکە دووپاتی دەکاتەوە کە لە نێوان مەبەستەکانی دەستدرێژی ئەم دواییەی زایۆنیدا . . سەپاندنی گلدانەوەی ئەو ولاتە ئەوروپای‌یەن لە لای ئەمریکاوە کەوا ئاڵوگۆری‌یان لەگەڵ عیراقدا لە بواری ئەتۆمی‌دا هەیە . . ئەم دەولەتانەش بانگ دەکات بەتایبەتی هەموو میللەتانی جیهان بۆ کردنی کاری هاوکۆیی گورجو گۆڵو دلێرانە بۆ بەرەوڕووبوونەوەی دەسەلاتی ئەمریکاو هەڵوەشاندنەوەی .

هەروەها تاوانبارکردنی پەیمانو کەرت‌کردنو بنکەی سوپایی دوژمنایەتی لە نیشتمانی عەرەبو هەموو جیهانداو داواکردنی ژوونەمەنی بوونی سوپایی ئەمەریکاو ئەمەش بۆ پتەوکردنی سەربەخۆیی نەتەوەی عەرەبو جولانەوەی کردن بۆ سەرهەڵدانی جولانەوەیەکی جیهانی مەبەستی داماڵینی رژێمە رەگەزپەرستەکان بێ لەپێش هەموویانەوە قەوارەی زایۆنیو باشووری ئەفەریقا لە چەکی ئەتۆمیو ئامادەکردنی رای گشتی جیهانی بێ دژی ئەو دەولەتانەی کەوا چەکی وێرانکاری‌یان بۆ دەنێرن .

هەروەها . . دانانی (۷)ی حوزەیرانی هەموو سالێ . رۆژی هاوکۆیی جیهانی لەگەڵ نەتەوەی عەرەبو گەلانی ولاتانی تازەپێگەیشتوو . ئەمەش بۆ وەدیهێنانی پێشکەوتنی زانیاریو تەکنەلۆژی ئەتۆمی .

هەروەها پێکهێنانی دەستەیەکی دەولەتان بۆ ئاگاداربوونی لە راپەڕاندنی بریارەکانی کۆنگرەی جیهانی بۆ لایەنگرتنی عیراق کە مەڵبەندەکەی بەغداد بێو پێکهێنانی هێرشی راگەیاندنی جیهانی بۆ ئەم مەبەستە .

بەشدارانی کۆنگرەی بەغدا کەوا نوێنەرایەتی زیاتری سێیەکی ئادەمیزاد دەکەن . لەسەر ئەم زەوی‌یە بەخشش‌دارەوە کەوا لەدایك‌بوونی یەکێ لە پێشکەوتووترین شارستانیەتی مرۆڤی دیوە . سووربوونیان لەسەر خاپاندنی تێکۆشانیان وەك یەك دەست دووپات دەکەنەوە دژی زایۆنیزمو ئیمپریالیەتو بۆ تەواوکردنی سەربەخۆیی هەموو گەلان لەژێر دەسەلاتی بێگانەو زۆرداریو رەگەزپەرستیو دوژمنکاریو بۆ بنیات‌نانی جیهانێکی ئاسایشداری دووری زۆرداریو داگیرکردنو جیاوازیو چەوساندنەوە .

با هەر پتەو بێ یەکێتی خەباتکەرانو پێشکەوتنخوازان لە هەموو جیهاندا .

هێزی خراپەو خوێن رشتنو تیریت با هەر بشکێ . بۆ پێشەوە .

رۆشنبیری نوێ

ئادەمیزاد لەوەتی هەبووە و بیری کردۆتەوە سەری لە بوونی خۆی سوڕماوە . ویستوویەتی بزانێ چی‌یە و بۆ هەیە . ئەم سروشتەی دەور و بەری چی‌یە و چۆن پەیدا بووە . سەرەتا چۆن بووە .

ئەم ئارەزووە بەتینەی حەز لەخۆ ناسین کردن پاڵی پێوە ناوە بە شوێن خۆیا بگەڕێ . بۆیە ئەبینین ئەم مەسەلەیە لە هەموو ئایینێك و میسۆلوجیایێك و فەلسەفەیێك دەنگی داوەتەوە . هەر یەکە چیرۆکی تایبەتی‌ی خۆی دەربارەی مەسەلەی بوون هەیە . فەیلەسووفان بە درێژایی مێژوو لەم مەسەلەیەیان کۆڵیوەتەوە و لێکیان داوەتەوە و هەوڵی وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە سەرەکی‌یانەیان داوە .

سروشت یەگجار فراوان و ئاڵۆز و چووە ناویەکە . سنوورداری‌ی تەمەنی و توانای ئادەمیزاد ڕێگەی ئەوەی لێ بڕیوە بتوانێ بیر لە هەموو لایەنێکی ئەم سروشتە بکاتەوە بۆیە ئادەمیزاد پشت لەدوای پشت دابەش بۆتە سەد سەدەها کۆمەڵی جیا جیا . هەر کۆمەڵەی خەریکی شی کردنەوەو تێگەیشتنی لایەنێکی یا بەشێکی لایەنێکی ئەم سروشتەیە – سوپاس بۆ نووسین و چاپەمەنی کە تەجرەبەو دەسکەوتەکانی پشتە ڕابردووەکان بە داهاتووەکان ئەگەیەنی .

هەوڵدانی ئادەمیزاد بۆ بەکار هێنانی هێزو دیاردەکانی سروشت بۆ بەرژەوەندی خۆی دەورێکی بالأی بینیوە لە ئاشکرا کردنی گەلێ لە نهێنیەکانی بۆ نموونە ئەوانەی ئەبن بە بزیشك ئەیانەوێ لە چۆنیەتی پێك هاتن و کار کردنی لەشی ئادەمیزاد بگەن و ئەو یاسا و نیزام و پەیوەندی‌یانەی لە نێوان ئەندامەکانا هەن بدۆزنەوە . تا گەر گیرو گرفتێ لە تەندرووستیدا ڕوویدا چارەسەر بکرێ . لەوانەیە مەبەستی ڕاستەوخۆی زۆربەی زۆری ئەوانەی ئەبن بە بزیشك مرۆڤایەتی یا ماددە بێ . بەلأم لە پاڵ ئەمەدا مەبەستێکی مەزنی تری دوور لە ژوور ئەمەدا هەیە . بەم کارەیان زانیاری دەربارەی چۆنیەتی پێك هاتن وکارکردنی لەشی ئادەمیزاد کۆ ئەکرێتەوە . ئەمە هەوڵدانێکی ژوور هۆشی‌یە Unconscious بۆ تێگەیشتن و زانینی لایەنێکی ئەم سروشتە کە بەشداری ئەکات لەوەی تیشك بخاتە سەر یەکێ لە نهێنی‌یەکانی . هەموو لقێکی تری زانست بەم جۆرە ئامانجێکی دوور و

ڕاستەوخۆی هەیە ئەویش هەڵماڵینەوەی پەردەی نهێنییەکانی سروشتە و گەیشتنە وەڵامی پرسیاری بوونە.

بەسایەی تێکۆشانی ئادەمیزاد خۆی ملیۆنەها پرسیاری سەرسوڕمێنەر دەربارەی خۆی و ئەم سروشتەی دەور و بەری ئیمڕۆ بە ئاسانیو لەسەر بیناغەیەکی مەنتیقی وەڵامیان ئەدرێتەوە کە جاران وەڵامەکانیان لەسەر بیناغەی ئەفسووناوی ئەدرایەوو. چەندی پێ چوو تا مرۆڤ گەیشتە ئەو ڕادەیەی توانی بزانی شێوەی ئەم زەمینەی لە سەریایە چۆنە وشوێنی لە جیهانا و پەیوەندیی لەگەڵ مانگ و هەتاو ئەستێرەکانا چییە؟ ئەمە چیرۆکێکی یەگجار بەتامە ئەوە ئەهێنی هەر یەکە نەختێ خۆی بە زانستی فەلەك خەریك کا تا لاپەڕەیەکی گەشی تێکۆشانی ئادەمیزاد لە پێناو ناسینی خۆیتان بۆ دورکەوێ.

با بێینەوە سەر ئادەمیزاد کە بوونی یەکێکە لە هەرە سەر سوڕمێنەرەکانی ئەم سروشتە. بریتییە لە سەدەها سیستەمی و ئاڵۆز و چووە ناویەك. ئەو زانایانەی خەریکی ئەوەن بزانن ئادەمیزاد چییە دابەش بوونەتە سەد گەڵی کۆمەڵی جیا جیا. هەر کۆمەڵەی لە سووچێکەوە خەریکی لایەنێکیەتی. بەشێ بە تەنگ ئەوەدان بزانن ئادەمیزاد چۆن پەیدا بووە. بەشێ ئەیانەوێ ئەو قۆناغانە دەس نیشان کەن کە ئادەمیزاد لە بەری بەیانی پەیدا بوونییەوە پیایاندا تێپەڕیوە. بەشێ خەریکن لەو ڕەگەزە جیاوازانە (ڕەگەزی ڕەش، سپی، زەرد سوور.) ئەکۆڵنەوە. بەشێ خەریکن لە ئادەمیزاد بگەن وەك هەیە.. هتد.

ئەوانەی ئەیانەوێ لە ئادەمیزاد بگەن وەك هەیە ئەیانەوێ لە چۆنیەتی پێك هاتنو کار کردنی لەشی بگەن. چاو چۆن ئەبیستی؟ گوێ چۆن ئەبیتێ؟ هەناسە چۆن وەرئەگیرێ؟ خوێن چۆن ئەسووڕێتەوە؟.. هتد بارەگای هەڵسوڕاندنی هەموو ئەم دەزگایانە مێشکە. واتا هەر سیستەمێکی لەش مێشك بەشەکیەتی. جگە لەوەی مێشك هەموو ئەندامانی لەش بەڕێوە ئەبات سەرچاوەی بیرکردنەوە و شوێنی پاراستنی زانیاریشە. هەر یەکە لە ئێمە چەن شت ئەزانێ. چەن شوێنو کەس ئەناسێ، چەن کارەساتی بەسەرا هاتووە.. چەن خۆشی شادیی بینیوە هەموو لەم مێشکە بچووکەدا پارێزراوە. کەی باسی شتێ کرا هەموو ئەو شتانەی پەیوەندییانە بەو شتەوە هەیە یەکسەر دێتە یاد و بەرچاو. ئەمە چ توانایەکە؟ زۆربەی زۆری ئەم زانیارییانە لە ڕێی زمانەوە ئەچێتە ناو مێشك و هەر لە ڕێی زمانەوە دەرئەبرێ.

واتا گەر ئێمە لە سروشتی زمان بگەین لەوانەیە تا ڕادەیەکی زۆر لە سروشت و چۆنیەتی کار کردنی مێشك بگەین. کەی لە چۆنیەتی کار کردنو سروشتی مێشك گەیشتن ئەوە لە یەکێ لە نهێنییەکانی لایەنێکی هەرە گرنگی ئەم سروشتە گەیشتین. لێرە گرنگیی زمان دەرئەکەوێ. ئەو بەشەی زانست کە تەرخان کراوە بۆ تێگەیشتنی مێشك لە ڕێی زمانەوە بە – neuro Linguistics. ناو ئەبرێ. باشە زمان خۆی چییە و چۆن پەیدا بووە؟ بۆ یەك زمان لە جیهانا نییە؟ بۆ هەموو زمانێ چەن شێوەیەکی هەیە؟ بۆ هەندێ زمان سەرەڕای دووری جوغرافییان لە یەك زۆر لەیەك ئەکەن و هەندێ زمان سەرەڕای دراوسێ یەتیان زۆر جیاوازن؟ چۆن ئادەمیزاد ئەتوانێ ئەم بیرو خەیاڵانەی لە مێشکییا هەن یەکسەر بکاتە ڕیزە دەنگێك و گوێگر – گەر سەر بە هەمان زمان بێ – تێ ئەگات بێ ئەوەی ئەو شتەی پێشتر بیستبێ یا ووتبێتی یا زانیبێتی.... هتد. ئەو بەشەی زانست کە شوێن وەڵامی ئەم پرسیارانە کەوتووە زانستی زمانە Linguistics. واتا زانستی زمان ئەو بەشەی زانستە کە هەوڵ ئەدا بزانێ زمان چییە. لێرە کە ئەڵێن(زمان مەبەستمان زمانە بەگشتێ وەك دیاردەیەکی ئینسانی – نەك زمانێکی تایبەتی. چونکە هیچ کۆمەڵە ئادەمیزادێ نییە لە جیهانا زمانی نەبێ. هەمووش هەمان ئەرك بە هەمان ڕێگە بە جێ ئەهێنن. ئەویش گواستنەوەی ئەو بیرو خەیاڵانەی لە مێشکا هەیە بە هۆی کۆمەڵە دەنگێکی بەزار دروست کراو بۆ بەرامبەر. ئەمە ئەوە ئەسەلمێنێ کە هەموو زمانانی جیهانی لە هەمان پلەی پەرەسەندندان و هەموو بە قەد یەك ئاڵۆزن و ئەو زمانانەی گوایا پێیان ئەووترێ بیدائی بوونیان نییە. واتا یەك بیناغەی بنجی هەیە هەموو زمانانی جیهان لە سەریا دامەزراوە. یا کۆمەڵە یاسایەکی بنجی هەن هەموو زمانانی جیهان تیایانا بەشدارن و بە هۆیانەوە کار ئەکەن. ئەرکی زانستی زمان تێگەیشتنی سروشتی ئەم بیناغە گشتییەیە و دۆزینەوەی ئەو یاسا بنجییانەیە کە هەموو زمانانی جیهان تیایا بەشدارن و بە هۆیانەوە کار ئەکەن.

هەر دیاردەیەکی سروشتی بەلای کەمییەوە لە چوار لایەنەوە لێی ئەکۆڵرێتەوە.

**١ – باری ئیستەی چۆنە و چۆن کار ئەکات. ئەمە لایەنی**

**وەسفی ئەگرێتەوە**

**٢ – ئەو پلە و قۆناغانەی پیا تێپەڕیوە . ئەمە لایەنی مێژوویی ئەگرێتەوە .**

**٣ – گەلێ سیستەمی تر هەن لە سروشتا . . بەم چوو و جیاواز لێ‌ی بەراوورد ئەکرێن ئەمە لایەنی بەراووردی ئەگرێتەوە .**

**٤ – لە سەرەتادا وەك دیاردەیەکی سروشتی چۆن پەیدا بووە .**

زمانیش لەم ... گشتی‌یە بەدەر نی‌یە . لەم چوار ڕووەوە سەیری ئەکرێت و پی‌ی ئەکۆڵرێتەوە . واتا زانستی زمان وەك هەموو لقێکی تری زانست چوار لقی گشتی لێ ئەبێتەوە .

**١ – زانستی زمانی وەسفی Discriptive Linguistics**

ئەم لقە بایەخ بەشی کردنەوە و پێشاندانی شێوە و چۆنیەتی کار کردنی زمان ئەدات ، کە لەلایەن کۆمەڵێك خەڵك لە کاتێکی دەس نیشان کراوا بەکار ئەهێنرێت .

کاتەکە ئەشێ ئیستا بێ و ئەشی رابردوو بێ . ئەو زمانانەی هێشتا حویان نەخستۆتە ناو چوار چێوەی نوسین بێ‌گومان ناکری شیوەی پێشوویان پیشان‌بدری ئەتوانریت باسی شێوەی قوناغە رابردووەکانی زمان بکرێو لێ‌ی بکۆڵرێتەوە کەی نووسراوی ئەو قۆناغانە بەدەستەوە بوون .

لێکۆڵینەوەی زمان لەسەر بیناغەی زامستی زمانی وەسفی بایەخ بە زمانەکە ئەدات تەنیا لەو ساتە تایبەتی‌یەدا .واتا ، لەم جۆرە لێکۆڵینەوەیەدا نابێ باسی هیچ قۆناغێکی تری زمانەکە بکرێت . هەروا نابێ باسی هیچ زمانێکی تر بکرێت چ دوور چ نزیك . زانستی زمانی وەسفی بە گرنگترین لقەکانی زانستی زمان ئەژمێرێ ، چونکە بەبێ بەجێ هێنانی ئەم لقە لقەکانی تر بەجێ ناهێنرێن .

**٢ – زانستی زمانی مێژووی Historical Linguistics**

لێکۆڵینەوەیە لە پەرەسەندن و گۆڕینی زمان بە تێپەڕینی کات و ڕێگە و هۆی ئەم گۆڕنیانە لە کاتێکەوە بۆ کاتێ و دۆزینەوە و دەس نیشان کردنی ئەو هۆیانەی کار ئەکەنە سەر زمان و ئەیگۆڕن .

ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە ئەبێ لەسەر بیناغەی پێشاندانی لایەنە لەیەك چوو و جیاوازەکانی هەمان زمان یا شێوە لە دوو یا چەن قۆناغێکی جیاوازا دامەزرابێ .

**٣ زانیستی زمانی بەراووردی Comparative Linguisticx.**

لە زانستی زمانی بەراووردی‌یا دوو یاچەن زمانێ یا شێوەیێ یـ هەمان زمان یا شێوە لە دوو قۆناغی جیاوازا لە یەك چەن ڕوویەکەوە بەراوورد ئەکرێن .

**زانستی زمانی بەراووردی دوو لقە**

أ – بەراوورد کردن لە سەر بیناغەی پەیوەندی‌ی مێژووی نە نێوان دوو یا کۆمەڵێك زمان بۆ دۆزینەوەی ڕادەی پەیوەندی‌ی مێژووی و خزمایەتی نێوان ئەم زمانانە و دووری و نزیکی‌یان نە یەك و دۆزینەوەی ئەو زمانانەی سەر بە یەك بنەماڵەن .

ب – بەراووردکردنی دوو یا چەن زمانێ بۆ پێشاندانی لایەنە جیاواز و لە یەك چووەکانیان بێ ئەوەی گرنگێ بدرێتە پەیوەندی‌ی مێژووی نێوانیان . مەبەست لەم جۆرە بەراوورد کردنە دۆزینەوەی ئەو کەرەسە و یاسایانەیە کە کۆمەڵە زمانێ تیایـ بەشدارن . ئەم جۆرە دابەش کردنە بە Typologicai Classificahion **ناو ئەبرێت** .

**٤ – نژادی زمان : The origin of language**

ئەم بەشەی زانستی زمان هەوڵ ئەدا بزانێ لە سەرەتادا زمان چۆن پەیدا بووە . لێرە ئەڵێین (زمان) نەك (زمانێکی تایبەتی) . واتا پەیدابوونی زمان بە گشتی وەك دیاردەیەکی سروشتی و ئینسانی ، نەك زمانی کوردی یا عەرەبی . . . هتد . جیاوازی هەیە لەنێوان (نژادی زمان) و ( نژادی زمانی کوردی) هەر وەك چۆن جیاوازی هەیە لە نێوان (نژادی ئادەمیزاد)و (نژادی من یـ تۆ . . .) .

زمان پەیوەندی لە گەڵ لایەنی ئەم ژیان و سروشتە هەیە . لە ڕووی هەموو ئەم لایانانەوە ئەشێ شی بکرێتەوە و لێ‌ی بکۆڵرێتەوە . بەم جۆرە زانستی زمان یەگجار فراوان بووە . جگە لەم لقانەی باس کران گەلێ لقی تری وەك ئەوانەی خوارەوە دەس نیشان ئەکرێن :

**١ – زانستی زمانی نەفسی Psycholinguistics**

**٢ – زانستی زمانی کۆمەڵایەتی Sociolinguistics**

**٣ – زانستی زمانی دەماری Neurolinguistics.**

. . . . **هتد** .

بەڵام ئەم چوار لقەی سەرەوە لە هەمووان گرنگترن چونکە هەوڵ ئەدەن لە چەمکی زمان بگەن وەك دیاردەیەکی سروشتی .

## مێژووی کۆنی کوردستان

# نائیری یاد

زبیر بلال اسماعیل

● لەوانەیە گەلی نائیری بەشێکی گرینگ بێ لە گەلی سوباری ، کە سێ هەزار سالّ پێش زایین ناوی لە دەقە بزماری‌یە کۆنەکان‌دا هاتووە . هەندێ لێکۆلّەر سنووری ولاّتی سوباری‌یان وا دیارکردووە : لەباکووردا دەریاچەی وان ، لە رۆژئاوادا دۆلّی خاپوور ، لەرۆژهەلاّت‌دا شاری کەرکووك ، وە لەخوارووشەوە ولاّتی بابل . گەلی نائیری بەزمانێك قسەی‌کردووە لەوانە لە گروپی زمانە قۆقاسی‌یەکان بووبێت .[(١)]

لە کۆتایی سەردەمی ئاشووری‌دا ، ناوی سوباری نەماو نائیری یان نایری ، کە لە ولاّتی سوباری نیشتەجێ بوو بوون بەتایبەتی لەبەشەکانی سەرووی‌دا ، کە بە ولاّتی نائیری زانرا . . جێگاکەی گرتەوە .

لە سەردەمی نوێ‌ی ئاشوری‌یەوە (٩١١-٦١٢) پێش زایین ، ناوی نائیری لە تۆمارکراوەکانی ئاشووری‌دا هاتووەو ، وا بەر بیر دەکەوێ وشەکە بەو گەلە یان بەو ولاّتە ووتراوە کە دەکەوێتە باکووری ئاشوورەوەو . ئاشووری‌یەکان زۆر چەلّنگی پاراستنی ئەو رێگایانە بوون کە بەهۆیانەوە کاروانی بازرگانی دەگەیشتە هەردوو دەریاچەی ورمێ‌و وان ، کە ئەمڕۆ بە (ئاذربایجان) ناو دەبردرێ‌و . کاروانی بازرگانیش کەل‌وپەلی جیاجیا لە : (کان) ی خاو ، وەك مس‌و ئاسن‌و قەلاّیی کە بۆ بەرهەم‌هێنانی کەرەستەی جەنگ‌و دروستکرونی چەك وەك شمشێرو تیرو نێزەو قەلّغان پێویستن‌و ، پیشەسازی‌یە ناوچەییەکانی تری تایبەت بە کەرەسەی ناومالّ‌و کاری رۆژانە ، هەروەها زێرو زیووو پێست‌و قوماشی رەنگاورەنگ . . سەرەرای پێویستیەکانی تر لە خۆراك‌و خواردن‌دا . بۆ ولاّتی ئاشووری‌یان وەگواستەوە .

جا بۆ پاراستن‌و سەلامەتی هاتوچۆکردنی کاروان‌و دابین کردنی

# ... نائیریەکان

پێداویستی‌یە گرینگەکانی ئابوری وڵات ، ئاشووریەکان بایەخی زۆریان بە ڕێگا بازرگانی‌یەکان دەداو بەپەرۆشی ئەوە بوون کە هەمیشە دەستیان لەم بەشەی ئیمپراتۆریەکەیاندا گیربێت‌و دەرفەتی ئەوە نەدرێ دەوڵەتێکی بەهێز دابمەزرێ ببێتە هۆی کزبوون‌و پێلەقکردنی دەسەڵاتیان‌و . بۆ ئەوەی لەم ناوچەیەدا بەردەوام ، دەست بەسەر ئابوری وڵات‌دا بگرێت‌و هەردەم دەشت‌و دەری وڵات‌و ناوچە چیاییە دەوروبەرەکەی . لە ئابلۆقەو پەلاماردانی دانیشتوانە چیاییەکانی نائیری‌و ئورارتوو خلدییەکان (٢) لە باکووری دەریاچەی وان‌و ڕۆژئاوی‌دا بپارێزێت . دەوڵەتی ئاشوری هەمیشە لەشکری لە ئاراو ئامادە بوو بۆ لەناوبردنی هەر بزوتنەوەیێك یان شۆرشێك سەرهەڵبدات . سەرکەوتنی ئەم کارەش وا لە ئاشوری‌یەکان دەکات . بنکەی بەهێزی پاراستن لەم وڵاتەدا دابمەزرێنن . بەم جۆرە چەندین ئاوەدانی‌ی . (مستعمرەیان) لە دەرەوەی نیشتمان‌دا دامەزراند . لەوانە : لە وڵاتی (کبدوکیا) لە خوارو و ناوە ڕاستی ئاسیای بچووکەوە . وە لە دەشت‌و ناوچەکان خوارووی هەردوو دەریاچەی ورمی‌و وان‌و ناوچەکانی نزیکیان لە باکووری عیراق‌و ئەو وڵاتەی کە بە وڵاتی نائیری ناوبردرا .

لەسەرتاوەو ، لەو کاتەی کە وڵاتی نائیرەو خوارووو ناوەڕاستی ئاسیای بچووك لەژێر باری ناکۆکی سیاسی ئەژناو سەرکردیەتی یەکگرتووی نەبوو ، تا ڕادەیەك . ئەم سیاسەتەی ئاشوری سەری‌گرت‌و باری ئابوری وڵات پەرەی‌سەند . بەلام ئەم خەون‌و ئامانجەی تا سەر نەبوو . بەتایبەتی لەو کاتەی کە دەوڵەتێکی نوێ لە وڵاتی نائیری‌و چیاکانی ئارارات‌دا . کە دەوڵەتی ئورارتی یان خلدیەیە سەری‌هەڵداو توانای عەسکەری‌و دارای ئمپراتۆریەتی ئاشوری بە درێژایی سەدەیێك چۆرو لەبن‌هێنا . تا لە ئەنجام‌دا پەکی‌کەوت‌و نەیتوانی لەبەردەم میدیایی‌و بابلی‌یەکان‌دا خۆی ڕابگرێ‌و شکا . (٣)

ئەم باسەمان . باسی دەوڵەتی ئورارتیە نی‌یە . بەلام لەبەر ئەوەی ڕووداوەکانی ئەم دەوڵەتە پەیوەندێکی بەتیتیان بە وڵاتی نائیری‌یەوە هەیە بەهۆی شوێنی جوگرافیایەوەو . . چونکە هەردووکیان لە بەسەرهات‌و ڕووداوە مێژوویی‌یەکانیان‌دا یەك دەگرنەوە . بەتایبەتی لە باسی شەڕی نێوان ئاشووری‌و ئورارتیەکانەوە . لەبەر ئەوەوە ناومان هێنا .

**وڵاتی نائیر :**

وا بەدیار ئەکەوێ ، گەلی نائیری . لەسەرەتاوە ، لە کوردستانی باکووردا نیشتەجێ بووە . . . لەپاشان ، لەبەر زەبروزەنگی ئورارتیەکان ، بەرەو خوارووو ڕۆژئاواوە کۆچی کردووە . لەم بارەیەوە (سدنی سمث) دەڵێ : « ئورارتیەکان کە لە پەلاماردانەکانی پاشاکانی ئاشوور لە ساڵی ١٢٦٠ ی پێش زایین‌دا ناویان هاتووەو لەو ناوچەیە ، کە لە کتێبی پیرۆزدا لە سەدەی شسنزەهەمی پێش زایین یەناوی (ئورارتور تارارات) ناوبردراوەو . کە دەکەوێتە نێزان دەریاچەی ورمێ‌و وان ، نیشتەجێ بوون . بەرەو باکووری کوردستان کشان‌و وایان لە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە کرد کە لە خوارووی دەریاچەی وان بۆ ڕۆژئاواو خوارووی‌دا کۆچ بکەن . ئەمەش بووە هۆی دامەزراندنی هەندێ میرنشین . کە پاش سەردەمی ئاشووریەکان بەناوی نائیری زانراون لەژێر دەستەلاتداریتی ئورارتو دابوون . (٤) مێجەر سۆنیش هەر بۆ ئەم ڕایە دەچێ‌و دەڵێ : وڵاتی نائیر تەنیا بریتی نەبوو لە بەشی باکووری ڕووباری زابی گەورە . بەڵکو لەڕاستیدا . پاشای ئاشوورتەگلات پلاسری یەکەم‌دا «١١١٢ ١٠٧٤) پێش زایین‌و

نەوەکانی ،ناوی نایرییان لەو دانیشتوانانە دەنا کە لە دەوروبەری دیجلەو فورات‌و باکوری نیڤاتس «طور عابدین» واتە هەرێمی دیاربەکرو خەرپووت‌و دەرسیم»ی ئێستاو چیاکانی بەدلیس‌و تورۆس ، نیشتەجێ بوون . چیای (طور عابدین) کە لە کۆنەوە بە (نیڤات) ناسراوە ، لە سەردەمی پاشای ناوبراو باکووری سنووری ولاتی ئاشوور بوو . . . وە ولاتی نەناسراوی نائیر ، کە هەمیشە ئەم پاشایە هەوڵی داگیرکردن و دەست بەسەراگرتنی دەدا ، کەوتبووە پاش ئەم سنوورە» . [٥]

بەم جۆرە نائیرییەکان ، لە سەرەتادا ، لە کوردستانی باکووردا نیشتەجێ بوون ، لەپاشان لەبەر زەبرزەنگی ئورارتییەکان بەرەو کوردستانی ناوەراست کشان‌و لەوێدا جێگیربوون . لەم بارەیەوە سۆن دەڵێ : «بەم جۆرە دەبینین گەلی نائیر ، کە پێش میدییەکان لە کوردستان ناوەراستدا ژیاوە ، ولاتەکەی لە ئەستێلی ناوەراستی زێی گەورە واتە (زێی بادینان) تا سەرچاوەکانی ئەم رووبارە درێژ بووەتەوە» . [٦]

لێکۆڵینەوە نوێیەکان ، جێگیر بوونی نائیرییەکان لە کوردستانی ناوەراست‌دا دوویات دەکەنەوە . ناوچەی نائیر یا (خوبشکیا) کە (توراداینخن)ی رۆژهەلاتناس بە دۆڵی بۆتان دایدەنێ . لە زاخۆوە تا ناوچەکانی سەرووی زابی گەورە . . وە لە باکووردا تا خوارووی دەریاچەی وان . . وە لە خوارووەدا تا شاری ئێستای رەواندوز . . درێژ بووەتەوە . [٨]

### مێژووی نائیر :

بەسەرهاتی مێژوو دەریدەخات کە نائیرییەکان لەسەر حیسابی دەوڵەتی ئاشووری ناوچەی خۆیان فراوان کردووە بەرەو خوارو کشاون ، ئیتر بۆیە هەر لە سەدەی دوانزەهەمی زایینییەوە پاشاکانی ئاشوور بە ناچارییەوە رووبەرووبان وەستان‌و بەگژیاندا چوون . بەلام پێش ئەمە ناچار بوون کە هاوکاری‌و هەڵس‌و کەوتیان لەگەڵ نائیرییەکان بکەن تەنانەت تەگلات پلاسری یەکەم پاشای خاوەن شکۆ ، بەو پەری رێزەوە هەڵس‌وکەوت‌و هاوکاری لەگەڵ پاشاکانی نائیریدا دەکرد[٩] . . هەرچەندە ئەم جۆرە کردەیە لەگەڵ پەیرەوو سروشتی پاشاکانی ئاشوور نەدەگونجا ، بەلام بەرژەوەندی سیاسی‌و ئابووری وای پێویست دەکرد . مامۆستا (راگوزین) لەم بارەیەوە دەڵێ : «گومان لە هەڵس‌وکەوتی چاکی تەگلات پلاسر لەگەل پاشاکانی نائیرییەوە ناکرێت .ئەمەش جێگای سەرنج راکێشانە ، چونکە ئەم هەڵوێستە مەبەستدارە لەگەڵ ئامانج‌و سروشتی پاشا توندوتیژەکانی ئاشوور نەدەگونجا . . . بەر گومانیش ناکەوێ کە ئەم هەڵس‌وکەوتە چاکەو بەپیرەوەچوونی رێزگرتنی هەست‌و خواستی پاشاکانی نائیر ، دەچێتە ژێر رەحمەتی پێویستیی رۆژ و بارو دۆخەوە»[١٠]

لە سەرەتای سەدەی دوانزەهەمی زایینی‌و بەولاوە ، کە دەوڵەتی نائیر لەسەر حیسابی ئیمپراتۆریەتی ئاشوورەوە بەرەو خواروو بلاوەی کرد ، پاشاکانی ئاشوور کەوتنە بەرپەچدانەوەو شەرکردنیان . هەمان پاشای ناوبراو گردی (ملاز گرد) لەگەل سوپای بیست‌وسێ پاشای نائیری لە توندوتیژترین شەری خوێناویدا جەنگا ، [١١] سەرەنجام سەرکەوت‌و ئەم بارتەقابردنەو تەواوی شەروشۆقە خوێناویەکانیشی لە پەیکەرێکی گەورەوا کە لە سەروچاوەی دجلەدا دروستیکرد ، نەخشێنراو تۆمارکرا . [١٢]

وە لە دەرووبەری ٩١٠ ی پێش زایین ، سوپای ئاشوور لەشکرێکی گەورەی بۆ سەر ولاتی (کوتموخ) دا رێکخست . وە لە نێوان دجلەو جودی (چیایێکە لە دورگەی – ابن عمر–لە کەناری دەستەراستی (دیجلە) لە شەرێکی خوێناویدا ، سوپای ئاشوور سەرکەوت‌و ولاتەکەی خستە ژێر باڵی ئیمپراتۆریەتەکەیەوە . هەروەها (توکلتی نن ئەورتای دووەم –٨٩٠– ٨٨٤) پێش زانیین ، هەروەکو پاشاکانی تری ئاشوور بەم میللەتەوە سەرقاڵ بوو بوو . [١٣]

### هەواڵی نائیری دوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئورارتییەکان

لەو کاتەی دەوڵەتی ئورارتی لەسەر دەستی سەردوری یەکەم لە سەردەمی پاشای ئاشووری ئاشور ناسر پالی دووەم (٨٨٣–٨٥٩) پێش زایین ، دامەزرا ، ولاتی نائیری‌و ئورارتو ، دوو ولاتی هێمن‌و ئاسایشداری ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی ئاشوور نەبوون ، ئاشوور ناسر پال کە لە شاری کەلحۆ «کالح – نمرود) حوکمی دەکرد ، لە بلاوکراوە جەنگیەکانیدا رایگەیاند بوو کەوا «ولاتی نائیری‌و کەرخی‌و شوباری‌و نیرب‌و ئوارارتوی داگیر کردو لەپاشان رووی کردە ولاتی بابل‌و تەسکابی کروری‌و ولاتی حەلزان . وە لە پشتەوەی زابی بچووکدا بەرەو ولاتی زابا– ناوچەی رۆژهەلاتی دجلە– لەنێوان هەردوو زاب‌دا–هەولێر) سورابەوە . [١٤]

سەرەرای ئەوەی بۆ ماوەیەکی کەم ، هێمنایەتی باڵی بەسەر ئەم ناوچە چیاییانەدا کێشابوو . بەلام . دەرحاڵ ، کە هەواڵی

مردنی ئاشور ناسر پال زانرا ، گەردەلوولی ئاگری بێبەزەیی ، بەگوڕەوە ، پەرۆشی تێکدانی تەختو تاجی پاشا ئاشووریەکان بوو . ئەوە بوو هێزی ئورارتی پەلاماری بنکەکانی ئاشووری داو ناوچە دوای ناوچەی دەسەندەوە ، تا پاشای نۆی « شلما نصری سێیەم) کە پایەی پاشایەتی لە ساڵی ٨٥٩ ی پێش زاین ، دوای مردنی باوکی ، پێدرا . . لە سێیەمین ساڵی حوکمیدا ، ناچار بوو لەشکرێك ، کە خۆی سەرکردایەتی کرد ، بۆ سەر ولاتی نائیریو ئورارتو رێك‌نجا . . . رێی ناوچە چیاییەکانی باکووری عیراق گرتەبەر تا گەیشتە سەرچاوەی دجلەو فورات ، وە لەوێدا هەروەك باپیرە گەورەکەی (تەغلات پلاسری یەکەم) قوربانی پێشکەش بە خوداوەندەکانی کرد . وە ئەمەشی لە بلاوکراوە جەنگیەکانیدا تۆمارکردو لە دەرگای برۆنزی کۆشکەکەیدا نەخشاند ، کە هورمز رەسام لەو شوێنەوارە دێرینەی کە بە ( تل بلاوات) ناسراواوە ، لە نزیك نمرود دا دۆزییەوە . وە لە بلاوکراوە عەسکەرییەکاندا دەردەکەوێ کەدا مەبەستی ئەم پەلاماردانە ، ئورارتو بووە ، (شلما نصری سێیەم) بە ولاتی خبشکیا (نائیر )تێپەڕیو شاری سکۆنیای پایتەختی (ئارامی) Arame ی پاشای ئورارتی هەلاتوو داگیرکردو تا چیای (ئەدوری– Adduri یش راوناو (٣٤٠٠) سێ هەزارو چوارسەد پیاوی لێ‌کوشت . وە لە دەیەمو یانزەهەم ساڵەی حوکمیدا پێنج لەشکری تری ناردە سەر ئارامی پاشای ئورارتی . سەد شاری داگیر کرد بەلام نەیتوانی ئارامی کە هەمیشە لە چیایێکەوە بۆ چیایێکی دوورتر خۆی بزر دەکرد . بیکوژێت‌و لەناوی ببات .

شلمانصر لە (٢٧) بیست‌و حەوتەمین ساڵەی حوکمیدا بوو کە (سردوری) یان ( سدوری دووەم) ، پاش مردنی ئارامی باوکیی ، هاتە سەر حوکم . وە دیان ئاشوور سەرکردەی گشتی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری لەشکرێکی گەورەی بۆ داگیرکردنی ولاتی (سدوری) ناو داو بەسەریدا زاڵ بوو . لە (٣١) سیو یەکەمین ساڵی حوکمی شلمانصردا ، دیان ئاشوور ، جارێکیتر بەسەر ولاتی ئورارتوی داداو ئەوجارە رێگای خەبشکیا (پایتەختی نائیر) و (مساسر)و (تۆبزاوە) ی بەرنەدا[١٥] تا پەنجا شاری ئورارتی نەخستە ژێر گەمارۆی سووتاندنو ویرانکردن .[١٦]

هەرچەندە مەملەکەتی ئورارتو هەردەم گەمارۆو پەلاماردانی ئاشووری لێنەدەبڕایەوە ، بەلام نە تەخت کراوو نە لەناویش چوو . لەکاتی نەوەکانی (شلمانسری سێیەم)دا خەلیفەکانی ، وەك . شەمش ئەدادی پێنجەم) و (سمیر ئەمیس) و (ئەدد نیراری سێیەم) . ساڵێك لە ساڵەکانی حوکمیاندا تێنەدەپەری گەر پەلامارێکی ولاتی ئورراتییان نەدابایە . . . بەلام هەر جار کۆتایی پەلاماردانەکان بە داگیرکردنی ولاتی نائیریو تۆڵەسەندنەوە لە میدیەکانو سووتاندنو ویرانکردنی (وان)ی پایتەختی ئورارتی دەهات . بێ ئەوەی زیاتر زەفەر بە هێزەکانی ئورارتی ببەن .

بەوێنە (شمش ئەدادی پێنجەم) کە لە (٨٢٨–٨١٠) ی پێش زایینیدا حوکمی نمرودی دەکردو لەسەردەمی هەردوو پاشای ئورارتی ( ئیشبوئینی) و (منوا) ی کوریدا . جلەوی حوکمی لەدەست‌دابوو . . لە سێیەمین ساڵی حوکمیدا گەورەترین لەشکری بۆ سەر ولاتی نائیریو ولاتی ئارامی (ئورارتو ) رێکخست‌و (٥٠٠) پێنج سەد شارو دێهاتی سوتاندو ویران کرد، بەلام (ئیشبوئینی) و (منوا) ی کورەکەی ، توانیان سنووری ولاتەکەیان لەخوارووەوە تا ولاتی (مصاصر) بەرفرەتر بکەنو پەیکەرێکی یادگارنامەشیان . بۆ سەرکەوتنەکانیاندا دامەزراند ، کە تێیدا ووتبویان «لەو کاتەی کە لە شاری» (مساسر) . پایتەختی ولاتی (مصاصر)ئامادەبوون . ئیشبوئینی کوری سردور . پاشای گەورەو مەزن . پاشای ولاتی نائیری . لە شاری تشبا (وان) چووە پەرستگای خوداوەند( خلدیا) و قوربانی بۆ کردو بەناوی ئەویشەوە قوربانی بە دانیشتوانانی بەخشی . .)[١٨]

کۆتای سەدەی نۆیەمو نیوەی یەکەمی سەدەی هەشتەمی پێش زایین . بە کزبوونیو بێتوانایی هێزی عەسکەری ئاشووری دادەندرێت . ئورارتیەکان ئەم هەلەیان . بۆ جێگیربوونیو دامەزراندنی قەوارەی ئیمپراتۆریەتی خۆیان . بە هاوکاریکردن لەگەل پاشا کانی نائیری . بەدەرفەت زانی . بەم جۆرە . نەك تەنیا سنووری ئیمپراتۆریەتەکەیان لە سنووری ولاتی ئاشور دایەوەو بەس . بەلکو بێهێزیی هەندێ پاشای ئاشوور وەك : (شلما نسری چوارەم ٧٨١ ٧٧٢) پێش زایین . وە (ئاشوردانی سێیەم ٧٧١ ٧٥٤) پێش زایین . وەك (ئاشور نیراری پێنجەم ٧٥٣ ٧٤٦) پێش زایین

بەرپابوونی شۆرشێك لە ولاتی ئاشووردا . کە لە ئارانخا لە رۆژهەلاتدا تا شاری گۆزانا لە رۆژئاوادا گرتبووەوە[١٩] . بە هەلە بزانن‌و توانیان ئەو ناوچانەی

دەکەونە باکووری سوریا لە رۆژئاوادا تا نزیك روباری ئاراخسس (روباری خالس – قزل) لە رۆژهەلاتدا ، نجەنە ژێر دەسەلاتی ئیمراتۆریەتە مەزنەکەیان .

لە سالی ٧٤٣ پێش زایین ، هێزێکی نائیری بەسەر باکووری رۆژهەلاتی ولاتی ئاشووری داداو توانی خۆی بگەیەنێتە ناوجەرگەی ولات . تەغلات پلاسری سێیەم (٧٤٥-٧٢٧)ی پێش زایین ، ناچارما بەرهەلستی بکاتو زۆر بەزەحمەتەوە لە ولات دەری بکاتو تا پاش چیای جودی راوی بنێت .[٢٠] هەروەها لە سالی ٧٤٣ ی پێش زایین ، تەغلات پلاسر لەشکرێکی گەورەی بردە سەر پاشای ئورارتو دوای شەروشۆڕێکی گەرم سوپای ئورارتو شکاو پاشاکەی بەرەو تشب (وان) هەلات .

دوای مردنی تەگلات پلاسرو هاتنی شلمانصری پێنجەم بۆ حوکم ، وە لە ئەنجامی تێکچوونی باری ناوخۆی ولاتو .. ئاژاوەو ناکۆکی ناوەوەو دەرەوە کە سەرانسەری ئیمپراتۆریەتی ئاشووری گرتبووەوە ، ئەرسا روسای دووەم ، پاشای ئورارتو ئەم هەلەیەی بە دەرفەت وەرگرت . لە ورمێو واندا پەلاماری ئاشووریەکانی داو توانی بەشێکی زۆری ناوچەکانی ئاشوور داگیر بکاتەوە . وە لە نزیك شاری (مصاصر) کە ئەمرۆ بە تۆبزاوە دەناسرێت ، پەیکەرێکی بۆ یادکردنەوەی سەرکەوتنەکانی بەسەر دەولەتی ئاشووردا سازکرد .[٢١]

**ڕاپەڕین و پەرەسەندنی ئاشوور لەسەردەمی سەرجۆندا :**

پاشای نوێی ئاشوور ، سەرجۆنی دووەم (٧٢١-٧٠٥ پێش زایین) ، کە ولات لەوپەڕی پەرەسەندندابوو ، ناچار بوو پەلاماری ناوچە جیاجیاکانی ئورارت بدات . ئەوە بوو لە پەلامارداني سالی ٧١٤ی پێش زایین‌دا ، کە خۆی سەرکردایەتی لەشکری کرد ، سوپای ئورارتیو میدیاو زگرتیەکان کە بەسەرۆکایەتی ئەرسای دووەم بوو ، شکاندو شاری (ساسر)ی داگیر کردو (وان)ی پایتەختی ئورارتیەکانی سوتاند[٢٢] . . . وە لەکاتی گەرانەوەیدا بە شاری (ئەو ئەی یاسا (Uaiais)[٢٣] تێپەڕیو لەوێشەوە بۆ ولاتی نائیری ، وە لە (ئەیاترو)ی پاشای نائیری – کە لەو وەختەدا سەرشۆڕ بوو بۆ ئاشووریەکان – دیاری وەرگرت . لەپاشان گەڕایەوە ولاتەکەی خۆیو سەرکردایەتی گشتی هێزەکانی دەولەتی باکوور بە سەنحاریبی کوری سپارد کە ئەویش هەردەم پەلاماری ناوچە جۆراوجۆرەکانی ئورارتی دەدا ، بەتایبەتی ناوچە چیاییەکانی ئاسیای بچووك .[٢٤]

هەندێ لێکۆلەر دەلێن : «سەنحاریب لە سالی ٧٠٥-٦٨٢)پێش زایین لەگەل نائیریەکان -کە دوای مردنی سەرجۆن لە ئاشوور یاخی بوون– جەنگا .وە گەورەترین شەڕی نێوانیان کە لە تۆمارکراوەکانی ئاشووردا بە پێنجەمین شەڕی سەنحاریب دادەندرێت[٢٥] – لەنزیك چیای جودی روویداو ماوەیەك بەردەوام بوو»

لە سەردەمی ئاشور بانیپالو سردوری سێیەمی ئورارتی ، ئاشوریەکان لەگەل ئورارتیو نائیریی هاوپەیمانی ی ، ئاشت بوونەوە . وە سردوری سێیەم ، کە لە (٢٧) بیستو حەوتەمین سالەی حوکمی ئاشور بانیپال حوکمی گرتە دەست ، بۆ بەخزمەت گەیشتنی خاوەنشکۆی ئاشوور ، سەری لە نەینەوای پایتەختدا . ئاشوور بانیپال لەم بارەیەوە دەلێ : «ئەوە ، واتە سردور ، وا بەگەرمیەوە بەرەو رووم هات ، هەروەك چۆن کوڕ بەگەرمیەوە بەرەو رووی باوکی دێت ،» .

دەولەتی ئورارتی ، لە سەردەمی دوا پاشایدا (سردوری سێیەم) ، لە ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی پێش زایین‌دا ، لەپڕێکا لەناوچووو ناوی لەناو ناوان نەما . گومانیش لەوە ناکرێت ، دەولەتی میدیا ، کە لە دەوروبەری سەدەی حەوتەمی پێش زایین‌دا لە ناوچەی ئاذربیجانی رۆژهەلاتدا سەری هەلداو سنووری دەولەت ، ولاتی نائیریو ئورارتوی گرتە خۆوە ، لەگەل بابلیەکان لە سالی ٦١٢ ی پێش زایین‌دا ، دەولەتی ئاشووریان لەناوبرد .

دوای لەناوچوونی دەولەتی ئاشوور ، سنوری دەولەتی میدیا ، لە رۆژئاوادا فراوانتر بوو تا گەیشتە روباری خالس (قزە) لەناوەڕاستی ئاسیای بچووك لە دووری ٥٠ کیلۆمەتر لە ئەنقەرەدا . وە ئەم سنورە بوو بە سنوری نێوان دەولەتی میدیاو دەولەتی لیدیا ، لە رۆژئاوای ئاسیای بچووكدا .

**ئەنجام**

لە بەسەرهاتو رووداوی جەنگی خوێناوی نێوان ئاشووریەکان لەلایەكو ئورارتیو نائیریەکان لەلایەکی ترەوە دیار دەکەوێ کەوا نائیریەکان لەسەر پاراستنو مانەوەی میرنشێنەکانیان سووربوون هەروەکو ئورارتیەکان سەرشۆڕ نەبوون بۆ ئیمپراتۆریەتی ئاشووری داگیرکردنەوەی ولاتی نائیری پێش ولاتی ئورارتیەوە ، لەلایەن ئاشووریەکانەوە ، ئەوەمان

دەخاتەوە یاد کەوا نائیریەکان ، هاوپەیمانێتیی و لایەنگیری دەوڵەتی ئورارتیان کردووە ، لەبەر شوێنی جوگرافیاییەوە کە نزیك بوو لەم دەوڵەتەوە وە نائیریەکان هەر کاتێك کە ولاتیان بکەوتایە ژێر دەستی ئاشووریەکانەوە ، دەستەوەستە تەماشایان نەدەکرد ، بەڵکو هەر کە هەلێکیان بۆ بلوایە ، دەنگی رزگاربوونیان بەرز دەکردەوە . بێگومان رزگاربوونشیان هەمیشە دەبوو بەهۆی ئەوەی پایەیێکی سیاسی گرینگ‌و دەستەلات بگرنە دەست ، کە ئەمەش لە بەرژەوەندی ئورارتیەکان بوو ، کە بە پێی پیو ت ، دۆستایەتیان بیەنەوەو لە شەروشۆرەکانیاندا لەگەڵ ئاشووریەکان سوودیان لێ‌وەربگرن .

لەرووی ژیارو شارستانیەوە ، لەوانەیە زانیاری‌و شارەزایمان لەمەر شارستانێتی نائیریەوە نەبێت . بەلام هیچ گومانی تێدا نی‌یە کەوا گەلی نائیر ، بە پێی شوێنی جوگرافیای ولاتەوە لە نێوان هەردوو دەوڵەتی پێشکەوتووی ئاشووری‌و ئورارتی ، شتی زۆری لە شارستانێتی ئەم دوو دەوڵەتە وەرگرتووە .

وە تا ئێستاش بنەچەکەی نائیریەکان لە دێهات‌و تیرەکانی سەر بە ناحیەی (نیری)یان (نهری) لە ناحیەی شەمدینان ماوەو ، تاکو ئێستاش کوردەکانی ناوچەی نائیری کۆن ، ناوچەی شەمدینان ، کە سەر بە پارێزگای هەکاری‌یە لە کوردوستانی تورکیاداو شوێنی پێشەوایی کورد خوالی‌خۆشبوو شێخ عبید اللە‌ی نهری‌یە بە نەهری یان نایری ناو دەبەن .

**پەراوێزو سەرچاوەکان**

۱ – ئەمین زەکی : کورتە مێژووی کوردو کوردستان ، چاپی دوو بەغدا ۱۹٦۱ ل ٥٠ «رای سدنی سمث» .

۲ – هەروەك چۆن ئاشووری‌یەکان ، ناوی خۆیان‌و زمانەکەیان ، بە ناوی «ئاشور»ی خوداوەندی نەتەوەییانەوە کردۆتەوە ئاواش دانیشتوانانی ئورارتویان خلوی ، ناوی خۆیان‌و زمانەکەیان بە خلدی ناودەبرد ، کە لە ناوی خوداوەندی نەتەوەییانەوە (خلدیا) وەریانگرتووە ، ئاشووری‌یەکان ، خلدی‌یەکانیان بەهۆی ناوی شوێنی جوگرافیای ولاتەکەیانەوە (چیای ئارارات) بە ئورارتی‌یەکان ناودەبرد .

۳– محمود الامین : موحازەرەکانی لە مێژووی کۆنی رۆژهەڵاتدا (بۆ قوتابیانی بەشی شوێنەوار) – زانکۆی بەغدا – کۆلیجی ئەدەبیات – ساڵی ۱۹٥۷ .

٤ – ئەمین زەکی ، سەرچاوەی پێشوو ل ٥۲ – ٥۳ .

٥ – سەرچاوەی پێشوو ل ۱۰۲ – ۱۰٤ .

٦ – سەرچاوەی پێشوو ل ۷۱ .

۷ – سەرچاوەی پێشوو ل ۷۱ .

۸ – گۆڤاری «سومر» بەرگی هەشت – بەشی یەك ۱۹٥۲ وتاری (تۆبزاوەو کێلەشین) .

۹ – محمود الأمین – موحازەراتەکانی پێشوو .

۱۰ – ئەمین زەکی – سەرچاوەی پێشوو ل ۷۹ .

۱۱ – لەوانەیە ولاتی نائیر لەچەند میرنشینێك پێك هاتبێت . وە ناوی (میرانی نائیر) زۆر جار لە تۆمارکراوەکانی ئاشووردا هاتووە .

۱۲ – ئەمین زەکی – سەرچاوەی پێشوو ل ۱۰۱ (لە دائیرەی مەعاریفی ئیسلامیەوە) .

۱۳ – ئەمین زەکی – سەرچاوەی پێشوو ل ۱۰۱ .

۱٤ – گۆڤاری (سومر) – سەرچاوەی پێشوو .

۱٥ – ماسر : ئەو ناوچەیەیە ، کە ئەمرۆ بە برادۆست ناودەبرێت لە رۆژهەڵاتی رەواندوزەوەیە .

۱٦ – گۆڤاری (سومر) : سەرچاوەی پێشوو ، تەماشای Luchenbill: Ancient Records of Assyria ل ٥٦۸ – ٥۷۲ ، ٥۸٤ – ٥۸۸ بکە .

۱۷ – گۆڤاری (سومر) – سەرچاوەی پێشوو

۱۸ – سەرچاوەی پێشوو – ئەم پەیکەرەش (کێلەشین) ی ئەمرۆیە .

۱۹ – گوزانا : شوێنەکەی ئێستای (تل حلف)ە ، لە رۆژهەڵاتی سوریادا . وە ئارابخا ، شارێك بوو لە شوێنی ئێستای شاری کەرکوك لەوانەیە وشەی (عرفة) ، کە ئەمرۆ گەرەکێکە لە شاری کەرکوك ، لە وشەی ئارابخای کۆندا ، بەدەستکاری‌یەوە ، وەرگیرابێت .

۲۰ – ئەمین زەکی : سەرچاوەی پێشوو ل ۱۰۲ .

۲۱ – تۆبزاوە ، ئەکەوێتە ناوچەی سیدەکان ، لە پارێزگای هەولێردا .

۲۲ – تەماشای گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ، ژمارە ۸۱ ی ئابی ۱۹۸۰ ، ل ٤۹ «وتاری مەنائیەکان» بکە .

۲۳ – شوێنەکەی «باش قلعة»ی ئێستایە .

۲٤ – گۆڤاری (سومر) ، سەرچاوەی پێشوو ، وتاری «تۆبزاوەو کێلکەشین» .

۲٥ – ئەمین زەکی : سەرچاوەی پێشوو ل ۱۰۲ .

## گەشتی کتێبێك :

# لەگەڵ دۆن جوان دا

• لێهاتوویەکی وەك دۆن جوان لەناو ئەدەبی جیهانا بەدەگمەن بەدی ئەکرێت ، دۆن جوان ئەو رووە پرشنگدارە گەشاوەیەیە کە خەڵقی بۆ خۆشەویستی ژیان هاندە دات ، ئەو خۆشەویستی‌یە کە هەمیشە تینووەو بە هیچ تێر نابێ ، دۆن جوان نیشانەی گەمەکردنێکی فیکری‌یەو دژی ئەو جدیەت‌و دڵ راوگەیەیە کە لە کەسایەتیەکەی (ەوست) دا دیارە .

• مەسەلەی گەڕان بەدوی بنچینەی ئەفسانەی دۆن جوان یەکێکە لەو باسانەی کە لە پەنجا ساڵی دوایی‌دا پسپۆڕو زاناکان گفتوگۆیەکی زۆریان لەسەر کردوە . هەندێك دەڵێن ئەو ئەفسانەیە لە ولاتی (پورتوغاڵ) پەیدابووەو هەندێکی تریش دەڵێن لە ئیتالیاو ئەڵمانیا درۆست بووە ، جگە لەمانەش لای هەندێ کەس وایە دۆن جوان مەسەلەییکی مێژوویی‌یە لە کاتێکدا کۆمەڵێکی تر لەو پسپۆڕانە لایان وایە ئەم کابرایە شتێکی خەیاڵی‌یەو مەسەلەی پەیدابوونی بۆ سەردەمە ناوەراستە سووفی یەکە یان بۆ سەردەمی راپەڕینەکە دەگەڕێتەوە ، بەلام ئەمڕۆکە بەگشتی لەسەر ئەوە یەکیان‌گرتووە کە دۆن

محمد بدری وەری گێڕاوە

جوان بەشێکە لە فولکلۆری ئۆروپاو لایان وایە ئەفسانەکە لە ئیسپانیاوە زۆر نزیکەو ئەوەی ئەم بیروڕایە ئەسەلمێنێ زۆربەی هونراوە میللیەکانن کە ئەم شتە بە ئاشکرا باس ئەکەنو ژیانی دۆن جوان تازەئەکەنەوە . .

• یەکەم ئیشی هونەری کە وای کرد ئەم ئەفسانەیە بە شێوەیەکی هونەرمەندانە دەرکەوێت کۆمیدیایەك بوو سێ ڕۆژ ئەخایێنێو بە شیعر نووسراوە بە ناوی (جوانی ئیشبیلیەو میوانێکی لە بەرد) ەو یەکێك نووسیویەتی بەناوی (تیرسو دی مولینا) کە لە سالأنی ١٥٨٤ - ١٦٤٨ دا ژیاوە . کۆمیدیاکە دەڵێت : (دۆن جوان تینوریو) شەو بە دزیەوە خۆی کردە کۆشکی پاشای (ناپۆلی) و (ئیزابیلا)ی هەڵخەڵەتاند چونکە دۆن جوان کەل‌ویەلی دەستگیرانەکەی (ئیزابیلا)ی لەبەرکردبوو ، دەستگیرانەکە ناوی (ئۆکتافیو) بوو . . مامەی دۆن جوان کە سەفیر بوو لەباتی ئەوەی بیگرێو بیخاتە زندان رێکرەی ڕاگردنی بۆ خۆش کردو بەم جۆرە دۆن جوان ڕێ دەریای بۆ ئیسپانیا گرتەبەر . . کوت‌وپڕ ئەبێتە باو



گەردەلوول‌و پاپۆر نوقوم ئەبێ . دۆن جوان‌و نۆکەرەکەی رزگاریان دەبێ . کچێکی ماسی‌گر بەناوی (تیزیە) کە چاوی پی‌یان ئەکەوێ بەزەیی پی‌یان دێت بۆیە ئەیانبات بۆ ساباتەکەی خۆی . . (کاتالینون)ی نۆکەری دۆن جوان هەوڵێکی یەکجار زۆر ئەدات وا لە دۆن جوان بکات بیر لە خوا بکاتەوە بەڵام هەوڵەکانی بەگشتی بە فیرۆ ئەچن‌و دۆن جوانیش هەر خەریکی ئەوەیە ئافرەتە ماسی گرەکە هەڵخەڵەتێنێ‌و پەیمانی ئەوەی پێ بدات کە لە دوایی‌دا ئەیخوازێ . . دۆن جوان بۆ ئیشبیلیە رائەکات‌و

دەنگوباسی جانبازی‌یەکەی لەگەڵ ژنە (دۆقە) دا لە ئیتالیا ئاشکراو بلاودەبێتەوە . ئەبێ ئەوە بزانین کە پاشا لە کاتی خۆیدا بریاری دابوو (دۆنا ئانا) ی کچی (ئۆلووا) کە یەکەم سوارەی (کالاترافانا) بوو بۆ دۆن جوان بهێنێ . پاشا بۆ پاراستنی شەرەفی (ئیزابیلا) فەرمانی شووکردنی بە (دۆن جوان) ئەدات‌و بۆ ئەوەی (دۆن ئوکتافیو) هەست بە هیچ زیانێکی نەکات پاشا بریارئەدا (دۆنا ئانا)ی پێ بدرێت . دۆن جوان بە دزی‌یەوە خۆی ئەگەیێنێتە ماڵی سوارەکەو دۆنا ئانا هەر کە چاوی پێ دەکەوێت هاواردەکات . .

، دۆن جوان بۆ حەسانەوە لە گۆندێکا لائەدات . لەوێ تووشی شاییەك دەبێ دانشتوانی گۆندەکە دایانمەزراندوە بۆ دوو جووتیار (باتریشوو ئامینتا) ، بووکەکە زۆر قەشەنگ‌و جوان دەبێ . دۆن جوان هەر کە چاوی پێ دەکەوێ حەزی لێ دەکات‌و هەوڵ‌ئەدا زاواکە دوورخاتەوەو باوکی کچەکە بە پارەیەکی زۆر ئەخەڵەتێنێ‌و ئاسمان لەسەر پەیمانەکەء ئەکا بە شاهید . بەڵام مێردەکە خێرا مافەکەی خۆی ئەسێنێتەوەو دۆن جوان لەگەڵ نۆکەرەکەی بە جوونە بو ئیشبیلیە ئەگەرینەوەو لەوێ‌و لەیەکی‌لە کلێسەکانا

چاوی بە پەیکەرێکی بەرد ئەکەوێت کە لە
کاتی خوێدا بۆ یادی سوارەی (ئولووا)ی
باوکی (دۆنا ئانا) دروست کراوە ، گاڵتە بە
پەیکەرەکە دەکاو دەعوەتی نان خواردنی
ئەکا . پەیکەرەکە بۆ دیتنی دۆن جوان لە
کاتی دیاری‌کراودا ئەچی‌و داوای لێ دەکا
ئامادەی دەعوەتەکەی لە رۆژی دووەمدا
بێ ، دۆن جوان پەیمانی خۆی
جێ‌بەجێ‌ئەکاو لەگەڵ نۆکەرەکەی بۆ
کڵێسەکە ئەچێ ، دۆن جوان پاش ئەوەی
ئازایەتی خۆی ئەنوێنێ ئەیەوێ بروات ،
بەڵام پەیکەرەکە دەستی ئەگرێ‌و
فرێ‌ئەداتە دۆزەخ بەبێ ئەوەی مۆڵەتی
بدات دان بە هەڵەکانی خۆی بنێت‌و ئەو
شتە نهێنی‌یانە ئاشکرا بکات ، بۆیە
(کاتالینون) کە نۆکەری دۆن جوان ئەبێ
ناچارئەبێ بۆ لای پاشا بگەرێتەوە و
ئاگاداری خۆی‌و نیچیرەکانی دۆن جوان بەو
سزایە بکات کە تووشی بوو . . ئەم
کۆمیدیایە ئەکرێتە دو بەشەوە ، هەر
یەکێکیان شێوەو رێبازی تایبەتی خۆی هەیە
بێ ئەوەی ببێتە هۆی توانەوەی ئەوەی تر :
لایەنی ریالزمی‌و لایەنی خەیاڵ‌و رەمز .
خێرایی رووداوەکان‌و هەڵویستە
لاسایی‌یەکان پەردەی سواری‌یان بەسەر
کۆمیدیاکە داوە . بەڵام بەشە
کۆتایی‌یەکەی کوت‌وپر ئەمانباتە سەر
شانووگەریە نهێنی‌یەکان ئەو شانووگەریانە
کە لە سەردەمی ناوەراستا ناسراوبوون . .
ئیستاکەش با بۆ ماوەیەك بەلای
کەسایەتیەکەی (دۆن جوان تیرسو دی
مولینا) لابدەین . . دۆن جوان تینوریو لە
سەدەی حەڤدەهەمی ئیسپانی‌دا ژیاوە . ئەو
سەدەیە کە لەژێر تەئسیری سەردەمی
راپەرینەکەدا بوو . . گەنجێکی ئەندەلوسی
زۆر جوان‌و هەتا بڵێی شەهوانی بوو و
ئەتوانین بڵێین نموونەیەکی راستەقینەی

می‌بازی بوو و چاکترینە وێنە بۆ دۆن جوان
ئەو وێنەیەیە کە باوکی بۆی کێشاویەتی کە
دەڵێ : دۆن جوان گەنجێکی سەرکەش‌و
ئازاو جوان‌و پر هەست تا رادەیەك خەڵقی
لەبەر ئەو شتانە پێ‌یان دەگوت (هیکتۆری
ئیشبیلیە) . . ئەوەی ئەوە ئەسەلمێنێ ئەو
کچە ماسی‌گرە قەشەنگەیە کە لەلای خۆی
حەواندیەوە ، دۆن جوان نموونەی
پیاوێکە بۆ ئەوە دروست کراوە ئافرەت
حەزی لێ بکات‌و هەتا جم‌وجۆڵەکانی لە
ووشەکانی کەمتر نەبوون ، بۆیە ئەو کچە
ماسی‌گرە پێی دەوت : تۆ لە بێدەنگیتا زۆر
شت ئەڵێی . مەبەستیش لەوە چاوەکانی
بوو . سەرەرای ئەمانەش بەگشتی دۆن
جوان گەنجێکی خۆ بە زل‌زان‌و درۆزن‌و بێ
حەیاو بێ وەعدو پەیمان بوو . لە لایەکی
تریشەوە شانازی بەوە ئەکرد کە ئەندامی
یەکێك لەو خێزانانەیە ئیشبیلیایان داگیر
کردووەو هەمیشە شانازی بەو شەرەفە
ئەکردو ئەم کردەوەیەش لەگەڵ ئەو
رەویشتە ئەگونجا کە لە ئیسپانیا لەو
سەردەمەدا باو بوو . . بەڵام دۆن جوان لە
بەردەم خۆشەویستی لەشدا خۆی بۆ
نەئەگیراو گوێ بە نەنگی‌و عارو خەجاڵەتی
نەئەدا . . دۆن جوان زوو لە پەیمانی خۆی
ئەگەرایەوەو کە چاوی بە ئافرەتێك بکەوتبا
دوور نەبوو خیانەت بکا . . لە نێوان
دژایەتی ئەم شانازی بە شەرەف کردن‌و
تاوان کردنەدا مەسەلەی رەویشتی دۆن
جوان‌و شتە فراوانە مرۆڤایەتیەکەی
وەدەردەکەوێ . چونکە هەر شتێك
پێوەندیەکی بە ئارەزووەکانی هەبێت رەنگە
وای لێ بکات واز لە گشت بیروباوەرێك
بهێنێ‌و وەکو گەنجێکی جادوگەری لێ بێت
کە لای ئاسانە ناوبانگی هەر ئافرەتێك روو
بەرووی شکاندن‌و خەتەر بکات و لە
هەمان کاتدا شانازی بەو کردەوەیە بکات‌و

ئەم سیفەتەش دوورترین شتە بۆ دۆن جوان
لەم سەردەمە تازەدا ئەو زەلامە کە هەمیشە
بەوە ناسراوە بەختێکی باڵاو بەرزی نە
خۆشەویستی‌دا هەیە . بێ گومان دانەر
ئەوەی لەبیر نەکردووە کە قارەمانی
کۆمیدیاکەی گەنجێکە توانایەکی یەکجار
بەهێزی لە هەڵخەڵەتاندنی ئافرەتدا هەبەو
جگە لەمەش دانەر وای پیشان داوە کە
ئەم قارەمانە هەر چەندە ئەم جۆرە
کردنەوانەئەکات توانوویەتی وا لەو ئافرەتە
بەسەرمانانە بکات هەست بەوە بکەن کە
دۆن جوان خۆشیان ئەوەی‌و ئامادەیە نە
پێناویانا بمرێت ، بۆیە کچە ماسی گرەکەو
کچە جووتیارەکە هەرچەندە لە سزای
ئاسمان ئەترسێن بەڵام بە بێ‌باکی خۆیانینی
پێشکەش ئەکەن .

• لە کۆمیدیای (دی مۆلینا) ئەم فێڵە
مانای لێ‌قەومان‌و خەفەت ئەبەخشێت
ئەویش بریتی‌یە لە هەست‌کردن بە
چەوسانەوەی کۆمەڵایەتی‌و ئەم وشانەی
(ئامنتا) ئەو مانایە ئاشکرادەکات :
(بەگایەتی لە ئیسپانیا بووەتە سواری) . .
دۆن جوان لێرەدا سۆزو بەزەیی نە
ئافرەت نایەوێ تەنیا بۆ تێرکردنی
ئارەزووەکانی ئەگەرێ . ئەو ئارەزووانە کە لە
رۆژ بەدوای رۆژ تازەئەبنەوەو لە دو ووشەدا
کۆدەبنەوە (هەڵخەڵەتاندن‌و شووردنی) . .
بۆ ئەوەی لە بنچینەی کەسایەتیەکەی دۆن
جوان بگەین ئەبێ ئەوە لەبیر نەکەینەوە کە
ئەم زەلامە لەو سەردەمە ژیاوە کە ولاتی
ئیسپانیا لەژێر سێبەری رژێمێك ئەژیا
بایەخێکی زۆر بە مەسەلەی رەویشت
ئەدا . ئەو رەویشتە ببوو بە پەردەیەك بۆ
داپۆشینی خراپەکاری‌یە شێتانەکان . دانەر
ئەیەوێ ئەفسانەی دۆن جوانی لەش
پەرست بکاتە نیشانەی سەردەمێکی
بەگشتی . ئەو سەردەمە کە لەنێوان ئیمان‌و

ونبوونا نوقم‌بووو له سزاش ئه‌ترسا ، جگه له‌مه‌ش له شانووگه‌ری (تیرسو دی مولینا)ش بیروړایه‌کی ئایینی به‌هێز هه‌یه‌و وای له خه‌ڵقه‌که کردووه بڵێن : دۆن جوان مه‌سه‌له‌یه‌کی ئینسانی نی‌یه به‌ڵکو مه‌سه‌له‌یه‌کی کاثولیکی‌یه . .

خۆشه‌ویستی‌یه شه‌یتانیه‌که‌ی دۆن جوان بۆ خراپه‌کاری‌و به‌رهه‌ڵسته شێتانی‌یه‌که‌ی دژ به مردن نیشانه‌ی ئازایه‌تی‌یه‌کی به تاوانن روو به‌رووی بیروباوه‌ر بێ سنووره‌که‌ی دژ به‌زه‌یی خواوه‌ند . . دۆن جوان له‌و باوه‌ره‌دایه ته‌وبه‌کردن توانای سرینه‌وه‌ی گوناهی ژیانێکی ته‌واوی هه‌یه . خراپه‌کاریه‌که‌ی دۆن جوان له‌وه‌دایه باوه‌رێکی زۆری به‌و بناغه ئه‌خلاقیانه هه‌یه که هه‌ر خۆی ئه‌یانړوخێنێ ، به‌ڵام گه‌وره‌یه‌که‌ی له‌وه‌دایه بێ ئیمان نی‌یه‌و بروای به خواو به شه‌یتان هه‌یه وه‌ك خۆی ده‌ڵێ‌و ئه‌و توانایه له‌و کاته‌دا ئه‌گاته لوتکه که تووشی سووتان‌و مردن ده‌بێ . . ئه‌م دراما ئایینی‌یه به‌م شێوه‌یه کۆتایی پێ دێت‌و وا له‌و که‌سه بکات که گاڵته‌ی به ئافره‌ت ده‌کرد بگاته راده‌یه‌ك به خواوه‌ند پێبکه‌نێ . . دۆن جوان ئیسپانیای به‌جێ‌هێشت‌و رووی‌کرده ئیتالیاو له‌پاشان گه‌یشته فه‌ره‌نساو له‌م ولاته توانی خۆی بگه‌یێنێته یه‌کێك له نووسه‌ره هه‌ره‌گه‌وره‌کانی ئه‌م ولاته‌و وای لێ بکات یه‌کێك له شانووگه‌ری‌یه به‌ناوبانگه‌کان ده‌رباره‌ی ئه‌م مه‌سه‌له‌یه بنووسێت ، مه‌به‌ستیش لێره‌دا (مۆلیر) ه که له ساڵی ١٦٦٥ دا کۆمیدیایه‌ك به‌ناوی (دۆن جوان یان میوانێکی له به‌رد) بنووسێت‌و هه‌رچه‌نده بیروړایه‌کی زۆر ده‌رباره‌ی ئه‌م کۆمیدیایه هه‌یه به‌ڵام ئه‌وه‌ی رێکیان ده‌خاته‌وه ئه‌وه‌یه توانیویانه به‌گشتی بۆ دووزینه‌وه‌ی ده‌روونی قاره‌مانه‌که یارمه‌تی‌مان بده‌ن‌و ئه‌و راستیه‌مان پێ بسه‌لمێنن که له کاتی مردنی‌دا ده‌رده‌که‌وێ . . (مۆلیر) به‌شی هه‌ره‌زۆری رووداوه‌کانی شانووگه‌ریه‌که‌ی له (تیرسو دی مولینا)ی وه‌رگرتووه به‌ڵام مۆرێکی تازه‌ی پێوه ناوه‌و شتی زۆری بۆ زیادکردووه‌و هه‌ندێکیشی لێ لابردوه بۆیه ناچار ئه‌بین رووداوه‌کانی شانووگه‌ریه‌که‌ی بخه‌ینه روو بۆ ئه‌وه‌ی بتوانین ده‌رباره‌ی قاره‌مانه‌که‌ی که دۆن جوانه بدوێین . دۆن جوان به دوی جانبازی‌یه‌کی تازه ده‌ستی به گه‌ران کرد ، بۆیه وازی له ژنه‌که‌ی هێنا ، ئه‌و ژنه که له کلێسه‌دا رفاندی . . که ژنه‌که به‌دوی ئه‌که‌وی دۆن جوان پی‌ړائه‌گه‌یێنی که له‌م ژن‌هێنانه په‌شیمانه ، ژنه ئه‌گه‌رێته‌وه‌و له خوا ئه‌پارێته‌وه بۆ ئازاردانی ، ئه‌وه‌ته بۆ جارێکی تر هه‌وڵ‌ئه‌دا ئافره‌تێکی تر له ده‌ستگیرانه‌که‌ی برفێنێ له کاتێکدا که هه‌ردوکیان به جووته ئه‌یانه‌وێ سواری پاپۆرێك ببن . . دۆن جوان‌و (سجاناریل)ی نۆکه‌ری له پاپۆره‌که‌دا خه‌ریکی نوقوم‌بوون ئه‌بن به‌ڵام دوان له جووتیاره‌کان فریایان ئه‌که‌ون‌و رزگاریان ئه‌که‌ن‌و هه‌ر چه‌نده یه‌کێك له رزگارکه‌ره‌کانی ده‌ستگیرانی کچه‌که ده‌بێ‌و لۆمه‌یه‌کی زۆری ده‌کات به‌ڵام دۆن جوان واز له خراپه‌کاری خۆی ناهێنێ‌و له‌سه‌ر ره‌وپشتی خۆی به‌رده‌وام ده‌بێ‌و خۆی له کچه‌که نزیك‌ئه‌کاته‌وه به‌نیازی هه‌ڵخه‌له‌تاندنی‌و له هه‌مان کاتیشا په‌یمانی به کچێکی لاده‌یی داوه که بیخوازێ ، بۆیه کچه‌کان دێنه شه‌رکردن‌و دۆن جوان ئاشتیانی ئه‌کات‌و به‌بێ ئه‌وه‌ی که‌س هه‌ستی پێ بکات خۆی حه‌شارئه‌داته‌وه‌و رائه‌کات‌و خۆی‌و نۆکه‌ره‌که‌ی ئه‌گه‌نه دارستانێك‌و چاویان به سواڵکه‌رێك ئه‌که‌وێ‌و (سجاناریل) له‌وه سه‌رنا که‌وێ قه‌ناعه‌ت به دۆن جوان بکات له کرده‌وه پیسه‌کانی وازبهێنێت چونکه له‌وێشدا هه‌ر خه‌ریکی ئه‌وه ئه‌بێت هه‌ندێ پاره به کابرای سواڵکه‌ر بدات تاکفریك بکا به‌رامبه‌ر به‌وه‌ی جوێنێك به ئاین بدات ، به‌ڵام سواڵکه‌ره‌که ئه‌وه قوبوول ناکات‌و دۆن جوانیش پاره‌که‌ی له رێی مرۆڤایه‌تی‌دا پێ‌ئه‌به‌خشێ‌و واش رێئه‌که‌وێ گه‌نجێك له چنگی کۆمه‌ڵێکی جه‌رده رزگاربکات‌و ئه‌وه روون‌ئه‌بێته‌وه گه‌نجه‌که برای (الفیر) بێت‌و بۆ تۆڵه‌سه‌ندن به‌دوی دۆن جوانا ئه‌گه‌رێت‌و هه‌ر له‌وێ‌دا دان به‌وه ئه‌نێ‌و سوپاسێکی زۆری ئه‌کات‌و واز له مه‌سه‌له‌ی تۆڵه‌سه‌ندن ئه‌هێنێ . پاشان (سجاناریل)ی له‌گه‌ڵ خۆی ده‌بات‌و ئه‌چن بۆ سه‌ردانی کوری سواره‌یه‌ك که به شێوه‌ی په‌یکه‌رێك دروست‌کراوه‌و له‌وێدا دۆن جوان داوا له نۆکه‌ره‌که‌ی ده‌کات په‌یکه‌ره‌که بۆ نان‌خواردن ده‌عوه‌ت بکات . . رووداوه‌کان یه‌ك به‌دوای یه‌ك دێن‌و ده‌چن‌و له ماڵا دۆن جوان چاوی به (مسیودیمانش)ی خاوه‌ن قه‌رز ئه‌که‌وێ‌و گاڵته‌یه‌کی زۆری پێ ده‌کات‌و به‌بێ ئه‌وه‌ی پاره‌یه‌کی پێ بدات ده‌ری‌ده‌کات . (دۆن لۆی) زۆر لۆمه‌ی کوره‌که‌ی ده‌کات به‌ڵام کوره به کۆرتی ولامی باوکه ئه‌داته‌وه‌و گاڵته‌ی پێ ده‌کات‌و ئه‌میش به‌سزای ئاسمان ئه‌یترسێنێ . . (الفیر) دێت‌و له مێرده‌که‌ی داوائه‌کات خۆی له سزای ئاسمان دوورخاته‌وه به‌ڵام پیاوه‌که هیچ خۆی تێکنادات‌و به چاوێکی پر لۆمه‌و گله‌یی‌یه‌وه ته‌ماشای ژنه‌که‌ی ده‌کات‌و زۆریش لای سه‌یر ده‌بێ چۆن ئازار ئه‌م ژنه‌ی گۆری . . ئه‌وه خواردنه‌که ئاماده‌کراوه‌و ئه‌وه‌ش په‌یکه‌ره‌که‌یه دێته ژووری‌و داده‌نیشێ‌و داوا له دۆن جوان ئه‌کات بۆ ده‌عوه‌ته‌که‌ی له رۆژی دوایی‌دا

ئامادەبێت . . دۆن جوان لە حوزوری باوکی‌دا پەشیمانی خۆی پیشان ئەدات و بڕیاری تەوبەکردنی ئاشکرا دەکات‌و بۆیان روون‌ئەکاتەوە کە ئەم ئاخیر جارە پەنا بۆ فێڵ‌و ریاکردن بیات . . پەیکەرەکە وردە وردە دێتە پێشەوەو پێشوازی لە میوانەکەی دەکات‌و دەستی دۆن جوان ئەگرێت‌و خەبەری ناچاریی خۆی پێ دەڵێ . . پاشان ئەرز ئەقڵێشێتەوەو دۆن جوان نوقوم‌ئەکاو (سجاناریل)ی نوکەری بە تەنیایی لەسەر شانووەکە ئەوەستێت‌و داوای پارەکەی خۆی دەکات ، ئەو پارەیە کە هەتا ئێستاکە وەری نەگرتووە .

پێش‌ئەوەی چاومان بە دۆن جوان بکەوێت (سجاناریل) وێنەیەکمان بۆ ئەکێشێت‌و هەندی لایەنی سامناکیان دەربارەی دۆن جوان بۆ روون ئەکات ، بەلأم شێوەی قسەکردون پێکەنین‌و گاڵتەکردنی وامان لێ‌دەکات سکالاو هەرەشەکانی وەك شتێکی راستەقینە بێتە بەرچاومان و وردە وردە بۆمان ئاشکرا دەبێتەوە ئەو وێنەیە وێنەیەکی راستەقینەیە . کە دۆن جوان دێت گەنجێکی جوان‌و قەشەنگ‌و قسەخۆش ئەبینین ، راستگۆیە لە هەست دەبڕینە بەرامبەر ئەو لەزەتە کە لە کاتی گەران بەدوی خۆشەویستی‌دا هەستی پێ دەکاو راستگۆشە لە دەربڕینی ئەو پەشیمانی‌یە کە پاش تێربوونی ئارەزووەکانی دایئەگرێ . . دۆن جوان بە چاوێکی سووکەوە بۆ ئاین ئەروانێ‌و بەتایبەتی لەو کاتەدا کە ئەچێتە کڵێسەیەك‌و کچێك ئەرفێنێ . . جگە لەمەش مەسەلەی ژن‌هێنان لای دۆن جوان پێوەندیەکی پاك‌و خاوێن نابێت‌و هەمیشە حیساباتی خۆی لەگەڵ ئاسمانا پاش‌گوێ ئەخات . . بەکورتی دۆن جوان هەتا ئەم کاتە رێی خۆی ون‌کردووەو ئەتوانرێ بخرێتە سەر رێگەی راستی‌و تەوبەکردن ، لە بەشی دووەم دا لەزەت‌و تام‌و چێشتنی ژیان لای دۆن جوان بریتی‌یە لە نەوعە زیرەکی‌یەك توانای زاڵ‌بوون بەسەر کۆسپ‌و تەگەرەدا پێ ئەبەخشێ هەرچەندە ئەو ژیانە پڕ مەینەت‌و کۆسپ بێ لەزەتی زیاترە . . دۆن جوان بۆ ئەوکاتە دەژی کە ئێستاکە تێدایەتی‌و باوەری بە هێزو توانای خۆی هەیە بۆ زاڵ‌بوون بەسەر هەر تەنگ‌وچەڵەمەیەك بەهۆی کردەوەکانی تووشی ببێ . دۆن جوان بۆ خۆی جیهانێکی خەیاڵی وەها دروست کردبوو کە هەمیشە یاسای ووشە تێدا سەرکەوتوو بوو ، بۆیە لای وابوو هەرچی بکاو بڵێ بەرپرسیار نی‌یەو کردەوەش لەلای مانای داگیرکردن‌و راکردن ئەبەخشی‌و لە دونیایەکی پڕ لە جموجۆڵ ئەژیاو وەستانی بە مردن‌و نەمان ئەزانی . دۆن جوان بڕوای بە شتی نەمرو بەردەوام نەئەکرد . . وشە ئەفەوتێت‌و ئەروات‌و تەنیا وشەی سەر زار باشترین رێگەیە بۆ کردەوەکانی . . وشە هیچ شتێك لێ بەجێ نامێنێت‌و ئەگەر بۆ دەقەیەك بڕوای بەوە بکردبا کە وتنی وشە مانای ناچاری ئەدات ئەبوایا دونیاکەی بەگشتی بڕۆخابا .

کە (سجاناریل) هەندێ پرسیاری جەوهەریی لێ دەکرد وەك : ئایا بڕوای بە خوا هەیە ؟ ئایا لە دۆزەخ ئەترسێ ؟ دۆن جوان ئەیوت : جاری کاتی ئەوە نی‌یە ئەم جۆرە شتانە باس بکرێن‌و بەشێوەی کاڵتەو بێ‌باکیەوە وڵامەکانی ئەدایەوەو هەڵوێستی راستەقینەکەی دەرنەئەخست‌و هەتا کە ئەیوت دو لەگەڵ دو ئەکاتە چوار . یان چوار لەگەڵ چوار ئەکاتە هەشت ئەوەی دەرنەئەخست کە نایەوێ بەشێوەیەکی راست دەربارەی کۆسپەکانی مرۆڤ لەگەڵ کابرایەکی نەزان وەك نوکەرەکەی بدوێ‌و ئەو گفتوگۆیەی کە لەنیوان دۆن جوان‌و سواڵکەرەکە ئەکرێ جێگەی گومان‌و سەیرە ، چونکە ئەمە یەکەم پەردەیە پرسیاری ئەوەمان بێنێتە بەرچاو و بڵێن : ئایا هەڵوێستەکانی دۆن جوان حاڵەتی بێ‌دەسەلأتی‌و بێ‌توانایی لە بەزچاوی کۆمەڵ ئەبەخشن یان نەء ؟ . . لە هەمان کاتیشدا پەردەیەکە ناچارمان ئەکات دان بەوە بنێین کە دۆن جوان چاکەیەکی وەها هەیە پێویست بە گفتوگۆ ناکات ، چونکە جاری هێرشێکی توندو تیژ ئەباتە سەر شێوەی بیرکردنی سواڵکەرەکەو لە لایەکی تریشەوە وەك سوارەیەك ئەجوڵێتەوەو بەتایبەتی کە ئەچێت بۆ یارمەتی‌دانی کەسانی‌کە نایان‌ناسێ . . بەم جۆرە بۆمان دەرئەکەوێ کەسایەتی‌یەکەی زۆر ئاڵۆز ترە لەوەی ئێمە هەستی پێ‌دەکەین و هەر لەو کاتەدا کە روو بەرووی (کارلوس)ی برای ژنەکەی ئەبێ ئەوە ئەسەلمێنێ موستەحەقی ئەو کۆمەڵەیە کە تێدا ژیاوە . . ئەتوانین بڵێن چینە کۆمەلأیەتیەکەی خۆی بەرپرسیارە بەرامبەر ئەم خراپەکاریە بەگشتی‌و دۆن جوانیش وەك مرۆڤێکی بێ تاوان دێتە بەرچاو . بەلأم لێرەدا خۆی دەرئەخاو لاوازیە بێ دەرمانەکەی‌و ناوەرۆکە بنچینە یەکەی روون‌دەبێتەوە . دۆن جوان مرۆڤێکی فێڵ‌بازەو ساختەچی‌یە هەتا لەگەڵ هاوڕێکانیشی . لە دەروونەوە حیلەت‌بازە . بەلأم گریی شەرەف بۆ دواجار ئەنەقێتەوە ساتێ کە رووبەرووی (ئالۆنس) برای دووەمی ژنەکەی ئەوەستێت‌و ئەیەوێ زۆرانبازیی لەگەڵدا بکات . (مۆلێر) (دۆن جوان) بە تەنیا ئەهێڵێتەوە بەتایبەتی لەو کاتەدا کە تووشی چارەنووس دەبێ‌و لەو کاتەشا کە لەگەڵ هەردو براکە ئەکەوێتە قسەکردن . (دۆن کارلوس) کە بەهۆی دۆن جوانەوە

رزگاری‌ببووو (دۆن ئالۆنس) که ئه‌یه‌وێ تۆڵه‌ی خۆی لێ بستێنێ ، ئه‌بینین دژ به خوا ئه‌وه‌ستێت‌و دژایه‌تی به‌رامبه‌ر به په‌یکه‌ره‌که مانای سه‌رلێشێواوی ئه‌به‌خشێت . قاره‌مانه‌که که هه‌ستی به‌وه کرد مردنی نزیك‌بوه‌ته‌وه بیری له‌وه نه‌کرده‌وه ئایا ده‌رباره‌ی ئه‌م مه‌سه‌لانه ئه‌ڵێ چی : ئایا بروای به مه‌سه‌له‌ی نه‌مری هه‌یه یان نه‌ء ؟ به‌ڵام به وه‌ستانه‌که‌ی دژ به په‌یکه‌ره‌که ئه‌وه‌ی ده‌رخست که ولامی نه‌ء بێت‌و له‌وه‌دا ئازایه‌تیه‌که‌ی روون‌ده‌بێته‌وه ، که په‌یکه‌ره‌که سه‌ری بۆ ئه‌نوێنێ ئیتر ناچارده‌بێ چاوێك به هه‌موو شته‌کان به‌گشتی بخشێنێ ، بۆیه بۆ یه‌که‌م جار دۆن جوان تووشی گومان ده‌بێ .

له به‌شی چواره‌ما دۆن جوان پاش ماوه‌یه‌کی دوورو درێژ له خه‌ڵق خه‌ڵه‌تاندن خۆی ئه‌خڵه‌تێنێ‌و ئێستا که ئه‌بینین چۆن هه‌وڵ‌ئه‌دا بۆ ده‌ربازبوونی له ئه‌نجامه کۆمه‌لایه‌تیه‌کانی کرده‌وه‌کانی هه‌موو شتێك به‌کاربهێنێ‌و چۆن له‌و گۆمانه میتافیزیقیه‌ی که دایگرتووه رائه‌کات . . که چاوی به باوکی ئه‌که‌وێت به گشت جموجۆڵه ناشیرینه‌کانی رووبه‌رووی ئازار ده‌بێ‌و که تووشی په‌یکه‌ری سواره‌که ده‌بێ هه‌وڵی ئینکارکردنی به‌رکه‌وتنه‌که‌ی ناداو که به‌شه دوایی‌یه‌که ده‌ست پێ ده‌کات دۆن جوان له‌ترسانا په‌نا ئه‌باته به‌ر راکردن که چه‌کی ده‌ستی ترسنۆکه‌کانه‌و ئه‌وه‌ی چاکه بێت له قولایی ده‌روونیا ئه‌فه‌وتێت‌و نامێنێ دۆن جوان له‌و کاته‌دا کۆتایی پێ‌دێت که به ناچاری رووبه‌رووی حه‌قیقه‌ت ده‌بێ . . بۆیه کرده‌وه چاکه‌کانی وه‌ك ریاو درۆ وابوون . له‌و کاته‌شا که خه‌ریکی ئه‌وه‌بن تاوانباری بکه‌ین بۆمان دێته پێشه‌وه‌و ئینکاری ذاتی خۆی ده‌کاو ئه‌مرێ وه‌ك مردنه‌که‌ی (جالیلو) له شانۆگه‌ریه‌که‌ی (بریخت) دا . . هه‌ندێ که‌س مۆری شه‌یتانیان له‌سه‌ر ده‌روونی دۆن جوان دائه‌نێن‌و هه‌ندیکی تریش نیشانه‌ی بڵندیه‌کی له‌م ده‌روونه پیسه‌دا به‌دی ئه‌که‌ن . به‌م جۆره (مۆلێر) پرسیاره‌که‌ی هێشته‌وه‌و بۆیه‌ش‌و له‌به‌ر تیشکی ئه‌م ناکۆکی‌یه دۆن جوانی مۆلێر وه‌ك مرۆڤێکی زندوو له ده‌روونمانا ئه‌مێنێته‌وه . شاعیری ولاتی ئینگلستان (بایرۆن) که داستانی دۆن جوانی نووسی‌و له سالانی ۱۸۱۹ – ۱۸٤٤ دا بلاوی کرده‌وه که‌سایه‌تی قاره‌مانه‌که‌ی به شێوه‌یه‌کی گاڵته‌جاری شی‌کرده‌وه ، داستانه‌که بریتی‌یه له (١٦) سروود به‌شێوه‌ی (بورلیسك) که وه‌ك نموونه ئیتالیه‌کانه . . دۆن جوانی بالیرۆن گه‌نجێکی ره‌سه‌نه‌و خه‌ڵقی شاری (ئیشبیلیه)یه‌و له ته‌مه‌نی شانزه ساڵی‌دایه ، دایکی له‌به‌ر جامبازی‌یه‌کی عیشق بۆ ده‌ره‌وه ئه‌نێرێ ، به‌لام پاپۆره‌که تووشی نوقوم بوون ئه‌بێ‌و ئه‌میش له مردن رزگاری ده‌بێ ، پاش چێشتنی ئازارێکی یه‌کجار زۆر دۆن جوان ئه‌گاته دوورگه‌یه‌کی یونانی‌و (هایدی) که کچی (لامبوو)ی رێگره رزگاری‌ئه‌کات‌و وه‌ك ئه‌ڵێن (لامبو) زه‌لامێکی مردوو ئه‌بێ‌و کوت‌وپڕ زندوو ئه‌بێته‌وه‌و بۆ شار ده‌گه‌رێته‌وه‌و رووبه‌رووی هه‌ردو دڵداره‌که ده‌بێ‌و ده‌ست به لێدانی دۆن جوان ئه‌کات‌و له‌پاشان هه‌ردو ده‌ستی ئه‌به‌ستێ‌و ئه‌یخاته ناو پاپۆرێك‌و ره‌وانه‌ی شارانی ئه‌کات . . (هایدی) شێت ده‌بێ‌و ئه‌مرێ و دۆن جوانیش به کچه پاشای (قه‌سته‌نتینیه) که بۆی شێت بوه‌ته‌وه ئه‌فرۆشرێت‌و رووداوه‌که به غیره‌تی کچه پاشاکه کۆتایی پێ‌دێت که ته‌هدیدی دۆن جوان به‌مردن ئه‌کات . به‌لام دۆن جوان په‌نا ئه‌باته سه‌ربازه رووسه‌کان که گه‌مارووی شاری ئیسماعیلیه‌یان داوه‌و له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئازایه‌تیه‌کی باش له‌و گه‌ماروه‌دا پیشان‌ئه‌دات بۆ شاری (بوتوسبورغ) ئه‌نیرن‌و له‌وێ (کاترین)ی دووه‌م ریزێکی زۆری لێ ئه‌گری‌و به ئیشیکی رامیاری بۆ ولاتی ئینگلستان ئه‌نیرێ . له سرووده‌کانی به‌شی کۆتایی هونراوه‌که‌دا دڵداریه‌کانی دۆن جوانمان بۆ ده‌رئه‌که‌وێ‌و له هه‌مان کاتدا ئه‌و سروودانه وێنه‌یه‌کی زندووی کۆمه‌لایه‌تی ئینگلستانمان بۆ روون ئه‌که‌نه‌وه . ئه‌ڵێن ئه‌م هونراوه‌یه جوانترین نووسینی بایرۆنه‌و دۆن جوانیش لای شاعیره ئینگلیزه‌کان شوێنێکی تایبه‌تی خۆی هه‌یه . دۆن جوان ئه‌وه نی‌یه به‌دوی ئافره‌تدا بگه‌رێت‌و راویان‌بکات‌و له‌پاشان به‌جی‌یان بهێلێت ، چونکه لێره‌دا دۆن جوان ئه‌که‌وێته داوی ئافره‌ته‌کان ، دۆن جوان قاره‌مانی دڵداری‌یه‌کی ئاسایی‌یه‌و شه‌رانی نی‌یه‌و په‌نا بۆ خیانه‌ت‌و درۆ نابات‌و لایه‌نه جوانیه‌که‌ی وای لێ ناکات په‌نا بۆ هه‌ڵخه‌ڵه‌تاندنی ئافره‌ت بیات‌و بێ گومان ئه‌مه‌یه بناغه ئه‌فسانی یه‌که‌ی داستانی دۆن جوانه . . دۆن جوانیش ئه‌و مرۆڤه پیس‌و گاڵته‌چی‌یه نی‌یه چونکه گوناه به مانا ئاینی‌یه‌که‌ی له‌م هونراوه‌یه‌دا جێگه‌ی نی‌یه ، دۆن جوان له‌لای بایرۆن گه‌نجێکی ئه‌رستوقراتیه‌و ژیانی خۆی به‌گشتی بۆ ئافره‌ت ته‌رخان کردوه .

•

• له‌و شانۆگه‌ریه شیعریه که (جراب)ی ئه‌ڵه‌مانی له ساڵی ۱۸۲۹ دا به‌ناوی (دۆن جوان‌و فه‌وست) بلاوی کردوه‌ته‌وه‌و بیروراکه‌ی له (جووته‌و مۆزارت) وه‌رگرتووه . ئه‌و شانوگه‌ریه به‌م دوو ره‌مزه ته‌عبیر له بیروباوه‌ری ئۆروپای باکووری‌و باشووری ئه‌کات . نووسه‌ر دوو قاره‌مان له ده‌وری ئافره‌تێکدا

کۆدەکاتەوە ، لای یەکەمیان دڵداری‌یەکی تازەی سەرنەکەوتووەو لای دووەمیان سەرابی بەختیاری‌و ئاشتی‌یە . . ڕووداوەکان لە ڕۆما ڕوودەدەن . دو شارستانیەت پێکەوە یەك‌دەگرن ، دۆن جوان‌و فەوست بە جووتە حەز لە (دۆنا ئانا) دەستگیرانی (ئوکتافیو) دەکەن‌و هەر یەکێك لی‌یان بڕیاری هێنانی ئەدات . دۆن جوان کە لە ئافرەتەکە نزیك دەبێتەوەو خۆشەویستیەکەی بۆ ئاشکرادەکات ، ئافرەتەکە ڕەنگی تێك‌ئەچێت‌و پێی خۆش دەبێ بەڵام لە هەمان کاتدا حەزی لەوە نی‌یە خیانەت لە دەستگیرانەکەی بکات‌و چونکە دۆن جوان بڕیاری داگیرکردنی ئافرەتەکەی داوە بۆیە شەڕ بە دەستگیرانەکەی ئەفرۆشێ‌و لە ئەنجاما ئەیکوژێ . . بەڵام فاوستی گەورەی شەیتان توانی ئافرەتەکە بۆ کۆشکێك بگوێزێتەوە ، کۆشکەکە ئەکەوێتە سەر لوتکەی شاخی (مون بلان) ، باوکی کچە لەگەڵ دۆن جوان ئەکەوێتە زۆرانبازی‌و باوکەش ئەکوژرێ . . دۆن ئانایش بە دڵێکی پڕ ئازارو ڕق‌و کینەو خەفەت ئەمێنەوە و فەوستیش لە ساتێکی تایبەتی‌دا حەز لە کوشتنی ئەکات ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئارەزووەکانی بە گشتی جی‌بەجێ دەکرێن‌و کراون بۆیە ئەم خۆزگەیەشی بۆ جی‌بەجێ دەکرێ‌و دونا ئاناش تووشی نەمان دەبێت‌و فەوستیش ئەکەوێتە دەریای نائومێدیەوەو گیانی خۆی بەبێ قەیدو شەرت تەسلیم بە شەیتان ئەکات . شەیتانیش فەوست ئەگەیێنێتە لای دۆن جوان‌و پاشان بۆیان ڕوون دەبێتەوە کە دۆن جوان کاتێ خەبەری کوشتنی ئافرەتەکە ئەبیسێ هیچ خەم ناخوات‌و خەفەت‌بار نابێت‌و وەك ئەمان بیریان لێ کردبووەوە . دۆن جوان تەنیا ژیانی خۆی گەرەکەو بەس‌و بڕوای بەوە هەیە ئەم ژیانە فراوانە ئەتوانێ هەزارەها ئافرەتی دیکەی بۆ پەیدابکات . . فەوست کە دەست بە قسەکردن ئەکات شەیتان کوت‌وپڕ ڕووحی دەرئەهێنێ‌و ڕەوانەی دۆزەخی ئەکات‌و دوای ئەمە خۆی بۆ کوشتنی دۆن جوان ئامادە ئەکات . . بەڵام دۆن جوان بە هیچ جۆرێك خۆی تێك نادات‌و مردنی فەوستی بەلاوە گرنگ نابێ‌و بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕیەوە ڕووبەڕووی پەیکەری باوکی دونا ئانا ئەوەستێت ، ئەو پەیکەرە کە دەمارەکانی ژیانی تێدا جووڵاندووە . لەوەش سەرناکەوێ کە بیخاتە سەر ڕێگەی تەوبەکاری . . دۆن جوان هەتا لە عاستی هێزە سیحری‌یە نەبینراوەکانیش دەست بە مەدح‌کردنی ژیانی ڕابواردن‌و گاڵتەجاڕی ئەکات . بەڵام شەیتان لە کوتایی‌دا بەسەریا زاڵ‌ئەبێت .

لەم شانووگەری‌یەدا دوو زەلامی مەزن یەك‌دەگرنەوە . یەکەمیان حەسوودی بە بەهێزی ژیان ئەبات . ئەو بەهێزیە کە کەس پێی ناکرێ ڕووبەڕووی بوەستێت‌و وای لێ دێت ببێتە نێچیری ئەو ئارەزووانەی کە قەد تێر نابن . بەڵام دووەمیان کە فەوستە حەزی لە بیرکردنەوەو بڵندی‌و نەمری‌یە . واتە بەدوی لەزەت لە ژیانی بەرزی‌دا ئەگەرێ‌و تینویەتیەکەی بۆ زانستی لەیەك‌گرتنی لە شەیتانا دەرئەکەوێ‌و شەیتانیش بەختیاری ناکات بەڵام ڕێگەی بەختیاری‌ی پێی پیشان ئەدات‌و هەتا ئەو جیهانە فراوانەی کە پێکەوە خەریکی گەڕانی ئەبن‌و بەناو ئاسمان و دۆزەخ دێن‌و دەڕۆن . هیچ شتێك لە دەروونیا زندوو ناکاتەوە جگە لەو ئارەزووەی کە بۆ چوونە ناو نهێنیەکەی بەهۆی مێشکەوە تینووە . . ئەم شتە بێ کوتایی‌یە کە بەدوایا ئەگەرێ وای لێ ئەکات ببێتە خاوەنی هەستێکی نە دەریای خۆشەویستی‌دا ، چونکە ئەوەی بەداوای زانستی بەبێ خۆشەویستی بکات بێ دەستکەوتەو هیچی نی‌یە . . مەسەلەی ئازارە دەروونیەکانی فەوست بە ناکۆکی ئەمێنێتەوە . . بێ گومان ئەمەش وەك مەسەلەی دۆن جوانە کە بەرێوە ئەچێ‌و پێی ئەخاتە سەر هەموو یاسایەکی ئاین‌و ڕەوێشت نەك بۆ شتێك تەنیا لەبەر ئەوەی ناتوانێ ئەو شتانە وەك کۆسپ لە ڕێگەی‌دا ببینێ . . مەئساتەکە بەهۆی شەڕی نێوان دوو زەلامەکە پەیدا نابێ چونکە دوو زەلامەکە جگە لە دوو جار زیاتر یەکتریان نەدیوەو کردەوەکانیشیان هەر یەکە شێوەیەکی تایبەتی خۆی هەیە . . ئەم شانووگەریە وەك ڕووداوێکی خەیاڵی‌یە زیاتر لەوەی درامایەکی ڕاستەقینە بێت‌و جوانیەکەی لە هەندێ لە پەردەکانی دەرئەکەوێ‌و بەتایبەتی لەو کاتەدا کە هەردوو پاڵەوانەکە پێکەوە سێبەریان خستووەتە سەر . .

هەروەها ئەو مەئساتەی کە ئەلکسندەر بۆشکین لە ساڵی ١٨٣٠ دا نووسیبووی‌و لەپاش مردنیا بڵاوبووەوە جێگەیەکی گرنگی لە ئەدەبی ڕووسی لە سەدەی نۆزدەهەمدا گرتووەو پارچەیەکە لەو کۆمەڵە چیرۆکە کە بەناوی (ڕووداوە بچکۆلەکان) بڵاوبووەتەوە . . بۆشکین لەم شانووگەری‌یەدا بۆ کەسایەتیەکەی دۆن جوان ئەگەرێت‌و بە ڕێبازەکەی (هۆفمان و مۆزارت) شی‌ی دەکاتەوە سەرەڕای ئەوەی کە شارەزایی‌یەکی باشی لە ڕێبازەکەی (مولیێر) بووە و لە هەندێ شوێنا وردە شتی لێ وەرگرتووە . دۆن جوان چاك دەزانێت ئەگەر بێت بۆ مەدرید بگەرێتەوە ڕەنگە تووشی فەوتان بێت بەڵام پاش‌گەز نابێ‌و ئەگەڵ (لیپوریللو)ی نۆکەری بڕیاری

گەرانەوە ئەدات بە مەبەستی گەران بەدوی (لۆرا) کە ئەکتەرێکی بەناوبانگ بووەو دۆن جوانیش پێ نەکراوە دڵی داگیر بکات .

دۆن جوان کە ئەگاتە گۆرستانی قەراخ شارەکە ئەوەی بیرئەکەوێتەوە کە (دۆنا ئانا)ی جوانو قەشەنگ هەموو رۆژێك بۆ زیارەتکردنی گۆری مێردەکەی دێتە سەر قەبران . . دۆن جوان حەزی لەوە دەبێ چاوەروانی بکات بەڵام نۆکەرەکەی دژ بەم ئارەزووەی ئەوەستێ . هەر لەو کاتەدا (لۆرا) بۆ ماڵەوە دەعوەتی ئەکاو (کارلوس) ی دەستگیرانی یەکێك لە میوانەکان دەبێ . . کە میوانەکان دەست بە رۆیشتنی ئەکەن دۆن کارلوس بەتەنیا ئەمێنێتەوەو دۆن جوان کوتوپر دێتە ژورەوەو ئەیکوژێو (لۆرا)ی ئەداتە بەر بارانی ماچکردنو ئەمیش تەسلیم دەبێ . . دۆن جوان شانازی بەم هێرشە تازەیەی ئەکاو پاشان بۆ قەبرستانەکە ئەچێو لەوێ (دۆنا ئانا) ئەبینێ . . دۆنا ئاناش بۆ ئەوەی سنورێ بۆ ئەم مەسەلەیە دابنێ لەگەڵیا رێئەکەویو بریارئەدەن لەمەولا لە ماڵەوە چاویان بە یەکتر بکەوێت . . دۆن جوانیش بەوە رازیئەبێورووئەکاتە پەیکەری سوارەکەو بە گاڵتەوە دەعوەتی بۆ ماڵی ژنەکەی دەکاو واش دێتە بەر چاوی کە پەیکەرەکە دەعوەتەکە قبوڵ ئەکا . .

لە رۆژی دووەمدا و هەر لەو کاتەدا کە دۆن جوان لە ژورەوە لەگەڵ دۆنا ئانا خەریکی خۆشەویستی ئەبێ لە دەرگا ئەدرێو پەیکەر دەردەکەوێو دۆنا ئانا لە هۆشی خۆی ئەچێو دۆن جوانیش هەرچەندە ئەیەوێ رابکات پێ ناکرێ چۆنکە پەیکەرەکە رێگەی پێنادا و لێ ئەپرسێ ئایا هەست بە ترس ئەکا یان نەء ، دۆن جوانیش هێزەکانی خۆی کۆدەکاتەوەو دەست بۆ پەیکەرەکە درێژئەکا ، پەیکەرەکە دەستی بە تۆندی ئەگوشێ هەتا کو گیانی دەرئەچێ . . بەم جۆرە (بۆشکین) کوتایی بە شانووگەریەکەی ئەهێنێ . کوتاییەکی زۆر جیاواز کە بەراوردی لەگەڵ تێکستە رەسەنەکەدا بکەین ، چۆنکە لە کۆنەکەدا دۆن جوان ئەبێتە قوربانیی هێزە بەتواناکانو لە پێناوی گیانە شەرانیەکەی ئەفەوتێت .

گەر بێتو ئەمانە بەگشتی جێبهێڵین شاعیرێکی پورتوغالی ئەبینین بەناوی (ئابیلیو مانویل) دی جونکیر) کە جوێن دان بە نەریتو رەویشتی کۆمەڵایەتی کردووە بە ناوەرۆکێك بۆ هونراوەیەك دەربارەی دۆن جوانو لە ساڵی ١٨٧٤ دا بڵاوی کردوەتەوە . . دانەر ویستوویەتی ئەم هونراوەیە بێتە یەکێك لەو سێ پارچە هونراوەیە کە نەیتوانیوە بڵاوی بکاتەوەو تەنیا شتێکی کەمیان لێ ماوەتە وە . . شاعیر لە پێشەکی هۆنراوەکەیدا دەڵێ : من ویستم کەسایەتیە ئەفسانەیەکەی دۆن جوان بکەم بە رەمزێك بۆ ئەو نەخۆشیانەی کە لەناو کۆمەڵی مرۆڤایەتیدا هەن وەك : بێتاقەتی ، گێژی ، بەرەڵڵایی گۆمان ، لاوازی . . و لەسەر ئەمە دەرواتو دەڵێ : من نامەوێ قارەمانەکە سزابدەمو دەزگاکانی دۆزەخ بۆی بکەمەوەو من ویستم وای لێبکەم لە برسانا بمرێت چۆنکە بەسەر خەڵقەوە ئەژی . . نووسەر گاڵتە بەوە دەکات کە دۆن جوان تەسلیم بە عەدالەتی خواوەندەکان بکرێت چۆنکە ئەمە ئەوە ئەگەیێنێ کە لەناو خەڵقا عەدالەت نیيەو دان بەوە ئەنرێ کە کۆمەڵ توانای سزادانی تاوانبارەکانی نییە .

(جۆنکیرو) بە گیانێکی گاڵتەجاری دوور لە شیعرو ئەفسانە وێنەی بۆ قارەمانەکەی کێشاوە .

ژیانی دۆن جوان لەم هۆنراوەیەدا بریتییە لە زناو بەرەڵڵاییو لە ئەنجاما لەناو یەکێك لە سێرکەکانا وەك پروپاگندەکەرێك لێ دێتو لەبرسانا لای دڵدارەکانی ئەمرێ . . هۆنراوەکە ئەکرێتە سێ بەشو هەندێ دێری جوانی تێدا ئەبینین وەك لە (کەوتنی گەڵاکان) کە شاعیر تێدا دەربارەی شێوەی ژیانی گۆندەکان ئەدوێو (ژیانە تازەکە) کە تیشکی راستەقینەی تێدا ئەبینین ئەویش بەهۆی سۆزێکی پاکەوە دروست بووە : «ئەم دەروونە پاكو خاوێنە لە کاتێکا هەنگوینی لێوەکانت گۆڵاوی پێوە ئەکات پێشکەشی بە خوا ئەکەم» بەڵام ئەبێ ئەوە بزانین کە جوێندان بە شێوەیەکی گشتی ئەبێتە هۆی خنکاندنی هەموو جۆرە شاعیریەتێك لەم هۆنراوەیەدا . چۆنکە دانەر بە رێگەیەکی ریالیزمی تیژپیسترینو خراپترین لایەنی مرۆڤایەتی پیشان ئەداتو ئەو شتە بۆگەنەمان پیشانئەدات کە مرۆڤ قێزێ لێ دێت .

لە کوتاییدا ئەبێ باسی ئەو کۆمیدیایە بکەین کە -ررج برناردشو لە ساڵی ١٩٠٣ دا بەناوی (مرۆڤو سوپەرمان) بڵاوی کردوە ، کۆمیدیاکە ئەکرێ بە چوار بەشو لەوە ئەدوێت کە (ئلن ویتفیلد) لەپاش مردنی باوکیدا دوو کەس بوون بە جێبەجێکەری سەرپەرشتیکردنی ئیشو کاری رۆژانەیدا ، یەکێکیان ناوی (رامسدین) بوو کە هاورێ خێزانەکەیان بووو ئەوەی تریش( جان تانیر) کە کتێبی (شورشگێری ئەواو)ی نووسیوە . ئەو شۆرشەی (تانیر) حەزی لێ بوو شۆرشێکی بیولۆجیە زیاتر لەوەی رامیاری یان کۆمەڵایەتی بێت چۆنکە گرنگترین مەسەلە لای ئەو

دروست کردنی بارودوخێکی ڕێك‌وپێك بوو بۆ پەیدابوونی مرۆڤی سۆپەرمان ، بڕوای بەوە کە ژن پیاو داگیرئەکاو ژنیش تەنیا بۆ خۆشەویستی ئەو ئەرواتو هەموو کچێك حەزی لە شووکردنە بە مەبەستی ئەوەی بێتە دایك‌و ئەمەش بناغەی یاساکانی سرۆشتە . بەڵام (تانیر) لەبەر جوانیەتی ئافرەت خۆی پێ نەئەگیرا و لە هەمان کاتیشا دژ بە ژن‌هێنان ئەوەستا ، چۆنکە ئەم مەسەلەیە ، وەکو ئەو بیری لێ دەکردەوە . ئەبێتە هۆی لا واکزوکردن‌و کپ‌کردنەوەی بیرکردنی . .

(ئۆکتاف) هەتا بلێ (ئان)ی خۆشەویست بەڵام ئەم حەزی لە (تانێر) بوو بۆیە وای لە باوکی کرد ، لە پێش مردنی‌دا ، (تانێر) ببێتە وەسی . . (تانیر) نەیئەزانی (ئان) خۆشی‌ئەوێ و لای وابوو حەزی لە (ئۆکتافە) ، بەڵام بەهۆی شۆفێرەکەی ئەم مەسەلەیەی بۆ روون‌بووەوە ، بۆیە (تانیر) بەرەو ئیسپانیا را ئەکات‌و لە ڕێگەدا تووشی کۆمەڵێکی ڕێگر ئەبێ سەرۆکی ڕێگرەکان ماوەیەك پێش ئێستا لە ئوتێلێکدا ئیشی ئەکرد بەڵام لەگەڵ یارەکەی تێك‌چوو و ڕێگەی جەردەیەتی گرت‌و لە دوایی‌دا بۆمان روون‌ئەبێتەوە کە ئەو کچە خوشکی شۆفێرەکەیە . . لێرەدا (تانیر) تەسلیم ئەبی‌و لە خەودا ئەمانباتە دۆزەخ لەگەڵ خۆی‌دا و لەوێ (دۆن جوان تینوریو) بە شێوەی (جان تانیر) ئەبینین‌و (دۆناانا) بەو دەم‌وچاوە جوانە (ئان وایتفیلد) مان بیرئەخاتەوە و پەیکەری سوارەکەش دەروەکەوی‌و شەیتانەکانیش وەك (رامسدین) و سەرۆکی جەردەکان دێنە بەرچاو . . بەڵام ئەم دۆزەخە کە (شۆ) وێنەی ئەکێشێ جێگەی سزادان نی‌یە بەڵکو شوێنی خەیاڵ‌و ڕابواردن‌و کردەوە

پیسەکان‌و هەموو ئەم کردەوە خراپانەن کە مێشکی بەکار قبووڵیان ناکات ، ئەمە لە کاتێکدا کە بەهشت جێگەی گەورەکانی ژیان ئەبێ ، لێرەدا دانەر بە هێزە زندووەکان هەڵئە داو هیچ سنوورێك لەنێوان ئەم دوو جیهانەدا بەوی ناکرێ ، هەر چەندە هەر یەکێکیان ڕێبازێکی تایبەتی خۆی هەیە لە روانینا . . سوارەکە لە بەهشتا بێزارەو پێ خۆشە دابەزێتە دۆزەخ ، دۆن جوانی تێر لە ڕابواردن و خۆشی مەیلی بەهشتی هەیە . . لێرەدا گفتوگۆیەکی زانستی‌یانە دەست‌پێ‌دەکرێ و بەرامبەر بە شەتیان ئەوەستێ . بەڵام شەنیان لە قسەی خۆی نایێتە خواری‌و دەربارەی پێشکەوتن‌و مرۆڤی سوپەرمان ئەدوێن . . شەیتان هەر چەند ئەکا دۆن جوان لای خۆی بهێڵێتەوە پێ ناکرێ . . دۆن جوان لە چنگی شەیتان دەربازدەبی‌و (دۆناانا) ش لە بڕیاری خۆی ناگەڕێتەوەو دان بەوە نانێت کە ڕۆڵەکەی وەك دایکێك تەواو بووە چونکە مرۆڤی سوپەرمان هەتا ئێستا کە نەهاتووەتە دونیاوە . هەر لەو کاتەدا خەونەکە تەواو دەبی‌و (تانیر) خەبەری ئەبێتەوەو (ئانا) دەچێتە ژووری‌و(ئوکتاف) یش دێت‌و هەندێ سەرباز لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێکانیان بۆ گرتنی ڕێگرەکان پەیدا دەبن . . بەڵام (تانیر) هەموویان لە گرتن ڕزگار ئەکا . . کۆمیدیاکەش لە شاری (غرناتە) کۆتایی پێ‌دێت . (دۆنا ئانا) شوو بە ئۆکتاف ناکات چۆنکە دایکی پەیمانی بە(تانیر) داوە .لێرەدا گفتووگۆیەکی تێژ لەنێوان (تانیرو کچەکەدەست‌پێ‌دەکری‌و لە دوایی‌دا (تانیر)تەسلیم دەبی‌و ماچی‌ئەکاو لەبەر ئەوەی کۆمەڵێك لە هاوڕێکانی چاویان لێ دەبێ بۆیە ناچارئەبێ بیخوازێ .

دۆن جوانەکەی (شۆ) جیاوازی‌یەکی زۆری لەگەڵ دۆن جوانە رەسەنەکەدا هەیە . . دانەر دەربارەی قارەمانەکەی لە پێشەکی شانووگەریەکەدا دەڵێ : شۆبنهاوەرو نیتشەم خوێندەوەو ئەوەی بیری لێ ئەکەمەوە دوارۆژی مرۆڤە نەك سەربەستی ئارەزووەکان . . دۆن جوان لێرەدا لە (هاملت) نزیکە نەك لە دۆن جوانە لاسایی‌یەکە . .(شۆ) بەراورد ئەکا لەنێوان سۆپەرمانی سەردەمی ڕاپەڕینەکە— ئەو مرۆڤە کە ژیانی خۆی بۆ پەرستنی تاك تەرخان‌کردبو— و مرۆڤ لە سەدەمی نۆزەهەم‌دا — ئەو مرۆڤە کە تیوری داروین کاری تێ کردبوو —(داروین) کە بیروڕای بەرەی ئادمیزادی خستە جی‌ی بیروڕای تاك‌دا . ئافرەتیش بەوە جیاکراوەتەوە کە هەوڵ نادا خۆی بفرۆشێت‌و منداڵی بێ بەڵکو بۆ مانەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی تێدەکۆشێت . . ئەم ئارەزووە سەرەتایی‌یە وای لێ کردوە لە بیروراکانی پیاو بەرزتر بێت . .

لەم کۆمیدیایە زۆرانبازیەکی نێوان دانەر و جەماوەرە بۆرجوازیە بریتایەکە ئەبینین و ئەم زۆرانبازیە کۆرتەی ناوەڕۆکەکەی شانۆی (شۆ) خۆیەتی‌و بەرامبەر بە لێ‌هاتوویەکی وەك دۆن جوان وا هەست ئەکەین کە دانەر [illegible] جیهان‌و بیرواری درۆزنەکان بڕەحێنی‌و ناکۆکی نخاتە دەروونیاو . . [illegible] پەیدابوونی مرۆڤی سۆپەرمانیش بیروڕ[illegible] رەسەنەو هەر لە بناغەوە پەنجە بۆ [illegible] بیروڕا سەربەستەکان ڕائەکێشێ . جگە لەوەش کە بیروڕایەکی بێ‌سنوورە، [illegible] رەخنە لە خۆگ[illegible] ئازانێت .

**لە گۆڤاری (الاداب المعاصرة)**
**ژمارە ١ سالی ١٩٧٦ وەرگێردراوە**

# ئۆجین

(ئۆجین یۆنسکۆ) بەیەکێك لە هەرە نووسەرە بەرزەکانی قوتابخانەی بێهوودەیی هیچ و پووچ دەژمێردرێت . ئەم نووسەرە لەساڵی (١٩١٢) دا لەڕۆمانیا لەدایك بووە . لەتەمەنی دوو ساڵیدا بنەماڵەکەیان

وولاتی ڕۆمانیا بەجێ دەهێڵن و بەرەو وولاتی فەرەنسە دەکەونە ڕێ . یۆنسکۆ لە قوتابخانەکانی فەرەنسە دەستی کرد بەخوێندن .

لەدواییدا گەڕایەوە بۆ ڕۆمانیاو لەساڵی (١٩٣٦) دا بوو بەمامۆستای زمانی فەرەنسی لەشاری (بۆخارست) . دوو ساڵ بەدواوە بەیەکجاری گەڕایەوە بۆ فەرەنسا . لەوێ دەستی کرد بەئامادەکردنی باسی دکتۆرایەك . بەڵام لەدوواییدا دەس بەرداری بوو . یۆنسکۆ کاتێك کە منداڵ دەبێت ڕووداوێك دەبینێ و وای لێدەکات کەهەرگیز لەیادی نەچێتەوەو خۆی بەسەر بیرو مێشکیدا بسەپێنێت ، یۆنسکۆی منداڵ لاوێکی باڵابەرز دەبینێت کە پیاوێکی پیرەمێردی کەنەفتی پەك کەوتە دەداتە بەرشەق و بەر شەپازللە . ئەم ڕووداوە وا لەیۆنسکۆ

..ـت کە بڕوا بەبێ هوودەیی و ناماقوڵی ژیان بهێنێت .

**ژنەگۆرانی بێژی سەربێ تووك**

یۆنسکۆ هەرگیز لەبیری ئەوەدا نەبوو کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێت بە شانۆیی نووسێك . بەڵکو زۆر قینی لە خوێندن و بینینی شانۆ دەبووەوە . وەك ڕێکەوتێك لەساڵی (١٩٤٨)دا لەتەمەنی (٣٦) ساڵیدا شانۆیی — ژنە گۆرانی بێژە

سەرڕووتاوە — کەی نووسی . یۆنسکۆ ویستی فێری زمانی ئینگلیزی ببێت .

بۆئەم مەبەستە پەرتووکێکی بچووك دەربارەی دەمەتەقێ و دووان دەکڕێت ، کە خوێنەر فێری زمانی ئینگلیزی دەکات . ئەم فەرهەنگە بچووکە بریتیە لە دەربڕینی ئەو ووشەو ڕستانەی کە خوێنەری سەرتایی فێری زمانی ئینگلیزی دەکەن یۆنسکۆ دەستی کرد بە تۆمارکردنی چەند ووشەو ڕستەیەکی پەرتووکەکە . . جێی سەرسوڕمان ئەوەبوو ، بۆی دەرکەوت کەوا هەفتە حەوت ڕۆژەو زەوی لەژێر



# یۆنسکۆ

بەشی دووەم

معتصم سالەیی

پێنداپەو بن‌بێچ لەبانی سەرمانەوەیەو گەلێ شتی سەرسورهێنەری دیکەی لەم بارەیەوە . کەگوایە ئێمە وەك شتێکی ئاسایی سواو بەکاریان دەهێنین‌و بەسەریاندا دەڕۆین بەبێ ئەوەی هەست‌و هۆشمان برووشێنن .

لەدوای وانەی سێیەم نووسەری فەرهەنگەکە دیالۆگی نێوان (مستەر سمیت) و ژنەکەی (مەدام سمیت) دەخاتە ڕوو . بێگومان مەبەستی نووسەری فەرهەنگەکە ئەوەیە کە خوێنەر بەچەند ووشەو ڕستەیەکی ئینگلیزی ئاشنا بکات‌و هیچی تر . وەك ئەو ڕستانەی کە ژنە بە پیاوەکەی دەڵێت کەگوایە چەند منداڵێکیا هەیەو ، لە دەورو بەری شاری (لەندەن)دا دادەنیشین . یاخود دەڵێت مێردەکەی لە کارگەیەکدا نووسەرە وەیاخود کارەکەرێك‌و دوو ئاشنایان هەیە کە (مسیۆ مارتن) و (مەدام مارتن) ی ژنیەتی . گەلێ ڕستەی تر لەم بارەوە کەمەبەست ، فێرکردنی خوێنەری سەرەتاییە .

(یۆنسکۆ) زۆر بەسەر سوڕمانەوە ڕوانیە فەرهەنگەکەو بڕیاری ئەوەی دا کەوەك نووسەری فەرهەنگە ئینگلیزیەکە ، شانۆگەریەکی ڕستە پچڕ پچڕاوی بنووسێت . بەم شێوەیە دوابەدوای خوێندنەوەی فەرهەنگەکە دەستی کرد بە نووسینی یەکەم شانۆیی ناماقوڵی خۆی ، کەبەناوو نیشانی (ژنە گۆرانی بێژە سەرڕووتاوە)کە کەوا (مستەر سمیت)و (مەدام سمیت) وەك دوو کەس بیرو هۆشی خۆیان وون کردبێت . دەس دەکەن بەقسەو دوانی هیچ‌و پووچی پچڕ پچڕو بێ سەرو بن . لە شانۆگەریەکەدا(مستەر سمیس (لەباتی ئەوەی بڵێت حەفتە حەوت ڕۆژە ، دەڵێ سێ ڕۆژە ئەویش سێ‌شەممەو پێنج شەممەو سێ شەممەیە! بنەماڵەی سمیت‌و بنەماڵەی مارتن ئاشنای یەکترن . بەلام لەشانۆییەکەدا دەبینین یەکتر ناناسنەوە وەك تووشی نەخۆشی‌ی لەبیرچوونەوە هاتبێتن .(مستەر سمیت باسی مردنی (بۆبی واتسون) دەکات ، بەلام کەسیان نایەنەسنەوە کەگوایە سێ لەسەر چواری شار بە پیاوو ژن‌و منداڵو سەگ‌و پشیلەوە هەمان ناو هەڵدەگرن! لەناکاو پیاوێکی کوژێنەوە دێتە سەرشانۆو باسی ئەوە دەکات کە گوایە گایەك گوێرەکەیەکی بووە ، مشکێکیش چیایەکی بووە . . ! لەدوایی‌دا داوای ماڵ ئاوایی دەکات لەبەرئەوەی گفتی هەیە لەگەڵ ئاگرێکداو ، سێ‌ڕۆژەلـــە ڕۆژژمـــێرەکـــەی‌دا نووسیویەتەوە . . بەم شێوەیە هەموو کەسانی‌ی شانۆییەکە بەقسەی پڕوپووچ‌و بێ ماناو لابەلای‌ی ژەنگ گرتوو دەدوێن . لەکۆتایی شانۆییەکەدا بەیەکدا چوونێکی بێهۆو بێمانا لەنێوان خێزانی سمیت‌و مارتن ڕوودەدات . . بەلام چۆن بەم شەرە کۆتایی بە شانۆییەکە بێت؟ نووسەر دوو کۆتایی بۆ شانۆییەکەی دەستنیشان کرد : یەکەمیان کە لە گەرمەی شەڕەکەدا کارەکەرەکە بێت‌و پی‌یانڕا بگەیەنێت کە خواردنی شێوان ئامادەکراوە ، بەم شێوەیەش هەموو جۆبلاوی لی‌بکەن‌و بکشێنەوە . لەنێو خەڵکی بینەرانیشەوە دوو سێ کەس ڕاپەڕن‌و بێنە سەر شانۆو بەرهەڵستی ئەم شانۆییە ناماقولە نابەجێیە بکەن . لەوکاتەیش‌دا بەڕێوەبەری شانۆو دوو ئافسەری پۆلیس‌و چەند سەربازێك سەربکەونە سەر شانۆو ئەو دوو سێ یاخی بووە بدەنە بەرگوللەی دەمانچەو بیانکوژن . لە ئاکامی ئەم کارەیش بەڕێوەبەری شانۆ سوپاسی خۆی بەرامبەر بەم کارەی ئەفسەری پۆلیس ڕابگەیەنێت ، کە گوایە ئەم کارەی وانەیەك پێك دەهێنێت‌و ، ڕێ نایی بینەران دەکات تا پارێزگاری‌ی داب‌و دەستوور بکەن . لەپاش ئەمەیش سەربازەکان داوای چۆڵ کردنی هۆڵەکە لە بینەران بکەن ، پەردەیش دابدرێتەوەو کۆتایی بە شانۆییەکە بێت . ئەم کۆتاییە لای نووسەر زۆر گران بوو ، لەبەر ئەوەی دەبێت پارەی حەوت هەشت کەسێك بدرێت بۆ سێ دەقیقەیەك . بۆیەوای بەباش زانی کە لە کاتی شەڕو هەلچوونەکەی نێوان دوو خێزانەکەدا کارەکەرەکە بێت‌و هاواریان لی‌بکات‌و بلێ«ئەوە نووسەری شانۆییەکەیە»و ئاکتەرەکان بە دوو ڕیز بە چەپڵەڕێزان

پێشوازیی دانەربکەن . کە بە توندو تیژییەوە بەرەو بینەران دەبێتەوەو دەستی رادەوەشێنێت‌و هاوار دەکات «ئەی گەلەحۆینە! لەچنگم رزگارتان نابێت!» داوایش پەردە دادەدرێتەوە . بەلام هەردوو ئەم پێشنیارە لەلایەن دەرهێنەرو ئاکتەرەکانەوە پەسەند نەکران . لەپاشاندا لەسەر ئەو کۆتاییە پێك هاتن . کە لەکاتی شەری نێوانی دوو بنەماڵەکەدا پەردە دابدرێتەوە ، دوایش دووبارە پەردە لەسەر سەرەتای شانۆییەکە هەڵبدرێتەوەو ئاکتەرەکان دەوری برگەکانی سەرەتای شانۆییەکە بگێرن . . . بەم شێوەبەش بینەر هەست بە مۆرکی بێهوودیی بکات‌و . لەوە بگات کە لە بازنەیەکی داخراوی بۆشدا دەسوورێتەوە .

لە کاتی پرۆڤەکردندا کێشەی ناوونیشان بۆ ئەم شانۆییە هەدەدەدا.ناوو نیشانێکی بۆ شانۆییەکەی هەڵبژارد وەك : (کات ژمێری ئینگلیزی)و (بەشی وانەی ئینگلیزی)و(شێت بوونی بیگ بەن . . .) . هیچ کام لەم ناوو نیشانانە جێی رەزامەندیی دەرهێنەری شانۆگەریەکە نەبوو ، بەرهەڵستیی کرد بەوبیانووەی کە لەوانەیە وا لێکبدرێتەوە کە مەبەستی ئەم شانۆییە تەلقیی کردنە بە کۆمەڵگای ئینگلیزی . لە کاتی پرۆڤەدا ئەکتەرێك زمانی وەرچەرخاو بە هەڵە لەباتی ئەوەی بڵێت (مامۆستاژنی قژزەرد ووتی(ژنە گۆرانی بێژی سەر رووتاوە- ، نووسەر هاواری لێ بلندبووەوەو ووتی «دۆزیمەوە! .)بەم شێوەیە ناوونیشانی یەکەم شانۆیی ناماقوڵی «ئۆچین یۆنسکۆ داندراو ، لەساڵی (١٩٥٠)دا بینەرانی فەرەنسی بۆیەکەم جار لەسەر تەختەی شانۆ بینیان‌و پێشوازییەکی مام ناوەندیان لێکرد . کاتێك کە پرسیاریان لە نووسەر کرد بۆچی ناوونیشانی (ژنە گۆرانی بێژە سەررەووتاوەکە)ی بۆ شانۆییەکەی هەڵبژاردووە؟ لەوەلامدا ووتی :(چونکە لەشانۆگەریەکەدا نەژنە گۆرانی بێژێك هەیەو نەسەر رووتاوەو قژێکیش! ئەم هۆ/یەش بەسە بۆ هەڵبژاردنی ئەم ناوو نیشانە!) (١٣)

### وانەی هیچ‌وپووچی

لەساڵی (١٩٥١) دا دووهەم شانۆگەریی یۆنسکۆ بەناوو نیشانی (وانە =دەرس) خرایە سەر شانۆ . شانۆگەری ناماقوڵی یۆنسکۆ دەیەوێت ئەوەمان پێ بسەلمێنێت کە هەموو شت بەبێ ئامانج لە گێژاوەیەکی خڕدا بەبێ هوودەیی دەسوورێتەوە .

تێکرا شتەکان بێماناو بێ سەرو شوێنن . بێگومان دەم‌و دووو وت‌و یێژو قسەکردنیش ، لە شتەکانی تر ماناداتر نین . بەڵکو هەروەك هەموو شتێکی کە لەم بوونەدا بێ ماناو سواوو ژەنگاوین . بەڵکو زمان بریتیە لە چەند رستەو برگەیەکی پووچەڵی سواوی کلێشەدار ، کە هەردەم بەبێ‌هوودە بەکاریان دەهێنین لەژیانی رۆژانەماندا نووسەر لە شانۆیی (وانە)دا تەقەلاو کۆشش دەکات لەپێ/ناوی رووخاندن‌و تێکشکاندنی زمان ، بەو بیانووەی کە گوایە زمان لە ژیانی رۆژانەماندا دەوری کاری گەری خۆی نابینێت ، وەك ئامرازێك بە مەبەستی لەیەك گەیشتن . لەم شانۆ/ییەدا مامۆستایەك وانە بە کچە قوتابییەکی دەڵێتەوەو ، هەرچەند دەکاو دەکۆشێت ناتوانێت کارەکەی بەجێ بگەیەنێت‌و وا لەو کچە قوتابیە بکا . تا لێی تێ بگات . بە دڵ شکستیەوە بەقوتابیەکە دەڵێن «خانم دەنگەکان . دەبێت باڵەکانیان لەکاتی فرینەدا ببەستین . . تانەکەونە سەر گوێیە کەرەکانەوە» .

هەموو هەوڵدانی مامۆستاکە بێهوودە دەبێ . گەلی رستەو برگەو ووشەی سەیر سەیرو پچرو پچرو هەڵبزرکاو دەهێنێتەوە بەبێ ئەوەی ئەو کچە قوتابیەی لێیان تێبگات . لە کۆتایی شانۆییەکەدا مامۆستاکە بە چەقۆیەك ، تەمسیلیانە ، قوتابیەکەی خۆی دەکوژێت . .

### کورسی‌یەکان

لە حوزەیرانی ساڵی (١٩٥١) دا یونسکۆ سێیەم شانۆیی بەناوی (کورسیەکان) نووسی ناوەرۆکی ئەم شانۆییە هەر ئەو بیرو باوەرە بێهوودەیی‌یەی نووسەر دەردەبرێت ، کە گوایە زمان‌و قسەو ووت‌و وێژ نەزۆك‌و پووچەڵ‌و بێمانان . نووسەر دەیەوێت پێمانرا بگەیەنێت (جاگەر زمان پووچەڵ بێت چۆن رامان دەگەیەنێت ! ؟) کەئەو هەموو قسانەی دەیانکەین جێوڕیی خۆیان ناگرن‌و کەسیش لێمان تێناگات . ئێمە گەر بکەوینە قسەوە وادادەنێین کە بۆ کۆمەڵێك دەدوێین ، بەلام لە راستیدا وانیەو ، جگە لە خۆمان زیاتر کەسی کە لێمان تێ ناگات‌و کەسیش لێمان حاڵی نابێت ، کەچی دەڵێین‌و مەبەستمان چیە . . ! گەر زمان ئامرازێکی کاریگەر بێت بۆ دارشتن‌و هەڵسانەسەرپێی هەموو بابەتێکی ئەدەبی ، ئەوە بە پێچەوانەوە زمان لەم شانۆگەییەدا دەوری خۆی دەبینێت . شانۆگەریی (کورسیەکان) دەربارەی خێزانێکە کە لە دوو پیری پەککەوتە پێك‌هاتووە . هەردووکیان بە گۆشەگیری لە نێوەراستی دوورگەیەکی بچووکدا دەژین . لەم شانۆگەریەدا ئەم دووپیرە دەیانەوێت ئاهەنگێکی گەورە بگێرن‌و ، میوانی

خەیالیش لە هەموو چین و دەستەیەك ، تەنانەت ئیمپراتۆریش بۆ ئەم ئاهەنگە بانگ کراون هەردووکیان پەیتا پەیتا کورسی بەتاڵ لەسەر شانۆ ریز دەکەن بەرادەیەکی هەموو جوولەیەکیان لەکاردەکەوێت . لە کۆتاییدا ووتاردەر دێتە سەر شانۆ کە هیوای رزگاریە بۆیان ، بە ووتاردەریان و راگەیاندووە کە پەیامێك بۆ رزگاری گشت مرۆڤایەتیە دەبێ بەخەڵکی رابگەیەنێت . هەردووکیان لە بانێکی زۆر بەرزەوە دا خۆیان فرێ دەدەنە خوارەوەو دەڵێن «بژی ئیمپراتۆر» .

دوای ئەوە «ووتار دەر» بەرامبەر کورسیە بەتاڵەکان رادەوەستێت . دەم دەکاتەوە تا شتێك بڵێت ، لاڵ و پاڵ دەبێت و دەردەکەوێت کە هەم کەرەو هەم لاڵە . پەردە پێوەدەدرێت . یۆنسکۆ وێنەی کەسانی شانۆگەریەکەی کێشاوە کەدەیەوێت بەزمانی یەکێکیانەوە بڵێت مرۆڤ «تەنهایە ، گۆشەگیرە ، بەژارەدارە ، هەتیوە . . تا مۆخەکەی هەست بە هەتیوی دەکات» یاخود دەربارەی قسەو وتوویژو زمان بڵێت «زۆر گرانە تائەوەی هەمە دەری ببرم . . بەلام پێویستە هەموو شتێك بڵێم» مەبەستی سەرەکی هەرەگرنگی نووسەر ئەوەیە کەگوایە ، هەموو شتێك لە بووندا وەك ئەو کورسیانە بەتاڵن و بۆشونی هەموو پەیامێك و بیروباوەرێکیش وەك پەیامی دووپیرەکە بێ ئاکام و بێ ئەنجامە هەموو قسەو وتوویژو دەربڕینێکیش وەك دەربڕینەکەی «ووتاردەر»ەکە بوونیان نیە .

(یۆنسکۆ) لەساڵی (١٩٥٣) دا یەکەم شانۆیی درێژی خۆی بەناوونیشانی (ئەمیدێ) وە نووسی دەربارەی ژن و مێردێك کە لە ناوەراستی تەمەنیاندان . پازدە ساڵ بەسەر ژن و مێردا یەتیاندا تێپەریوە ، دوورە پەرێزی و گۆشەگیریان لە ژیانیاندا گرتۆتەبەر . لەسەردەمێکی کۆندا شتێك لە نێوانیاندا مردووەو لاشەکەیشی (لەوانەیە مەبەست لەو تەرمە خۆشەویستیەکەیان بێت ؟ !) لە ژوورێکی ئەودیویانەوە رۆژ بەرۆژ لە زیادبووندایەو ، نیوەندی ئەو شوێنەیشی بۆگەن و پیس کردووە . رۆژێك لەرۆژان لاشە زەبەلاحەکە زیاتر دەئاوسێت و دەرگای ژووری دانیشتن دەشکێنێت . بۆئەوەی لەوتەرمە رزگاریان بێت ، پیاوەکە لەگەڵ خۆیدا هەڵی دەگرێت و بەرەو جۆگەلەکەی دەرەوەی دەبات . ئەوەی جێی سەرسورمانە لە رێگەدا لاشەکە دەبێت بە بالۆنێك و پیاوەی مێردە لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت .

**کەرکەدەن**

نووسەر شانۆیی (کەرکەدەن)ی لە ساڵی (١٩٦٠) دا نووسی ، ئەم بەرهەمەی دەنگ و سەدایەکی زۆر بەربلاوی دایە . لە پاریس و لەندەن خرایە سەرشانۆ . یەکەم جار (جان لویس بارو) دەری هێنا ، دووەم جاریش (ئۆرسۆن ویلز) دەری هێناو ئەکتەری بەناوبانگ (لۆرەنس ئۆلیڤێ) دەوری تێدا بینی . کورتەی شانۆیەکە ئەوەیە کەخەڵکی شارێکی بچووك تووشی گرفتێك دەبن ، گرفتەکەیش ئەوەیە هەموو ئارەزووی ئەوە دەکەن ببنە ئاژەڵی ( کەرکەدەن) . بەم شێوەیەش هەموو خەڵکی شار دەبن بەو ئاژەڵە گەورەیە ، تەنها یەك کەس یاخی دەبێت ، نایەوێت ببێت بەو ئاژەڵە ناقۆلایە . لە کۆتاییدا کەئەو تا کەکەسەیش دەیەوێت وەکو خەڵکی تر ببێت بەو ئاژەڵە ، بۆی دەردەکەوێت ناتوانێت بگۆڕێت ، لەبەر ئەوەی چارەنووسی لەوەدایە کەدەبێت بە ئادەمیزادەیەتی خۆی بمێنێتەوە .

یۆنسکۆ بیری ئەم شانۆگەریەی لە زمانی نووسەری هاوەڵی (دنیس دێ رۆجیمۆنت)ەوە وەرگرت . ئەم نووسەرە بۆ یۆنسکۆ دەگێرێتەوە کە لە ساڵی (١٩٣٨) دا لە (نۆرمبێرگ)ی ئەڵمانیدا چاوی بە خۆپیشاندانێکی نازیەکان دەکەوێت . لەگەڵ خەڵکی خۆپیشاندەراندا چاوەروانی (هیتلەر) دەکات ، دوای چاوەروانیەکی زۆر (هیتلەر) بەخۆی و دارو دەستەباوەر دەردەکەوێت ، خەڵکیش هیستیریا دەیان گرێت وەك نەخۆشیەك بەبێ ئاگایەکی تەواو هەموو دەس دەکەن بە چەپڵە لێدان و هوتاف دان . لەسەر باسەکەی دەروات و دەگێرێتەوەو دەڵێت کە خەڵکی پەیتا پەیتا زیاتر دەس دەکەن بە هات و هاوارو چەپڵە کوتاندن بۆ ئەو کابرا نیوە شێتە گەمژە چەنە بازە . ئەمیش تووشی راراییو دڵەکوتێ دەبێت لەنێو ئەو حەشاماتەدا هەست بە گۆشەگیری دەکات و موچرکە بە لەشیدا دێت و تووکی سەری رەپ دەوەستێت ، دەرك بەمانای ئەو ووتەیە دەکات کە پێی دەڵێن (هیچ وپووچیەکی پیرۆز) لە ئاکامیشدا دەتوانێت خۆی رابگرێت ، تاکو لەگەڵ ئەو لێشاوە گەمژەییەدا رانەماڵدرێت ، بەو شێوەیەش پارێزگاری لە سروشتی مرۆڤایەتی ی خۆی دەکات باسی ئەم بەسەرهاتە بووە زادەی بیری شانۆییەکەی (کەرکەدەن) .

(یۆنسکۆ) دەیەوێت ، ئەوەمان پێ بسەلمێنێت کەگوایە هەموو بیرو باوەرو ئایدیۆلۆژێك بەبێ جیاوازی ، مانای دەرچوونی مرۆڤە لە سروشتی مرۆڤایەتی ی خۆی . . یۆنسکۆ لێرەدا دەکەوێتە هەڵەیەکی زۆر گەورەوە ، دوای ئەوەی کە نایەوێت سنوور لەنێوان ئایدیۆلۆژی و

بیروباوەڕەکاندا ـ دابنێت و دەس نیشانیان بکات . نووسەر نایەوێت جیاوازیی نێوانی ئایدیۆلۆژی و بیروباوەڕی فاشستی و نازی کۆنەپەرستی و ڕەگەزپەرستی ی نامرۆڤایەتی لەگەڵ بیروباوەڕی مرۆڤایەتی و سۆشیالیستی و پێشکەوتن خوازیدا بکات . بەڵکو بەیەك چاو سەیری هەموویان دەکات .

شانۆیی (کەرکەدەن) لە زۆربەی زۆری وولاتانی جیهاندا پیشاندرا . هەر لە وولاتە سەرمایەدارەکانەوە تادەگاتە وولاتە سۆشیالیستیەکان . وەك : ئینگلستان ، ئیتالیا ، ژاپۆن ، ئەسکەندەناڤیا ، چێك و سلۆڤاکیا ، یۆگسلاڤیا ، هۆڵەنداوگەلی وولاتی تر . تیپی (جان لوی بارۆ) لەسەر شانۆی ئۆدیۆن – کەئێستا ناوی شانۆی فەرەنسایە – پیشانیاندا – لە وولاتی ئەڵمانیادا زیاتر لە هەزار جار پیشان درا . وە لە ئەمەریکادا سەدەها جار پیشاندرا .

یۆنسکۆی عەبەسی دژی هەموو بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژیەك دەوەستێت ، هەوڵی پووچەڵ کردنەوەیان دەدات ، وەك هەموو هەوڵەکانی تری بۆ پووچەڵ کردنەوەی هەموو شتێك لەم بوونەدا . لەم بارەیەوە دەڵێت :

(ئەگەر من بۆ ئایدیۆلۆژیەتێك دەنگ هەڵبڕم و سەرپێچی ی ئایدیۆلۆژیەتەکانی ترم کرد کەمێشکی خەڵکیان پڕکردووە ، ئەوسا منیش دەبم بەکەرکەدەنێکی کە ، سەرلەنوێ هەوڵی بلاوبوونەوەی گرفتی پەتای کەرکەدەن دەدەم)[١٤] .

لەلایەن زۆر لە ڕەخنەگرانەوە ، ڕەخنەی توندوتیژی لێگیراو ، دەربارەی نووسراکە مرۆڤێکی بێبیروباوەڕە ، وەهیچ دەربارەی زۆر لەو دیاردە جەرگ برانەی ئەم جیهانە جەنجاڵەی ئێمە هەڵوێستێکی مرۆڤایەتی نیە . بەڕای یۆنسکۆ گوایە دەبێت نووسەر هیچ ئایدیۆلۆژی و پەیامێکی نەبێت و بۆ بیروباوەڕێکیش تێنەکۆشێت . لەئەنجامی ڕەخنەیەکدا ووتی : من نووسەرم . پۆستەچی نیم . . یۆنسکۆ بە هەموو توانایەوە دژی ڕێبازی واقیعی دەڕوات و نکۆڵی لێدەکات دژی ئەم ڕێبازە دەڕوات کە دەڵێ :

(ڕیالیزم . واقیعی ڕاستەقینە نیە . واقیعیەت مەزهەبەو . شتێکی گەلێ جیاواز . لە واقیع . بەڵکو واقیعێکی مەیبوە لەکات و شوێندا . ڕیالیزم و واقیعیەت بە هەوڵدانی بۆ بەستەڵەککردنی ڕاستەقینە . خوێ و ژیان دەشێوێنێت)[١٥] . نووسەر بەهەموو توانایەوە بەرهەڵستی ی ڕێبازی ڕیالیزمی دەکات . ئەو ڕێبازەی کە مەبەستی دەربڕینی واقیع و دژواریەکانی ژیانە . بە مەبەستی دەس نیشان کردن و چارەسەرکردنی ئێش و ئازارەکانی مرۆڤ کە پێیانەوە دەتلێتەوە لەژیاندا (یۆنسکۆ) دوژمنی سەرسەختی (برتۆلو بریخت)ی نووسەری شانۆیی ی ئەڵمانی بوو . بە (نووسەری چەپ ڕەوی شوێن پێ هەڵگری) دادەنا . هیچ شتێکی هەست بزوێنی لە بەرهەمەکانی ئەو نووسەرە . ڕیالیستە مرۆڤایەتیەدا بەدی نەدەکردو پێی دەگوت (نووسەرێکی سەرەتایی) . ئەمەیە ڕای نووسەرێکی ناماقوڵی بێهوودەی ی بەرامبەر کەڵە نووسەرێکی پێشکەوتن خواز . کە هەردەم لە ژیانیدا بە هێزو توانای بیرو قەڵەمی ، قەڵای ستەمکاران و چەوسێنەران و داگیرکەرانی دەڕووخاند .

هەروەك دەس نیشانمان کرد ، هەموو شت لەژیاندا هیچ و بێهوودەو ناماقووڵە . هەر لە هەڵس و کەوتی مرۆڤەوە تادەگاتە زمان و هەڵوێست و بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژی هیچ شتێك لە دەس نووسەرانی ناماقووڵ ڕزگاری نەبووە . مۆرکی بێهوودەییان بەسەر هەموو شتێکدا نەخش کردووە . شوێن و کاتیش لەژێر دەستی نووسەرانی ناماقووڵ پووچەڵ کراونەتەوە . تێکڕا هەموو شت لەم بوونەدا پووك و بێ مانان . نووسەر دەربارەی شانۆیی ی کورسیەکان دەڵێت :

(بابەتی ئەمسیلەکە پەیامی دوو پیرەکە نیە بۆ مرۆڤایەتی . هەروەها مانای داکەوتنیان نیە لە ژیاندا . وە پەژارەی ناخ نیە کە پیرە پەككەوتەکان هەستی پێدەکەن . بەڵکوو ئەو کورسی یە بەتاڵانەیە کەوا دەسنیشانێکە بۆ بزربوونی خەڵکی و پادشاو خواوەندو مادەو بوونی حەقیقەت . وە دەسنیشانە بۆ بەتاڵی ی موتڵەق . بابەتی ئەمسیلەکە دەربارەی نەبوونە)[١٦] . زمان هیچ ماناو پەیامێك ناگەیەنێت لە ژیانی ڕۆژانەدا . هەروەك . یۆنسکو لەشانۆیی (وانە)و (کورسییەکان) بە رووی دەسنیشانی کردووە . بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژی بەهەمان شێوە ناماقووڵە هەروەك یۆنسکۆ لە شانۆیی ی (کەرکەدەن) دا دەسنیشانی کردووە . بەڕای یۆنسکۆ خاوەن بیروباوەڕێکی مرۆڤایەتی وەك (برتۆلو بریخت) لەگەڵ مرۆڤێکی نازی و ڕەگەزپەرستدا هیچ جیاوازییەکی نیە ! هەرچی هەیەو نیە لەم جیهانەدا بێماناو هیچ و پووچەو ناماقوڵە . وەهەرچی زاراوەیەکیش هەیە وەك : مرۆڤایەتی ، سۆشیالیستی . . میللەت و نەتەوە ، بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژی ، خەبات و تێکۆشانی چینایەتی . هەژارو دەوڵەمەندی سەرمایەدار . چەوساوەو چەوسێنەر ، داگیرکەرو نیشتمان داگیرکراو . . هتد . بەڕای عەبەسیەکان سەرجەمی هەموویان بریتین لە قالب و کلێشەو لە ڕاستیدا بوونیان

نیە . . ! هەموو خەبات‌و تێکۆشانێکیش
نە پێناوی بیروباوەڕدا لە شتێکی هیچ‌و
پووچ بەولاوە هیچی کە ناگەیەنێت . . جا
شتێکی سەیرو سەرسوڕهێنەر نیە گەر
نووسەرێکی بێ‌هوودەیی‌ی وەك یۆنسکۆ بە
چاوی پڕ بەزەییەوە بڕوانێتە زایۆنیستە
ڕەگەزپەرستەکان‌و پشتگیری خۆی لە
ئیسرائیل ئاشکەرا بکات ، بەپێچەوانەی
نووسەرانی ڕیالیستەوە کەهەردەم
پشتگیری خۆیان لە هەموو شوێن‌و
کاتێکدا ، لە گەلی فەلەستینی زەوی
داگیرکراو دەربڕیوە یۆنسکۆ بەردەوام ،
بەبێ شەرم دەستی زایۆنیستەکان
دەگوشێت‌و برادەری‌و دڵسۆزیی خۆی
بۆیان دەردەبڕێت . چەند ساڵێك
لەمەوبەر ، بەبۆنەی ڕۆژی شانۆی
جیهانییەوە ، پەیامی (یۆنسکۆ)ی نووسەر
بەبۆنەی ئەو ڕۆژەوە بە هەموو وولاتانی
جیهاندا پەخش کرا ، بەڵام لەلایەن چەند
وولاتێکەوە ئەو پەیامە ڕەت کرایەوە ،
یەکێك لەو وولاتانە عیراق بوو .

## کات‌وشوێن‌و ناماقووڵ

ڕاستە کە کات‌و شوێن نیسبین‌و
موتڵەق نین . بەڵام پێوانەیەکی نیسبیی
تایبەتیان هەیە . بەپێچەوانەوە لە شانۆی
عەبەسدا بوونیان نیەو دەسڕێنەوە .
هەروەك لە شانۆگەری‌ی (ژنە گۆرانی بێژە
سەرڕووتاوە) کەدا هاتووە مستەر سمیت
حەفتە بە سێ ڕۆژ دادەنێت ، کەوا گوایە
بریتیە لەسێ شەممەو پێنج شەممەو دووبارە
سێ شەممە . . هەر لە هەمان شانۆییدا
(سمیس خانم) ڕادەگەیەنێت کە کات ژمێر
نۆیە ، بەڵام کات ژمێر گەورە دیواریەکە
حەڤدە جار لێ‌دەدات . ئەمانەیش هەموو
نموونەن بۆ پووچەڵ کردنەوەی
وەخت‌وکات .

## وەخت‌و کات

لە شانۆیی‌ی (بکوژ – القاتل) دا .
بیرانجێ دەڵێت : (لەوانەیە تەمەنم شەست
ساڵ بێت . یاخود حەفتا ساڵ . یاخود
سەدو بیست ساڵ . بەتەواوەتی نازانم ؟)

لە شانۆیی‌ی (کچێك لە تەمەنی
شوکردندا) دا نووسەر دەیەوێت ژمارەو
تەمەن‌و ساڵ پووچەڵ‌و بێ‌بایەخ بکات .
لەم شانۆییەدا ئافرەتێك ئارەزووی
بەشوودانی کچەکەی خۆی بە پیاوێك
ڕادەگەیەنێت . لەکاتی ئامادەبوونی
ناوبراودا بۆ سەر شانۆ لە باتی ئەوەی بینەر
کچێك لە تەمەنی شوکردندا بەدی بکات ،
دەبینێت پیاوێکەو ، ناو شان پان‌و سمێڵ
ڕەشە . تەمەنیشی خۆی لە سێ (٣٠)
ساڵێك دەدات ! پووچەڵ کردنەوەی
تەمەن‌و ژمارە لەم ووت‌و وێژەدا
دەردەکەوێت .

پیاو : بوانژۆر بچکۆلەکەم ! (بە
ژنەکە) : بەڕاستی چاپووکە تەمەنی‌ی
چەندە ؟

ئافرەت : نەوەدو سێ ساڵە :

ماتماتیك‌و ژمارە بەباڵاترین نموونەی
مەنتیق دەژمێررین ، دەبینین نووسەرێکی
بێ‌هوودەیی وەك (یۆنسکۆ) بەپاچ‌و
خاکەناس هەوڵی خاپوور کردنیان دەدا .
لەشانۆگەی‌ی (وانە) دا مامۆستا بەوپەڕی
دڵنیایەوە دەڵێت (١+٧ دەکاتە ٨ جاری
وەهایش هەیە دەکاتە ٩ نۆ) سەرەتای
هەوڵدان بۆ تێکشکاندنی مەنتیق‌و ژمارەو
کات‌و شوێن لەلای دادایزمەکان سەری
هەڵدا ، دوا بەدوای ئەوانیش
سوریالیەکان هەمان کۆششیان دەکرد . لە
زۆرێك لە تابلۆکانی (سلفادۆر دالی)ی
سوریالیستدا دەبینین کاتژمێرەکان وەك
هەویریان لێ‌هاتووەو شۆڕبوونەتە
خوارەوەو تینیان تێدا نەماوەو داچۆڕاون .

لە شانۆی ناماقوڵدا کەس خاوەنی
کەسایەتی‌ی خۆی نیە . نەخۆشی‌ی
لەبیرچوونەوە تووشی مرۆڤایەتی بووە .
مرۆڤ دەرك بە دەورو پشتی خۆی
ناکات . هیچ پەیوەندییەکی مرۆڤایەتی
بەدی ناکرێت . ئەم دیالۆگەی نێوان ژن‌و
مێردێك باشترین نموونەیە بۆ ئەم
مەبەستە :

**ئاغای مارتن** : من لە ژمارە نۆزدە
جێگیرم ، ئەی خانمی خۆشەویست .

**خانمی مارتن** : ناماقوڵە : گەورەم
منیش لە ژمارە نۆزدەدا جێگیرم .

**ئاغای مارتن** : کەواتە ، کەواتە .
کەواتە ، کەواتە ، کەواتە ، ئەی خانمی
ئازیزم لەوانەیە لەوێ چاومان بەیەکتر
کەوتبێت .

**خانمی مارتن** : گەورەم ئەمە زۆر
ڕێی تێ‌دەچێت . بەڵام من بەتەواوەتی
نایەتەیادم .

**ئاغای مارتن** : شوقەیەکم لە نهۆمی
پێنجەمدا هەیە ، شوقەی ژمارە هەشت
ئەی خانمی ئازیزم .

**خانمی مارتن** : ناماقوڵە ، ئەی
خودای ئاسمانان ، ئای ئەمە چۆن
ڕێکەوتێکی سەیرو سەرسوڕهێنە ! ئەی
گەورەم منیش لەنهۆمی پێنجەمداو ،
لەشوقەی ژمارە هەشتدا دادەنیشم .

شانۆییەکانی (ئۆجین یۆنسکۆ)
لەزۆربەی زۆری وولاتانی جیهاندا ، لەسەر
تەختەی شانۆکان پیشان دەدرێن .
تێکستەکانیشی وەرگێڕراونەتە سەر زۆربەی
زۆری زمانانی زیندووی جیهان . دەتوانین
بڵێین کەوا زۆربەی شانۆگەریەکانی ئەم
نووسەرە تا ئێستاکێ وەرگێڕراونەتە
سەرزمانی عەرەبی . بەڵام وەك من پێی
بزانم تاکو ئێستا تەنها یەك شانۆیی‌ی کورتی

ئەم نووسەرە کە بە ناوی (بۆشانی ی)یە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی کوردیو لەگۆڤاری رۆشنبیری نوێدا بلاوبووەوە .

**سەمویل بێکێتو چاوەڕوانی بێ هوودە**

کاتێك کە ناوی شانۆی ناماقوڵ دێتە ناوەوە . ئەوە بێگومان ناوی (سەموێل بیکیت) خۆی بەرز دەکاتەوەو خۆی دەخاتە ڕوو وەك کۆڵەگەیەکی گەورەو بەتین لە مەیدانی بێهوودەییو هیچوپووچدا . ئەم نووسەرە لەساڵی (١٩٠٦) دا لەشاری (دبلن)ی ئیرلەندە هاتۆتە دونیاوە . لە سەرەتادا (بیکیت) وەك یارمەتیدەری مامۆستای زمانانی رۆمانی لە کۆلیجی (ترنتی)ی بەناوبانگ وانەی ووتۆتەوە لەپێش جەنگی دووەمی جیهانیدا ئیرلەندەی بەجێ هێشتووەو رووی کردۆتە شاری (پاریس)ی پایتەختی فەرەنسا . لەوێ لەگەڵ (جێمس جۆیس) کە ئەویش هەر ئیرلەندەییە - ئاشنایەتی پەیدا دەکات . لەگەڵ هەڵگیرساندنی ئاگری جەنگدا رووەدەکاتە بەشی داگیرنەکراوی وولاتی فەرەنسا ، لەوێ دەس دەکات بە کرێکاری . هەرلەوێ یەکەم چیرۆکی خۆی دەنووسێت . لە کۆتایی جەنگدا دەگەڕێتەوە شاری پاریسو دەس دەکات بە نووسینی سێ شانۆییو چوار چیرۆك ، بەلام سەرکەوتن بەچنگ ناهێنێت . لە ساڵی (١٩٤٨) دا شانۆیی (چاوەڕوانی گۆدۆ)ی نووسی ، ئەم شانۆییەی لەلایەن هەموو بەڕێوبەرانی شانۆکانەوە رەت کرایەوە بەو بیانووەی کە (ناشانۆگەرییە) . هەرکە لە ساڵی (١٩٥٣) دا لەسەر شانۆی (دی پاپلیۆنی بچووك) پیشاندرا سەرکەوتنێکی زۆری بەچنگ هێنا . چوار سەد شەو لەسەریەك پیشاندرا . ئەم شانۆییە بێ هوودەییە ناماقوڵە وەك شانۆییەکی ئاسایی نیە ، کە بریتی بێت لە رووداوو سەرەتاو ناوەرۆكو کۆتایی . بەڵکو لە سەرەتاوە تا کۆتاییەکەی بریتییە لە قسەو دیالۆگی دوو کەسی پەڕەگەندە . یەکێکیان ناوی (ئەستراگۆن)ەو . ئەوی تریان (ڤلادیمیر) . هەریەك لەم دووانە کلاوێکی رەشی ی لەسەرەو قسەی پچڕ پچڕو ئاجرو باجری بێماناو ناوەرۆكو ناماقوڵ دەکات . ئەوەی کەدەیزانن ئەوەیە کە چاوەڕوانی شتێك دەکەن کە ناوی (گۆدۆ) هەڵدەگرێت . ئەم (گۆدۆ)یە کێ بێتو چی بێتو چۆنە ؟ ئەوە خۆیشیان نایزانن . بگرە نووسەری شانۆییەکە خۆیشی هیچی لێنازانێت ! . کاتێك کە لە (بیکیت)ی نووسەریان پرس ووتیان ئەم (گۆدۆ) یە دەبێ چی بێتو کێ بێت ؟ لە وەڵامدا ووتی : (ئەگەر بمزانییایە . لە شانۆییەکە خۆیدا دەم ووت)[١٧] .

بەبێ هوودەیی بەردەوام هەردوو پاڵەوانی شانۆییەکە چاوەڕوانی ی گۆدۆ دەکەن . لەو هەڵوێستەوەی (کە هیچ روونادات . کەس بۆلامان نایەت ، کەسیش ناروات . ئەمەیش بارێکە کە هەرگیز لەتواناادا نیە) . شانۆییەکە بریتیە لە دوو پەردە کە دوو رۆژ پێك دەهێنن . دیکۆریش زۆر هەژارە ، دارێکی بێگەڵای رووت لە تەنیشت لارێیەکدا رووەاوە . کەسانی شانۆییەکەیش وەك ووتمان بریتین بەرادەی یەکەم لە (ڤلادیمیر)و (ئیستراگۆن) کە بەهیوای ژوانی (گۆدۆ)وە لەوێ وەستاون . لە پەردەی یەکەمدا (بۆزۆ)و (لوکی) بۆ ماوەیەك دێنە سەرشانۆ . (بۆزۆ) چەوسێنەرە (لوکی)یش چەوساوەو کۆیلەیە ، (بۆزۆ) ملی (لوکی)ی بە پەتێك بەستۆتەوەو بە ئارەزووی خۆی پەلکێشی دەکاتو فەرمانی بەسەردادەدات ، تەنانەت فەرمانی (بیرکردنەوە)یشی بەسەردادەدات ! . لەکۆتایی پەردەی یەکەمدا منداڵێك دێتە سەرشانۆو بە (ڤلادیمیر) و (ئیستراگۆن) دەڵێت کە گۆدۆ (ئەم شەو نایەت . بەڵکو بەبێ گومان سبەی دێت) . هەردووك دەستەخەرۆ دەبن . لەم کاتەیشدا ووردە ووردە تاریکی دادێتو مانگ لە سینەی ئاسماندا هەڵدێت . رۆژی دوایی . کە پەردەی دووهەم پێك دەهێنێت . هەرهەمان کێشەی پەردەی یەکەم لە ئارادا دەبێت کە ئەویش ئەوەیە (ئێستا چی بکەین ؟ چاوەڕوانی ی گۆدۆ دەکەین) . لەم پەردەیەدا چەند باسو خواسێك دێتە ئاراوە وەك : پێڵاوە شڕەکانی ئیستراگۆن . یاخود ئەو بیرەوەرییە کۆنانەی دوو پەرەگەندەکە . ویاخود ئەو دارەی کە دوێنێ رووتو بێگەڵا بوو . بەلام لەم پەردەیەدا گەڵای لێڕوواوە . جارێکی تر (بۆزۆ) و (لوکی) پەیدا دەبنەوە نەك وەك دوێنێ . بەڵکو بەشێوەیەکی جیاواز . (بۆزۆ)ی چەوسێنەر کوێر بووەو (لوکی)ی چەوساوەیش لاڵ بووە . لەم پەردەیەدا بەهەمان شێوەی رۆژی پێشوو پەیامبەری (گۆدۆ) جارێکی تر دێتو پێیاندەڵێ ئەم رۆیش ناوبراو نایێت . لەم کاتەیشدا بەرە بەرە رۆژ بەرەو ئاوابوون دەچێت . بەم شێوەیەی خوارەوە کۆتایی بە شانۆییەکە دێت :

یستراگۆن : پەتکت پێیە ؟

ڤلادیمیر : نەء

ئیستراگۆن : کەواتە ناتوانین .

ڤلادیمیر : بابڕۆین

ئیستراگۆن : چاوەڕێکە . ئەوە پشتێنەکەمە

ڤلادیمیر : زۆر کورتە .

ئیستراگۆن : لەنێو لنگمدا دەتوانیت خۆت بخنکێنیت .

ڤلادیمیر : ئەی کێ لەنێو لنگی مندا خۆی

بخنکێنێت ؟
ئیستراگۆن : ڕاستە .
ڤلادیمیر : یەك ئەنجامە (ئیستراگۆن ئەو گوریسەی کە شەرواڵە فلتەکەی ڕادەگرێت . ڕایدەکێشێت و شەرواڵەکەی دەکەوێتە بانی پێی . هەردوو سەیری پشتێنەکە دەکەن) لەوانەیە گەر تەسکی کەینەوە سوودمان پێ بگەیەنێت بەڵام دەبێ بەتین بێت وەکو دەتەوێت .
ئیستراگۆن : بەزووترین کات دەبینیت .
(هەریەکەو سەرێکی پشتێنەکە دەگرن و ڕایدەکێشن . پشتێنەکە دەپچڕێت و هەردووك دەکەون) .
ڤلادیمیر : ئەم پشتێنە بەس شایستەی نەفرەت لێکردنە . (بێ‌دەنگی) .
ئیستراگۆن : دەڵێیت کەوا پێویستە سبەی بگەڕێینەوە ؟
ڤلادیمیر : بەڵێ .
ئیستراگۆن : دەتوانین پارچە گوریسێکی باشتر بهێنین .
ڤلادیمیر : بەڵێ (بێ دەنگی)
ئیستراگۆن : دیدی .
ڤلادیمیر : بەڵێ .
ئیستراگۆن : من ناتوانم ئاوەها بەردەوام بم .
ڤلادیمیر : تۆ وا تێ دەگەیت .
ئیستراگۆن : چۆنە جیا ببینەوە ؟ لەوانەیە باشتربێت بۆمان .
ڤلادیمیر : سبەی خۆمان دەخنکێنین (بێ‌دەنگی) ئەگەر بێت و گۆدۆ نەیەت .
ئیستراگۆن : ئەگەر هات ؟
ڤلادیمیر : ڕزگارمان دەبێت .
ڤلادیمیر : (کڵاوەکەی ، کەهی (لوکی)یە دادەکەنێت سەیری ناواخنەکەی دەکات و دەستی پیادا دەسوێت و ڕایدەوەشێنێت و بانەکەی دەداتە بەرنووکی پەنجە ، دووبارە دەیکاتەوە سەری)

ئیستراگۆن : باشە ؟ بڕۆین ؟
ڤلادیمیر : شەرواڵەکەت هەڵبرە .
ئیستراگۆن : چۆن ؟
ڤلادیمیر : شەرواڵەکەت هەڵبرە ؟
ئیستراگۆن : دەتەوێت شەرواڵەکەم داگرم ؟
ڤلادیمیر : شەرواڵەکەت هەڵبرە ؟
ئیستراگۆن : (دوای ئەوەی هەست دەکات کە شەرواڵەکەی دابەزیوە) ڕاستە (شەرواڵەی هەڵدەبڕێت . بێ‌دەنگی) .
ڤلادیمیر : باشە ؟ بڕۆین ؟
ئیستراگۆن : بەڵێ . بابڕۆین . (لەجێی خۆیان نابزوێن . پەردە) .

## جۆدۆ وسمایل نامە

بەم شێوەیە کۆتایی بە شانۆییەکە دێت . بەبێ ئەوەی (گۆدۆر) دەرکەوێ . زۆر شت دەربارەی شانۆگەرییەکەو هیمای (گۆدۆ) گوتراوە . دەڵێن گوایە (گۆدۆ) هیوایەکی بێ‌ئاکامە کە هەردەم هەموو مرۆڤێك بێ‌پەرواو بێ‌هوودە وەك مزگێنیەك چاوەڕوانیەتی . ئەوەی هەیە کە ووشەی (گۆدۆ) لەرووی زمانەوانیەوە لە ووشەی (گۆد) ی ئینگلیزیەوە نزیکە ، کە بە مانای خوادێت . ئێمە کاتێك کە منداڵ بووین و لە مزگەوت لەلای مەلا دەمانخوێند ، پەرتووکێکی ئاینمان هەبوو کە بە شیعر داڕێژرابوو ناوی (أسماعیل نامە) بوو ، لەو پەرتووکەدا گەلێ چیرۆك و ئەفسانەی سەیر سەیر هەبوون .

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە چیرۆکێکی تێدابوو ، کەزۆر لەشانۆیی‌ی (چاوەڕوانی‌ی گۆدۆ)وە نزیك بوو . لەو چیرۆکەدا کابرایەك دەچێتە سەر شاخێك و خواردن ئامادە دەکات و بەبێ هوودە چاوەڕوانی‌ی خودا دەکات وەك مزگێنیەك بۆ ڕزگار بوون . جانازانم ئەم چیرۆکە لە (تەورات) ەوە وەرگیراوە یاخود نا؟ چونکی تەورات سەرچاوەی هەموو چیرۆك و ئەفسانەیەکی ئاینیە . لەم دواییەدا زۆر بەدوای ئەو (أسماعیل نامە) یەدا گەڕام و بەچنگم نەکەوت .

وەك ووتمان ناوەڕۆکی شانۆیی‌ی (چاوەڕوانی‌ی گۆدۆ بریتیە ، لە چاوەڕوانی‌ی بێ‌هوودەی (گۆدۆ) . ئەو دوو کەسە لە سەرەتای شانۆییەکەوە تا کۆتاییەکەی هەر بە هیوای هاتنی (گۆدۆ)وەن . بەبێ‌هوودەیی کاتەکەیان دەبەنە سەر سەرەڕای نەخۆشیەکانیان (ڤلادیمیر بە پرۆتستاتیەوە دەتلێیتەوە ، ئیستراگۆن پەراسووی شکاوەو یەکێکیان لە دەمیەوە ئەوی تریان لەپێیەوە بۆنی ناخۆشیان لێ دێت بەبێ هیچ ناوەڕۆکێکی بایەخدار دەدوێن :
ڤلادیمیر : قسە نابڕێتەوە
ئیستراگۆن : دەبێ قسە بکەین تاخۆمان هەڵبخەڵەتێنین کە گوایە هەین .

ئەم دوو کەسەی شانۆییەکە خاوەن کەسایەتی خۆیان نین و هەویەی تایبەتیان نییەو سەر بە هیچ نەتەوەو زەوییەکی تایبەتیش نین و کەسایەتیان ڕوون نیە هەروەك کەسایەتی‌ی (گۆدۆ) ی شارراوەی نادیار : ڤلادیمیر ناوێکی ڕووسییە ، ئیستراگۆن ناوێکی ئەسپانییە ، لوکی ئینگلیزیە . . . سەرەڕای ئەمانەیش هیچیان خاوەن ئیش و کارو کاسبییەك نین .هیچ ئامانجێکیش نیە کە لە ژیانیانداپاڵیان پێوە بنێت .

وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە کە وەخت و کات لای (ئوجین یونسکو) بزرەو بوونی نیە ، دەبینین لای (سەمۆئێل بیکیت)یش خەتی ڕاست و چەپ بەسەری‌دا دراوەو

سەرەنگوم کراوە . هەروەك لەم قسانەی (بۆزۆ)دا دەردەکەوێت : (بە کاتی نەفرەت لێ‌کراوت بەس نەبێت ئازاردانم ! ئەمە شتێکە جێ‌ی بێز لێ‌کردنەوەیەکی زۆرە! کەی! کەی! لە ڕۆژێك‌دا . ئەمە بەس نییە بۆت . ڕۆژێك وەك هەموو ڕۆژانی کە . ڕۆژێك لەڕۆژان ئەو لاڵ بووو منیش ڕۆژێك کوێر بووم . ڕۆژێکیش هەردووك کەردەبین . ڕۆژێك لەدایك بووین ڕۆژێکیش دەمرین . هەمان ڕۆژ هەمان چرکە . ئەمە بەس نەبێ بۆت؟

ڤلادیمیرو ئیستراگۆن تووشی لەبیر چوونەوەی هەمیشەیی بوون . تەنانەت بۆ ڕۆژی دوایی نازانن کە دوێنێکە لەکوێ بوونە . شوێنیش وەك کات هیچ بایەخێکی ئەوتۆی نییە . ئیستراگۆن وای لێ دێت تا ڕەنگی پێلاوەکانی لەبیردەچێتەوە :

ئیستراگۆن : ئەمە هی من نییە .
ڤلادیمیر : (زۆر بەسەر سوڕمانەوە) هی تۆنییە!
ئیستراگۆن : پێلاوەکانم ڕەش بوون بەڵام ڕەنگی ئەم قاوەییە .
ڤلادیمیر : تۆ دڵنیایت ڕنگی پێلاوەکەت ڕەش بوو؟
ئیستراگۆن : باشە ، ڕەنگی مەیلەو خۆڵەمێشی‌بوو .

هەڵوێستی (بیکیت) بەرامبەر بە زۆردارو ستەمکارو چەوسێنەر ، هەڵوێستێکی داخەتاوە ، بۆنموونە (بۆزۆ لە شانۆیەکەدا وەك چەوسێنەرێك‌و (لوکی) شیوە وەك چەوساوەیەك دەردەکەوێت یەکەمیان بەپەت‌و قامچی دووهەمیان لێ دەخوڕێت‌و وەك بەندەیەکو کۆیلەیەکی ژێر دەستەی خۆی ڕەفتارو هەڵس‌و کەوتی لەگەڵ‌دا دەکات . لەپەردەی دووەم‌دا چەوسێنەر کوێر دەبێت . چەوساوەیش لاڵ دەبێت . نووسەر دەیەوێت ئەم کێشەیە وەك موعادەلەیەك بخاتە ڕووو بڵێت : کە مادامەکی چەوساوەو چەوسێنەر بەدەستی سروشت‌و چارەنووسەوە دەتلێنەوە . دەبێت جیاوازی لە نێوانیان‌دا نەبێت . نووسەر دەیەوێت ستەم کارو ستەم لێ‌کراو لە دوو تای تەرازووودا بەرامبەر یەك ڕابگرێت بەبێ جیاوازی . وەك ئەوەی کە (لوکی) ی بەش خواراو دەبێت ڕازی بێت بەبەشی خۆی وەك چارەنووسی‌و ، نابێت پرکێشی‌ی جەلادەکەی بکات‌و بەگژی‌دا بچێت‌و یاخی بێت!

## ژن‌و . . کۆتایی‌گەمەکە

ئەو شتەی کە نکوونی لێ‌ناکرێت ئەوەیە کە ژن مایەی بەردەوامی‌ی ڕەگەزو جنسی مرۆڤایەتیەو ، هۆی بەردەوامی‌ی ژیانە ، بە پێچەوانەوە لەلای (بیکیت) ژن سەرچاوەی مردنە .

ڕەخنەگری ناودار (مارتن ئیسلن) لەم بارەیەوە دەڵێت :

(لە شانۆیی «چاوەڕوانی‌ی گۆدۆ» دا مێینە یان بوونی هەیە بەشێوەی تیل نیشانی (تلمیحیە) لەپێناوی نەفرەت لێ‌کردنی‌دا (لەلایەن بۆزۆوە) کەگوایە (ئەو سەگە زەمینییە) ،یان تاوانبارکراوە بەوەی کەگۆڕ لەنێو لنگیەوە لەدایك دەبێت ، بەڵام لە شانۆیی‌ی (کۆتای‌ی گەمە)دا سەرەڕای مردنی ڕاستەقینەی دایك لەنێو تەنەکەی زبڵ‌و پیساوی‌دا ، ناوی ژنێك بەشێوەیەکی لابەلایی لە دیالۆگ‌دا دەهێندرێت . ئەویش بیکی دایکە کە هام نایەوێت نەوتی بداتێ بۆ چراکەی ، لەبەر ئەوەیش (لە تاریکیدا دەمرێت)[18] .

لەساڵی (١٩٥٧) دا بیکیت شانۆیی (نهایە اللعبە- کۆتای‌ی گەمەی) نووسی لەم شانۆییەدا سێ نەوە لە کوانویەکی کەم ڕووناکی هەژاراندا دەژین نەوەی یەکەم بریتیە لە (ناگ) و (نیل) ی مێردو ژنی پیری پەك کەوتەی ئیفلیج ، کەلە نێو تەنەکەی زبڵ‌و پیسی‌دا دانیشتوون‌و سەریان بەدەرەوەیە . نەوەی دووهەم بریتیە لە (هام) کە ئەویش ئفیلج‌و کوێرە . نەوەی سێ‌یەم بریتیە لە (کلۆڤ) کە بە دەستی (هام) ی باوکیەوەو ،(ناگ )و (نیل) ی باپیرەو داپیرەیەوە تووشی ڕۆژی خۆی بووەو ناتوانێت شانی دانوێنێتەوە . ئەوەی شایستەی باسە ئەوەیە کە ووشەی (هام) لەزمانی ئینگلیزی‌دا لەووشەی (هامر)ەوە نزیکە کەبەمانی مێکوت دێت . ووشەی (کلۆڤ) نزیکە لەمانای (بزمار) . ناوەرۆکی ئەم شانۆگەریە بریتیە لە دەنگ هەڵبڕینی نارەزایی بەرامبەر ، بە لەدایك بوون‌و ژیان و مردن :

گلۆڤ : ئەی گەمژە ، تۆمنت بۆ هێنایە ، دونیاوە .
هام : نەم دەزانی .

هەروەك لەم شانۆییەدا دەردەکەوێت ، ژیان وەك ئاوی گۆمێکی بۆگەنی وێستاو وایە «ژیان هەمووی هەر پرسیارەو هەر هەمان وەڵامیشە ئەگەر ئەو پرسیارە بکرێت یاخود نەکرێت» (ناسۆریش خۆی لە خۆی‌دا گاڵتە جاریەکە کەهیچ گاڵتەجارریەك هاوتای نیە) . (شەپۆلەکان قرقۆشمن ، خۆریش خاڵیکی سفرە . بەم ووتانە کەسانی شانۆگەریەکە دێنە زمان‌و بیروباوەری خۆیان دەردەبڕن . (هام) دەیەوێت بێ‌هوودەیی‌و پووکی‌و بۆشایی ژیان دەربڕێت ، کەدەڵێت (بۆشایی بێ‌کۆتایی

گەماڕۆی داوێن‌و هەموو مردووانی چەرخەکان بێت‌و بگێڕێنەوە بۆ ژیان جارێکی تر ، دانەیێك زیخ پێك دەهێنن لەنێو ئەم بیابانەدا ) .

ماوەیەك لەمەوبەر برادەرێك شانۆییەکی یەك پەردەیی نووسیبو پیشانی دام ، داوای لێکردم ڕای خۆم بەرامبەری دەرببڕم . دوای خوێندنەوەی ووتم : برادەری ئازیزم ئەم شانۆییەی تۆ لە شانۆیی (کۆتای گەمە) ی (بیکیت)ەوە زۆر نزیکە . . جا ئیتر ئەگەر لە ئاگاییەوە هەڵقولابێت یاخود لەبێ ئاگاییەوە بێت ! درێژەم بەقسەکانم داو ووتم شانۆییەکەی بیکیت لە ساڵەکانی پەنجا نووسراوە . . جاگەر بێت‌و ئەو شانۆییەی بیکیت هەڵسەنگێنین وەژی بووەستین یاخود پشتگیری لێوە بکەین ، هەر یەك ئەنجامان دەس دەکەوێت ئەویش ئەوەیە کە لە تۆ باشتری نووسیوەتەوە .

ئیتر برادەر گەر کاروبار بەم شێوەیە بێت‌و لەوسالأنەدا نووسەرێك بابەتێکی لە تۆ باشتری نووسیبێت . جاچ پێویستیەك هەیە تاتۆ بچیت لاسایی بکەیتەوە . . ! ؟ ئەمە کێشەی تۆنیە بەتەنها بەڵکو کێشەی گەلێك لە نووسەرانە لەلای خۆمان‌و گەلی شوێنی تر . گوایە ئێمە هیچ ئێش‌و ئازارو کێشەیەکی ئەوتۆمان نییە تا لەسەریان بنووسین . . ؟

## ئەداموف‌و پاشگەز بوونەوە

ئەو نووسەرەی کە دەنگی خۆی لەگەڵ دەنگی نووسەرانی ناماقوڵدا جووت کرد ، (ئارسەر ئەداموف)بوو . ئەم نووسەرە لەساڵی (١٩٠٨)دا لەبنەماڵەیەکی ئەرمەنی لە قەفقاسیای ڕووسیای قەیسەریدا هاتە دونیاوە . بۆ خوێندن لە (جنێف) ژیا دوایش لە (ماینز) . لە ساڵی (١٩٢٤)دا وەلەتەمەنی شازدە ساڵیدا بەیەکجاری لەشاری (باریس ) جێگربوو . .

یەکەم بەرهەمی ئەم نووسەرە چیروکیکی ، شانۆیی بوو بەناوی (پیلانی مەزن‌و بچووك) لەلایەن (جان ماری سیرۆ)وە لەتشرینی دووەمی ساڵی (١٩٥٠)دا دەهێنرا . سێ ڕۆژ بەدواوە (جان ڤیلار) شانۆیی‌ی دووەمی (ئەداموف)ی لەسەر تەختەی (شانزیلیزێ) دەرهێنا ،کە بەناوی (داگیر کردن— الغزو)وەوەبوو . ئەداموف ئاشنای (ئارتۆ)ی دەردهێنەر بوو وستریندبێرگ‌و کافکاه کارێکی زۆریان کردبووە سەری . ئەداموف دەگێڕێتەوە کەوا ڕۆژێکیان ڕووداوێکی بچووك لە ڕوواڵەت‌دا تووشی دەبێت‌و لە ئاکامیدا دەڵێت (ئەمەیە شانۆی ڕەسەن ، پێویستە چارەسەری بکەم) .

گوایە نووسەر کوێرێك دەبینێت لە شەقامەکاندا دەسوورێتەوە ، لەناکاو دوو کچی لاو بە تەنیشتیدا تێدەپەڕن ، بەبێ ئەوەی ئاگایان لێ بێت لێ‌ی دەکەون‌و لەتری پێ دەدەن‌و دەس دەکەن بە گۆرانی ووتن‌و دەڵێن (کاتێك کەچاوم نوقاند بوو وجود زۆر قەشەنگ هاتە پێشی چاوم) .

لەساڵی (١٩٥٣)دا نووسەر شانۆیی‌ی (هەموودژ بە هەمووی) نووسی دوایە دوای ئەمەشی گەلێ‌ش نۆیی نووسی وەك (مانی ڕەوت)و (ژوان)و (مامۆستا تاران) ، کەئەم دوایینەیان یەکێکە لەشانۆییە هەرە بەناوبانگەکانی (ئارتەر ئەداموف نووسەر بەردەوام بوو لە نووسینی بەرهەمی شانۆیی کە هەموویان بۆنی بێ‌هوودەیی‌و عەبەسیەتیان لێ‌هەڵدەستێت . لەپاشاندا نووسەر بیرو باوەری خۆی دەگۆڕێت‌و پشتی خۆی لە دەستەی نووسەرانی ناماقوڵ وەردەگێڕێت‌و دەسبەرداری ئەدەبی ناماقوڵ دەبێت . لە قۆناخی تازەیدا (ئەداموف) ڕێبازی ڕیالیزمی‌ی ڕەخنەیی (الواقعیە النقدیە) دەگرێتەبەر . ئەگەر نووسەر لە قۆناخی یەکەمدا نامەقووڵی‌و بێ‌هوودەیی ژیـــان‌و گەردوونی دەردەبڕی ،دەبینین لە قۆناخی دووەمیدا ناماقوڵی‌و بێ‌هوودەیی سروشتی کۆمەڵگای چینایەتی دەردەبڕێت‌و پەردە لەسەر دیارە ناهەمزارە نامرۆڤایەتیەکانی کۆمەڵگای بۆرژوای سەرمایەداری هەڵدەماڵێت هەروەك لە شانۆگەری‌ی (پینگ پۆنگ)و (پاول‌و پاولی)دا بەڕوونی دەردەکەوێت .

## جان‌جینێ‌ی هەژار

ئەو نووسەرە فەرەنسیەی کە بەبێ ئاگای تەواوی خۆی شانۆگەری‌ی عەبەسی‌ی دەنووسی (جان‌جینێ) بوو کەساڵی (١٩١٠)لەفەرەنسا لەدایك بووە . ئەم نووسەرە هەر لە سەرەتای چاو هەڵێنانیەوە لەسۆزی دایك‌و باوك بێ‌بەش بوو ماڵە جووتیارێك بۆماوەیەك دەیگرنە خۆیان ،لەدوای هەڵەو خەتایەکی بچووك بە دەزگای ڕاستکەرەوەی هەتیوانی (أصلاحیة الأحداث) دەسپێرن . لەوێش هەڵدێت‌و ڕادەکات‌و دەس دەکات بە کاری دزی‌و تاوانی جۆراو جۆر ، لەم شار بۆ ئەو شارو ، لەم بەندیخانە بۆئەو بەندیخانە لەساڵی (١٩٤٢)دا لەبەندیخانەی شاری (مژین) یەکەم هەڵبەستی بەناوونیشانی (کیژۆڵەی گولان دەنووسێت) .

لەساڵی (١٩٤٧)دا یەکەم شانۆیی‌ی بەناوونیشانی (کارەکەرەکان) دەنووسێ . ئەم شانۆگەرییەش وەك ژیانی نووسەر خۆی بۆنی نامەقوولیەت‌و تاوانی لێ‌هەڵدەستێت هەندێك لە ڕەخنەگران ووتیان لەوانەیە مەبەستی نووسەر پشتگیری کردن بێت لە

هەژارو کارەکەرو چەوساوەکان نووسەر ئەم بۆچوونەی ڕەت کردەوەو ووتی (پارێزگاری لە چارەنووسی کارەکەرەکان ناکەم. وەك بزانم نیقابەیان هەیەو کاروباریان دەگرێتە ئەستۆ. جان جینێ شانۆیی (ڕەش پێستەکان ی) نووسی. وەڵامی پێشووی دووپات کردووەوە. کە مەبەستی پشتگیری کردن نیە لە ڕەش پێستەکان. بەم شێوەیە وەڵامی ڕەخنەگرەکانی داوە:

(وەك بزانم حیزبێك هەیە پارێزگاری لەڕەنگدارەکان دەکات ومن هیچم بەسەریانەوە نیە). بەڵێ ئەمەیە هەڵوێستی نووسەرێکی عەبەسی کە مرۆڤێکی سەرلێشێواوە تاکڕەوە. کەهەر بۆخۆی دەژی‌و چارەنووسی خۆی بەتەنها لامەبەستەو بەس. مرۆڤێکە بەبێ ئامانج‌و هیچ هیوایەکەوە لە ژیاندا هەنگاو دەنێت. ژیان لەبەرچاوی وەك کاغەزێکی ڕەش وایە. ژیانی پڕە لە ترس‌و لەرز لەچارەنووس‌و مردن. لە ژیاندا هیچم بیرو باوەڕو پێوانەیەك‌و ئاستێکی مرۆڤایەتی بەدی ناکرێت.

ژیانی مرۆڤی بێ‌هوودە هەرروەك ژیانی منداڵێکی ساوا وایە کە دەوروبەری پڕە لە ووشەی بڤە) ئەوەی شایستەی باسە ئەوەیە کە نووسەرانی بێ‌هوودەی وەك ئەنجامی ڕێبازەکان پێشووتریان گەیشتنە ڕێگایەکی بەستراوو هیچم ئاکامێکی ئەوتۆیان بەچنگ نەهێناوە ڕێبازەکەیان پووچەڵ بووەوە دوای ئەوەی کە بۆ چەند ساڵێك دەوری خوی بینی وەك ڕەنگ دانەوەی زرووف‌و بارو دۆخی سەردەمێکی تایبەتی

**ئەنجامو.. کاتی‌ی‌ووشك نەکردوو**

ئێستاکێ قوتابخانەی بێ‌هوودەی بە تەواوەتی پەکی کەوتووەو لەکار وەستاوە لەم ساڵانەی دوایی‌دا هیچ بەرهەمێکی ناماقووڵ بەدی ناکرێت کە لە توانای‌دا هەبێتەدەنگدانەوەیەکی ئەوتۆ بخاتەوە. تەنانەت ئەو نووسەرانەی کە ڕابەری ئەم قوتابخانەیە بوون‌و بە دامەزرێنەری دادەنرێن. بۆ ماوەیەکی زۆر دەچێت وازیان لە نووسین هێناوە. یاخود توانای نووسینی بەرهەمێکی وایان نییە تاناوبانگێکی باش دەربکات. ئەوەی کەپێیان بوو هەموویان هەڵڕشت. ئەمەیش بەپێچەوانەی ڕێبازی ڕیالیزمەوەیە کە هەرگیز ووشك بوونی بۆینیە. ئەگەر هەموو ڕێبازو قوتابخانە ئەدەبی‌و هونەرییە جۆربەجۆرەکان لە کۆتایی‌دا تووشی وەستان‌و بەستەڵەکی بوون، ئەوە بەپێچەوانەوە ئەدەب‌و هونەری ڕەیالیزمی وەك ئاوی کانیەك هەردەم لەهەڵقوڵاندایەو ووشك بوونی بۆینە بەردەوام‌و زیندووە لە هەموو شوێن‌و سەردەمێك‌دا. ڕێبازی ڕیالیزمی سۆشیالیستی توانی خۆی بەسەر بیرو هۆشی ئەدیب‌و نووسەران‌و هونەرمەندانی پێشکەوتن خوازی جیهانی سەردەمماندا بسەپێنێت، دوای ئەوەی کە زۆری میللەتانی جیهان بیروباوەڕی سۆشیالیستی‌و پێشکەوتنخوازی گریتانیەوەو بڕوایان پیێ‌ی هێنا وەك ئایدیو لۆژیەتێك کە هەردەم لە خزمەتی مروڤایەتیدایە بەبێ جیاوازی کردن لەنێوان تاك‌و کۆمەڵ‌دا. بەڵکو تاك یەکێکە لەو کۆمەڵەی کە تیایدا دەژی سەرکەوتنی کۆمەڵ مانای سەرکەوتنی تاکە، داکەوتنی کۆمەڵیش مانای داکەوتن‌و تێکشکاندنی مرۆڤی تاکە.

لەم سەردەمەی ئێمەدا دەبینین نووسەران‌و هونەرمەندانی واقیعی‌و ریالست ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە بوژاندنەوەیەکی هەمیشەیین‌و هەردەم بەرەو پێشەوە هەنگاو دەنێن. بەرادەیەك نووسەرە هەرە بەناو بانگەکانی ئەم سەردەمەی ئێمە لەو نووسەرو هونەرمەندانەن کە ڕێبازی ڕیالیزمیان گرتۆتەبەرو دژی چەوسێنەرو داگیرکەر دیکتاتۆریەت دەوەستن. بەڵام ئەوەی جی‌ی ستەم‌و داخە ئەوەیە کە هەندێك لە ڕۆشنبیران‌و نووسەرانی ووڵاتە تازەپێگەیشتووەکان لە جیهانی سێهەم‌دا پەیڕەوی بیرو باوەڕی وجودی بێ‌هوودەیی دەکەن‌و خۆیان بەرامبەر هەموو ئێش‌و ئازارو ئەشکەنجەکانی کۆمەلگاکانیان گێل دەکەن. ڕاستیەکی گومان لی‌نەکراوە کە هەر نووسەرێك بێت‌و لاسای‌ی ئەو تەوژمە بۆرژوازیانە بکاتەوە، سەرئەنجامی ووشك بوونەوەیەو ئەدەبێکی نەزۆك دێنێتە کایەوەو بەرهەمەکەیشی بەرهەمێکی نەمرو زیندو نابێت. بائەوە لەیاد نەکەین ئەگەر ژیان ناماقولّ بێت لای لی‌هوودییەکان، ئەوە شایستەی باسکردن‌و لێکۆڵینەوەی ڕاستەقینەیە لای نووسەری ریالست گەر لەلای نووسەرانی ناماقولّ مرۆڤ دوای تەڕاویلکە (سراب) کەوتبێت ئەوە لای ریالستەکان مرۆڤ دوای بیرو باوەر کەوتووە. بێگومان هەموبیرو باوەڕێکی بێ‌هودیی سوقیەت‌و بەرەلای‌ی هەردەم لەخزمەتی سەرمایەدارو بۆرژواو شێخ‌و ئاغادایە. بەرادەیەك ستەم کار کلیلی قەدەغە لەدەرگای هەموو بیرو باوەڕێك دەدات، تەنها دەرگای بێ هودەیی نەبی..! جانازانم کێ ڕایەکی کەی هەیە بادەری بڕێت.

## پەراویزەکان

١ – موسوعة المصطلح النقدى– اللامعقول–نووسینی : ئارنۆلد پ .هنجلف . وەرگێرانی د . عبدالواحد لؤلؤة . وزارة الثقافة والفنون . بغداد ١٩٧٩ ،ل ٩ .

٢ – المسرحية من أبسن الى اليوت . نووسینی ريموند وليمز . وەرگێرانی . د .فايز أسكندر . وزارة الثقافة والأرشاد القومي . القاهرة . ١٩٦٣ ، ل ، ١٧٢ .

٣ – سەرچاوەی پێشوو . ل ، ١٥٠ .

٤ – مسرحية هنرى الرابع ، نووسین . لويجى بيراندللو وەرگێرانی ، محمد اسماعيل محمد ، الدار القومية للطباعة والنشر القاهرة ، ١٩٦٦ – پێشەکیەکەی وەرگێر–ل ، ٢١ .

٥ – موسوعة المصطلح النقدي – اللامعقول . ل ، ٦٢ .

٦ – تأريخ المسرح الحديث ، نووسین جنفيف سيرو . وەرگێرانی ،د . بدرالدين القاسم وزارة التعليم العالي . جامعة دمشق ، ١٩٧٤ ، ل ،٢٤ .

٧ – سەرچاوەی پێشوو .ل ،١٨ .

٨ – أليوت– نووسینو وەرگێرانی دکتۆر فائق متي . دار المعارف بمصر ، ١٩٦٦ .هەڵبەستی–رجال الجوف–ل ،١٥٠ .

٩ – مسرح اللامعقول وقضايا أخرى .يوسف عبدالمسيح ثروة . بيروت ١٩٧٥ ، ل ، ١٠ .

١٠ – دراسات في المسرح المعاصر . نووسینی يوسف عبد المسيح ثروة منشورات مكتبة النهضة بغداد ١٩٧٢ ،ل ،١٩

١٢ – مجلة الأقلام . العدد (٥) السنة التاسعة ١٩٧٣ . العبث والحريه . مؤيد الطلال ،ل ،١٣ . ل ،٢٣٨

١٣– المسرح الفرنسي المعاصر . دکتور لطفي فام . الدار القومية للطباعة والنشر . القاهره ل ٢٣٨

١٤– سەرچاوەی پێشوو ل ، ٢٥٥ .

١٥– (أوجين يونسكو( وسی شانۆگەریی (المغنية الصلعاء . الدرس . الرباعيه)وەرگێرانی (محمد جمعه)و (محمود خجازى) القاهرة ١٩٦٤ – پێشەکیەکەی دوەرگێر–ل ،٥٣ .

١٦– تأريخ المسرح الحديث ل ، ٥١ .

١٧– دراسات في المسرحية الحديثة . نووسین . موس السوداني .منشورات وزارة الاعلام العراقية . بغداد ، ل ،١٦ .

١٨ – سەرچاوەی پێشوو .ل ٥٢ .



# پەیوەندی شانۆ بە هونەرەکانی ترەوە

نووسینی : د. کمال عيد
وەرگێڕانی : عبدالکريم محمود شێخانی

● شانۆ باوکی هونەرە . ئەم ووتەیە کە بەسەر زار و زمانانەوەیە وامان لێ دەکات بەو چاوە سەیری بکەین کە باوکی (شرعی)ی هەموو هونەرەکانە . باشە دەبێ تا کەی ئەم ووتەیە وەربگرین کە لە نێوان شانۆخوازەکان و خەڵکی تردا بڵاوبۆتەوە و بە جۆرێکی ئەوتۆ کە ووت‌وویژ لە سەر کردنی بۆتە جۆرەکات بە فێڕۆدانێك ، یان مرۆڤ تاوانبار کردن بەوەی کە نرخ و ڕاستی‌ی شانۆ نازانێت؟

شانۆ هونەرێکی باڵا و ڕەسەنە . باڵایە چونکە توانیویتی لە سەدەی پێنجەمی پێش زایینەوە تا کۆتایی سەدەی بیستەم خۆی لەبەر هونەرەکانی تردا ڕابگرێت کە بە درێژایی ئەو سەردەمە سەریان هەڵدا . هەروەها توانی ئەو مەیدانەی بکات بە هۆی پەرەسەندن و گەشەکردنی هونەرەکانی تری هاوسێ . سەرەرای ئەمە و ئەوەش لەوەدا سەرکەوت کە بیر و باوەڕی مرۆڤانە پێشکەش بە خەڵك . بە مرۆڤی ئاسایی و پاشا و ئیمپراتورەکان بکات . ئەمەش بە هۆی نووسەری بەرزەوە بوو کە شانۆ ئاراستەی کردن بۆ ئەوەی بە قوولترین ناخی مرۆڤایەتی‌دا بچنە خوارێ تا زوڵم و زۆری لەناوبەرن و بە شوێن مرۆڤ و ڕووناکی و دادپەروەری‌دا بگەڕێن .

بە تەواوی وەك (مۆریس ماتەرلینگ)ی بەلچیکایی لە دراماکەی‌دا (چۆلەکەی شین) کە بە دوای بەختیاری‌دا گەڕا ، یان وەك شکسپیر کە لە زوربەی دراما باڵاکانی‌دا بە شوێن مرۆڤایەتی‌دا گەڕا . لەگەڵ هەموو ئەوانەش‌دا ، ئێمە ناتوانین حوکمێکی ڕەهای تێ‌دا بدەین ، یان حوکمێکی ڕەهای پێ بدەین و بڵێین : شانۆ باوکی هونەرەکانە . بۆچی؟ یەکەم ، چونکە لەوەتەی هونەرەکان پەیدابوون ، هیچ هونەرێکی جێگیر یان نەگۆڕ نی‌یە . دووەمیش چونکە ناکرێت ئەو هونەرانە وەك خێزانێکی ئاسایی لە ماوەی یەك سەردەم‌دا بهێنینەوە . ئەمەش بە ڕەچاو کردنی ئەوە کە گەشەکردنی ئایدیۆلۆجی و ڕۆشنبیری . کاتێك هونەرێك دەپێچێتەوە . یارمەتی‌ی لە دایك بوونی هونەرێکی تازەی تر دەدات لە ئەنجامی خولی سروشتی‌ی مرۆڤایەتی و مێژوو . بۆ

نموونە ، تەنانەت با هونەرێکی وەك هونەری ڕۆمانتیکی زیاتر لە سەدەیەکیش لە زۆر وولاٌتدا ڕەگی خۆی داکوتابێت کە پێویست ناکات ئێمە باسیان بکەین چونکە لای هەموو کەس ئاشکرایە .

سێ‌یەمیش ، چونکە ئەو ماوە درێژەی ڕۆژگار بە درێژایی مێژوو ، لە ئەنجامی باری شارستانێتی و لە دایك بوونی،تەکنیك و ، دوای ئەوە سەر هەڵدانی هونەری جیا جیا ، بەندیواری‌یەکی پتەوی بە پەیوەندی‌ی شانۆ و بەو هونەرە سەر هەڵداوانەوە هەیە ، بەو مانایەی کە هونەرێکی وەك هونەری (ئیعلان)- کە گرنگترینی ئەو هونەرانەیە و بەندیواری‌یان بە هونەری شانۆوە هەیەو لە ڕژێمێکی گونجاوی گرنگ‌دا هەرەوەزی‌ی لەگەڵ‌دا دەکەن – نەبووە و شانۆ نەی‌زانیوە تا دوای پەیدابوونی هونەری نووسین کە لەگەڵ دەرچوونی پیت و چاپخانە لە ناوەڕاستی سەدەی پانزەهەم ، ئینجا سەرەتای سەدەی شانزەهەم دوای ئەوە سەری هەڵدا .[1] جا ئەگەر سەیرێکی ئامانجی هونەری ئیعلانیان کرد ، وەك دەروون ووروژاندن بە بەکار هێنانی هۆی هێڵکاری و نووسین و نیگار و نەخش و ڕوون کردنەوە و هونەری هێڵکاری و وێنەکێشان و چاپ‌کردن و نەخشەی ڕوونکاری‌ی سەر دیوار ، یان ماددەی جیاوازی وەك تەختە و ئاسن بۆ خزمەت کردنی ئامانجی ئایدیۆلۆجی و ڕامیاری و کۆمەلاٌیەتی و ڕۆشنبیری و هونەری . . ئایا ئەوەیان بۆ دەرناکەوێت کە هونەرێکی نوێ‌ی وەك هونەری ئیعلان لە سەردەمی شانۆی یۆنانی‌ی کۆن‌دا وەك هونەرێکی گشتی‌ی ئەمرۆ کە وای لێ بکات کار بکاتە سەر جەماوەری هاوچەرخ ، هێشتا پەیدا نەبوو بوو؟ یاخود ئایا ئەوەمان بۆ ڕوون نابێتەوە کە (برتۆلت بریخت)ی ئەڵمانی‌ی خاوەن داستان لە شانۆکەی‌دا (بەرلینر ئینسامبل) ، کە هەموو ئامانجەکانی شانۆکەی بەم ڕەگەز گشتی‌یانە هێنایە دی کە لە هونەری ئیعلان‌دا هەن؟

کە باسی پەیوەندی‌ی شانۆ بە هونەرێکی ترەوە دەکەین مەبەستمان کام هونەرە لە کاتێك‌دا کە ژمارەی هونەرەکان لە سەد هونەر تێپەری کردووە و ماوەی ناو بردنیانمان نی‌یە؟ بەلاٌم تەنیا ناوی ئەوانەیان دەبەین کە پەیوەندی‌ی زیاتریان بە شانۆوە هەیە ، وەك هونەری (تشكيلي)و (تجريد)و وێنەکێشان و پێشکەش‌کردن و نواندن و هونەرەکانی کۆمەڵ و جوولاٌنەوە و هونەری خۆیی و نیگار و سەما و باڵێ و زخرفە(زخرفة)و زەخرەفەی گەلی و کۆلێن و سێرك و سینەما و شیعر و هونەری گەل و هونەری بێ دەنگ (پانتۆمایم) و هونەری دوانگە (منصة)و ئیعلان . . . و زۆر هونەری تریش لەو هونەرانەی کە ناو بە ناو لە نێوان هونەرەکانی شانۆدا پەی‌دا دەبن و ناو بە ناویش نامێنن . بەم شێوەیە کارەکە بە ڕاستی سەرسوڕهێنەرە ، چونکە کاتێ بەرپەرچی ئەو ڕایە دەدەینەوە ، یان دەستەواژەی «شانۆ باوکی هونەرەکانە» بە باش نازانین . هەرچەندە من شانۆزانم-ئێمە بە پێ‌ی توانا و بۆ دەرخستنی ڕاستی‌ی ئەو دەربرینە بە شێوەیەکی زانیاری‌یانە و ڕاست ووت و وێژی لەسەر دەکەین ، بێ ئەوەی دوای ئەو گوتانە بکەوین کە لەگەڵ مانای دەربرینەکەدا ناگونجێن یان دانی پێ‌دا نانێن .

هەر هونەرێك لەو هونەرانە لە بار و پێویستی‌یەکی دیاری کراودا دێتە کایەوە کە سروشتی ئەو سەردەمەی هونەرەکە چاوی تێ‌دا دەکاتەوە دەی‌سەپێنێت و ، ئەو هونەرەش شوێنی خۆی دەکاتەوە تا هونەرێکی نوێ‌ی تر سەر هەڵ دەدات کە شتی نوێ بخاتە ڕوو ، و هونەری یەکەم بپێچێتەوە ، یان بیخاتە جیهانی مێژووەوە . ئەمە وەك سروشتی هەموو شتێکە ، سروشتی هونەریشە .

لێرەدا ئەو هونەرانەی پەیوەندی‌یان بە شانۆوە هەیە دەکەین بە دوو بەشەوە . هونەری زۆرکاری (جبري)و هونەری ویستکاری (إختياري) . هونەرە زۆرکاری‌یەکان ئەوانەن کە هەر دەبێت شانۆ بەکاریان . بهێنێت . تەنانەت ئەو هونەرانە تێکەل بە پێکهاتنە زمانی‌یە هونەری‌یەکەش‌ دەبن و ناکرێ وازیان لێ بهێنرێت . ئەگینا شانۆ ئەو هونەرە شانۆگەری‌یەی خۆی نامێنێت .

بەلاٌم هونەرە ویستکاری‌یەکان ئەوانەن کە دەشێ لە ناو پێکهاتنە هونەری‌یەکەی هونەری شانۆدا هەبن و لەوانەشە نەبن بە جۆرێك کە کارێکی ئەوتۆ ناکەنە سەر هونەری شانۆیی .

بەلاٌم لەگەڵ ئەوەش‌دا ، پێویستە دەست بۆ ئەوە درێژ بکەین کە سنوورێکی دیاری کراو لە نێوان هونەرە زۆرکاری‌یەکان و هونەرە ویستکاری‌یەکان‌دا نی‌یە . بەو واتایە کە لە سەردەمێکی دیاری کراودا هەن و لە سەردەمێکی تریش‌دا نین .

تەنانەت لەوانەیە کە لە یەك سەردەم و لە یەك وولاٌت‌دا دەرهێنانی شانۆیی ئاوازی

◀

هونەری گەلی بەکار بهێنێت وەك (برخت) گۆرانی ی ناو بازار و کۆمەڵە کۆرالی یەکانی بەکار هێنا ، کەچی دەرهێنانێکی تری شانۆیی نایەوێت سوود لەو ووزە و توانا فۆلکلۆری یانە وەرگرێت . تێك چرژان و دژایەتی لە هونەری شانۆدا لەمەدا خۆی دەنوێنێت ، ئەو تێك چرژان و دژایەتی یە کە بوونی شانۆ دەوڵەمەندتر دەکات و دەیکاتە مەتەڵێکی هەمیشەیی .

• هونەرە زۆرکاری یەکان :

لە واقیعی سەرنجدانی هاوچەرخ و بایەخ دان بە مێژوو ، و لقەکانی ، ئەم هونەرانە دەکرێن بەم بەشانەوە :

**أ – هونەری دیکۆر و دیمەنە شانۆیی یەکان :**

ئەمرۆ لە سەدەی بیستەمدا ناتوانین هونەری دیکۆر و دیمەنە شانۆیەکان بخەینە پشت گوێ . دەزانین کە دیمەنی شانۆیی لە شانۆی یۆنانی ی کۆن و پێش ئەویش لە سەردەمە بەردی یەکاندا ، بایەخێکی ئەوتۆی نەبووە . وێنە ئیسپانیایی یەکانی سەردەمە بەردی یەکان کە دۆزراونەتەوە رووداوی راوشکار و وێنەی مرۆڤ و گیانەوەر پێکەوە بە قەبارەیەك کە لە نێوان ١٠–١٥ سانتیمەترادایە دەردەخەن و هەروەك دیمەنێکی شانۆگەریش رووداو و جوولأنەوە و چالاکی و دەربڕینی تێدایە ، جا ئەمە هی ژنان بێت لە کاتێك دا کە خەریکی جل و بەرگ دروون و بەروبووم کۆ کردنەوەن ، یان هی ئەو پیاوانەی کە خەریکی راوە ئاژەڵ و راوە ماسین . بۆ نواندنی رووداوەکەش لەو ئەشکەوت و بناری ئەو شاخانەدا خۆیان ئامادە دەکرد کە مرۆڤ کردبووی بە یەکەم شوێنی نیشتەجێی خۆی پێش قۆناغی کشتوکاڵ و جێگیر بوون . لە شانۆ سەرەتایی یەکانی بەرایی ئیغریقی (گریکی)دا نواندن بە رۆژی رووناك لە شانۆیەکی ئاوەڵادا دەکرا کە جێگەی سی هەزار بینەری تێ دا دەبووە و بێ دیمەن و دیکۆری شانۆیی و بێ رووناکیش بوو .

هەروەها دەزانین لە سەردەمی تازەماندا شانۆی (برسی گرۆتفسکی)ی پۆڵەندی نەترسانە تاقیکاری یەکەی خۆی بە ناوی (بەرە و شانۆیەکی هەژار)(2) بەکار هێنا ، ئەو شانۆیە سەیرەی کە وازی لە دیکۆر و جلی شانۆیی هێنا و زۆر جاریش وازی لە هونەری مۆسیقا و بایەخە زۆرەی بە توانای ووشە و هاوکاری کردنی لەگەڵ جوولأنەوەی لەشی ئەکتەرەکانیش هێنا .

لە نێوان ئەو تاقی کردنەوە تازانەدا– ئەوانەی کە ئەوەندەیان پێ نەچوو لەناوچوون یان بڵێین شاردرانەوە– باسی شانۆی چاپخانە و شەقام و گەراج و (بەدرۆن)مان گوێ لێ دەبێت کە ئەوانیش ئەوەندە گوێ نادەنە دیکۆر ، یان دیمەن ،ئەمەش بە هۆی سروشتی ئەو شوێنەی نواندنەکەی تێ دا روو دەدات ، یان بە هۆی ئەوەی کە ناتوانرێت دیکۆر بە شێوەیەکی هونەری جێ بەجێ بکرێت .

هەروەها ئەوە باس دەکەین کە شانوی شکسپیری یان (ئەلیەزابیثی)سەبارەت بە دیکۆر یان دیمەنەوە بەرەو نیشانە یان(رمز)ەوە چوو . پێویستیش بوو کە وا بکات ، بە تایبەتی لە شانۆگەری یەکانی ولیەم شکسپیردا کە دیمەنی تێ دا یەك لە دوای یەك دێن وەك دیمەنەکانی سینەمای ئەمرۆ ، بە شێوەیەکی سەرسوڕهێن دیمەنە شانۆیی یەکانی جیا و هەموو جۆرن ، لە شەقامێکەوە بۆ کۆشکێك ، بۆ شوێنی خەوتن ، بۆ مەیخانەیەك ، بۆ مەیدانی شەڕ ، بۆ گۆڕێك ، یان بۆ قەڵایەك وەکو لە شانۆگەری یەکانی (قەیسەر و کلیۆپاترا ، ئۆتێللو «عطیل» ، ماکبث و ، رۆمیۆجولیت)دا دیارە .

پێویستە ئەوەش بڵێین کە دیکۆر لە نێوان ئەو سەردەمانە و لەناو شانۆ و شانۆگەری یەکاندا وا بەرجەستە نەبووە کە لەم دوایی یە لە شانۆی سروشتی ، یان رۆمانتیکی ، یان شانۆی واقیعی ، یان کۆمەڵایەتی دا دەی بنیین . لە شانۆی سروشتی دا لای (ئەندریا ئەنتوان) چاومان بە ووردترین دیمەنی دوکانی قەساب دەکەوێت ، و بەڵکو کارە شانۆیی و ئێکسواری یەکان وامان لێ دەکەن کە تەنانەت ئەو دڵۆپە خوێنانەش بەدی بکەین کە ناو بەناو لەو لاشە گۆشتە دەکەونە خواری کە لە شوێنێکی دیاری سە تەختەی شانۆکەدا هەڵواسراوە . لە شانۆی ڤیکتۆر هۆگۆی رۆمانتیکیش دا دەبوایە دیکۆرێکی ووردی ئەوتۆ هەبێت کە (مذهب)ی رۆمانسی ی پێوە دیار بێت . ئەی ئەگەر وا نەبێت چۆن لە شیعر و شاعیریەت دەگەین لە دیمەنی بەپێك گەیشتنە شارراوەکەی درامای (سیرانو دی بەرجراك)ی شاکاری ئەدمۆند رۆستان؟یان ئایا مەکسیم گۆرکی ساڵی ١٩٠٢ لە شانۆگەری یەکەی دا «چلپاو»زۆر بە ووردی سەیری هەژارە کلۆڵەکانی نەکردووە کاتێك بیست کلۆڵ لە ژوورێك لە ژێر زەبری قامچی کۆستیلۆڤی بۆرژوازی و ژنەکەی لە شانۆیەکی راستی واقیعی ی راستەوخۆدا دادەنێت؟لەم بابەتەش لای باوکی شانۆی کۆمەڵایەتی ی نەرویجی (هەنریك ییس)بە هەموو ووردەکاری یەکەوە هەیە ، بە تایبەتی لە هەردوو شانۆگەری یەکەی دا(ماڵی نۆرای بووکە شووشە)یان (سۆلنسی گەورەی

دروست کردنی بارودۆخێکی ڕێکوپێك بوو بۆ پەیدابوونی مرۆڤی سۆپەرمان ، بڕوای بەوە کە ژن پیاو داگیرئەکاو ژیانیش تەنیا بۆ خۆشەویستی ئەو ئەڕوات‌و هەموو کچێك حەزی لە شووکردنە بە مەبەستی ئەوەی ببێتە دایك‌و ئەمەش بناغەی یاساکانی سرۆشتە . بەڵام (تانیر) لەبەر جوانیەتی ئافرەت خۆی پێ نەئەگیرا و لە هەمان کاتیشا دژ بە ژن‌هێنان ئەوەستا ، چۆنکە ئەم مەسەلەیە ، وەکو ئەو بیری لێ دەکردەوە . ئەبێتە هۆی لا واکزوکردن‌و کپ‌کردنەوەی بیرکردنی . .

(ئۆکتاف) هەتا بلێ (ئان)ی خۆشەویست بەڵام ئەم حەزی لە (تانێر) بوو بۆیە وای لە باوکی کرد ، لە پێش مردنی‌دا ، (تانێر) ببێتە وەصی . . (تانیر) نەیئەزانی (ئان) خۆشی‌ئەوێ و لای وابوو حەزی لە (ئۆکتافە) ، بەڵام بەهۆی شۆفێرەکەی ئەم مەسەلەیەی بۆ ڕوون‌بووەوە ، بۆیە (تانیر) بەرەو ئیسپانیا ڕا ئەکات‌و لە ڕێگەدا تووشی کۆمەڵێکی ڕێگر ئەبێ سەرۆکی ڕێگرەکان ماوەیەك پێش ئێستا لە ئوتێلێکدا ئیشی ئەکرد بەڵام لەگەڵ یارەکەی تێك‌چوو و ڕێگەی جەردەیەتیی گرت‌و لە دوایی‌دا بۆمان ڕوون‌ئەبێتەوە کە ئەو کچە خوشکی شۆفێرەکەیە . . لێرەدا (تانیر) تەسلیم ئەبێ‌و لە خەودا ئەمانباتە دۆزەخ لەگەڵ خۆی‌دا و لەوێ (دۆن جوان تینوریو) بە شێوەی (جان تانیر) ئەبینین‌و (دۆنائانا) بەو دەم‌وچاوە جوانە (ئان وایتفیلد) مان بیرئەخاتەوە و پەیکەری سوارەکەش دەروەکەوی‌و شەیتانەکانیش وەك (رامسدین) و سەرۆکی جەردەکان دێنە بەرچاو . . بەڵام ئەم دۆزەخە کە (شۆ) وێنەی ئەکێشێ جێگەی سزادان نی‌یە بەڵکو شوێنی خەیاڵ‌و ڕابواردن‌و کردەوە پیسەکان‌و هەموو ئەم کردەوە خراپانەن کە مێشکی بەکار قبووڵیان ناکات ، ئەمە لە کاتێکدا کە بەهەشت جێگەی گەورەکانی ژیان ئەبێ ، لێرەدا دانەر بە هێزە زندووەکان هەڵئەداو هیچ سنوورێك لەنێوان ئەم دوو جیهانەدا بەوی ناکرێ ، هەر چەندە هەر یەکێکیان ڕێبازێکی تایبەتی خۆی هەیە لە ڕوانینا . . سوارەکە لە بەهەشتا بێزارەو پێ خۆشە دابەزێتە دۆزەخ ، دۆن جوانی تێر لە ڕابواردن و خۆشی مەیلی بەهەشتی هەیە . . لێرەدا گفتوگۆیەکی زانستی‌یانە دەست‌پێ‌دەکرێ و بەرامبەر بە شەتیان ئەوەستێ . بەڵام شەنیان لە قسەی خۆی نایێتە خواری‌و دەربارەی پێشکەوتن‌و مرۆڤی سوپەرمان ئەدوێن . . شەیتان هەر چەند ئەکا دۆن جوان لای خۆی بهێڵێتەوە پێ ناکرێ . . دۆن جوان لە چنگی شەیتان دەربازدەبێ‌و (دۆنائانا) ش لە بڕیاری خۆی ناگەڕێتەوەو دان بەوە نانێت کە ڕۆڵەکەی وەك دایکێك تەواو بووە چونکە مرۆڤی سوپەرمان هەتا ئێستاکە نەهاتووەنە دونیاوە . هەر لەو کاتەدا خەونەکە تەواو دەبێ‌و (تانیر) خەبەری ئەبێتەوەو (ئانا) دەچێتە ژووری‌و(ئوکتاف) یش دێت‌و هەندێ سەرباز لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێکانیان بۆ گرتنی ڕێگرەکان پەیدا دەبن . . بەڵام (تانیر) هەموویان لە گرتن ڕزگار ئەکا . . کۆمیدیاکەش لە شاری (غرناتە) کۆتایی پێ‌دێت . (دۆنا ئانا) شوو بە ئوکتاف ناکات چۆنکە دایکی پەیمانی بە(تانیر) داوە . لێرەدا گفتووگۆیەکی تیژ لەنێوان (تانیرو کچەکەدەست‌پێ‌دەکرێ‌و لە دوایی‌دا (تانیر)تەسلیم دەبێ‌و ماچی‌ئەکاو لەبەر ئەوەی کۆمەڵێك لە هاوڕێکانی چاویان لێ دەبێ بۆیە ناچارئەبێ بیخوازێ .

دۆن جوانەکەی (شۆ) جیاوازی‌یەکی زۆری لەگەڵ دۆن جوانە ڕەسەنەکەدا هەیە . . دانەر دەربارەی قارەمانەکەی لە پێشەکی شانووگەریەکەدا دەڵێ : شۆبنهاوەرو نیتشەم خوێندەوەو ئەوەی بیری لێ ئەکەمەوە دوارۆژی مرۆڤە نەك سەربەستی ئارەزووەکان . . دۆن جوان لێرەدا لە (هاملت) نزیکە نەك لە دۆن جوانە لاسایی‌یەکە . .(شۆ) بەراورد ئەکا لەنێوان سۆپەرمانی سەردەمی ڕاپەڕینەکە– ئەو مرۆڤە کە ژیانی خۆی بۆ پەرستنی تاك تەرخان‌کردبو– و مرۆڤ لە سەدەمی نۆزەهەم‌دا – ئەو مرۆڤە کە تیوری داروێن کاری تێ کردبوو –(داروێن) کە بیروڕای بەرەی ئادمیزادی خستە جێی بیروڕای تاك‌دا . ئافرەتیش بەوە جیاکراوەتەوە کە هەوڵ نادا خۆی بفرۆشێت‌و منالی ببێ بەڵکو بۆ مانەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی تێدەکۆشێت . . ئەم ئارەزووە سەرەتایی‌یە وای لێ کردوە لە بیروراکانی پیاو بەرزتر بێت . .

لەم کۆمیدیایە زۆرانبازیەکی نێوان دانەر و جەماوەرە بۆرجوازیە بریتانیەکە ئەبینین و ئەم زۆرانبازیە کۆرتەی ناوەڕۆکەکەی شانۆی (شۆ) خۆیەتی‌و بەرامبەر بە لێ‌هاتوویەکی وەك دۆن جوان وا هەست ئەکەین کە دانەر نەیەوێ جیهان‌و بیرواری درۆزنەکان بڕۆخێنێ‌و ناکۆکی بخاتە دەروونیاو . . بیروڕای پەیدابوونی مرۆڤی سۆپەرمانیش بیروڕایەکی ڕەسەنەو هەر لە بناغەوە پەنجە بۆ [illegible] بیروڕا سەربەستەکان ڕائەکێشێ . جگە لەوەش کە بیروڕایەکی بێ‌سنوورە، ئازاری ڕەخنە لە خۆگرتن [illegible] .

**لە گۆفاری (اداب المعاصرە)**
**ژمارە ١ ساڵی ١٩٧٦ وەرگێردراوە**

# ئۆجین

(ئۆجین یۆنسکۆ) بەیەکێك لە هەرە نووسەرە بەرزەکانی قوتابخانەی بێهوودەیی هیچ و پووچ دەژمێرێت . ئەم نووسەرە لەساڵی (١٩١٢) دا لەڕۆمانیا لەدایك بووە . لەتەمەنی دوو ساڵیدا بنەماڵەکەیان

ووڵاتی ڕۆمانیا بەجێ دەهێڵن و بەرەو ووڵاتی فەرەنسە دەکەونە ڕێ . یۆنسکۆ لە قوتابخانەکانی فەرەنسە دەستی کرد بەخوێندن .

لەدوایی‌دا گەڕایەوە بۆ ڕۆمانیاو لەساڵی (١٩٣٦) دا بوو بەمامۆستای زمانی فەرەنسی لەشاری (بۆخارست) . دوو ساڵ بەدواوە بەیەکجاری گەڕایەوە بۆ فەرەنسا . لەوێ دەستی کرد بەئامادەکردنی باسی دکتۆرایەك . بەڵام لەدوواییدا دەس بەرداری بوو . یۆنسکۆ کاتێك کە منداڵ دەبێت ڕووداوێك دەبینێ و وای لێ‌دەکات کەهەرگیز لەیادی نەچێتەوەو خۆی بەسەر بیرو مێشکی‌دا بسەپێنێت ، یۆنسکۆی منداڵ لاوێکی باڵابەرز دەبینێت کە پیاوێکی پیرەمێردی کەنەفتی پەك کەوتە دەداتە بەرشەق و بەر شەپازللە . ئەم ڕووداوە وا لەیۆنسکۆ . . کات کە بڕوا بەبێ هوودەیی و ناماقوڵی ژیان بهێنێت .

## ژنەگۆرانی بێژی سەربێ تووك

یۆنسکۆ هەرگیز لەبیری ئەوەدا نەبوو کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێت بە شانۆیی نووسێك . بەڵکو زۆر قینی لە خوێندن و بینینی شانۆ دەبووەوە . وەك ڕێکەوتێك لەساڵی (١٩٤٨)دا لەتەمەنی (٣٦) ساڵیدا شانۆیی – ژنە گۆرانی بێژە سەرڕووتاوە – کەی نووسی . یۆنسکۆ ویستی فێری زمانی ئینگلیزی ببێت .

بۆئەم مەبەستە پەرتووکێکی بچووك دەربارەی دەمەتەقێ و دووان دەکڕێت . کە خوێنەر فێری زمانی ئینگلیزی دەکات . ئەم فەرهەنگە بچووکە بریتیە لە دەربڕینی ئەو ووشەو ڕستانەی کە خوێنەری سەرتایی فێری زمانی ئینگلیزی دەکەن یۆنسکۆ دەستی کرد بە تۆمارکردنی چەند ووشەو ڕستەیەکی پەرتووکەکە . . جێ‌ی سەرسوڕمان ئەوەبوو ، بۆی دەرکەوت کەوا هەفتە حەوت ڕۆژەو زەوی لەژێر



پێیاندایەو بن بیچ لەبانی سەرمانەوەیەو گەلێ شتی سەرسورهێنەری دیکەی لەم بارەیەوە . . کەگوایە ئێمە وەك شتێکی ئاسایی سواو بەکاریان دەهێنین‌و بەسەریاندا دەڕۆین بەبێ ئەوەی هەست‌و هۆشیان برووشێنین .

لەدوای وانەی سێیەم نووسەری فەرهەنگەکە دیالۆگی نێوان (مستەر سمیت) و ژنەکەی (مەدام سمیت) دەخاتە روو . بێگومان مەبەستی نووسەری فەرهەنگەکە سەرروتاوە)کە کەوا (مستەر سمیت)و (مەدام سمیت) وەك دوو کەس بیرو هۆشی خۆیان وون کردبێت . دەس دەکەن بەقسەو دوانی هیچ‌و پووچی پچر پچڕو بێ سەرو بن . لە شانۆگەریەکەدا(مستەر سمیس (لەباتی ئەوەی بڵێت حەفتە حەوت ڕۆژە ، دەڵێ سێ ڕۆژە ئەویش سێ‌شەممەو پێنج شەممەو سێ شەممەیە! بنەماڵەی سمیت‌و بنەماڵەی مارتن ئاشنای یەکترن . بەڵام لەشانۆییەکەدا دەبینین یەکتر کۆتایی بۆ شانۆییەکەی دەستنیشان کرد . یەکەمیان کە لە گەرمەی شەڕەکەدا کارەکەرەکە بێت‌و پێیان‌را بگەیەنێت کە خواردنی شێوان ئامادەکراوە . بەم شێوەیەش هەموو جۆبلاوی لێ‌بکەن‌و بکشێنەوە . لەنێو خەڵکی بینەرانیشەوە دوو سێ کەس ڕاپەڕن‌و بێنە سەر شانۆو بەرهەڵستی ئەم شانۆییە ناماقوڵە نابەجێیە بکەن . لەوکاتەیش‌دا بەڕێوەبەری شانۆو دوو ئافسەری پۆلیس‌و چەند سەربازێك

# یۆنسکۆ

بەشی دووەم

معتصم ساڵەیی

ئەوەیە کە خوێنەر بەچەند ووشەو ڕستەیەکی ئینگلیزی ئاشنا بکات‌و هیچی تر . وەك ئەو ڕستانەی کە ژنە بە پیاوەکەی دەڵێت کەگوایە چەند منداڵێکما هەیەو ، لە دەورو بەری شاری (لەندەن)دا دادەنیشین ، یاخود دەڵێت مێردەکەی لە کارگەیەکدا نووسەرە وەیاخود کارەکەرێك‌و دوو ئاشنایان هەیە کە (مسیۆ مارتن) و (مەدام مارتن) ی ژنیەتی . گەلێ ڕستەی تر لەم بارەوە کەمەبەست ، فێرکردنی خوێنەری سەرەتاییە .

(یۆنسکۆ) زۆر بەسەر سورمانەوە ڕوانیە فەرهەنگەکەو بڕیاری ئەوەی دا کەوەك نووسەری فەرهەنگە ئینگلیزیەکە ، شانۆگەریەکی ڕستە پچڕ پچڕاوی بنووسێت . بەم شێوەیە دوابەدوای خوێندنەوەی فەرهەنگەکە دەستی کرد بە نووسینی یەکەم شانۆیی ناماقوڵی خۆی ، کەبەناوو نیشانی (ژنە گۆرانی بێژە ناناسنەوە وەك تووشی نەخۆشی‌ی لەبیرچوونەوە هاتبێتن .(مستەر سمیت باسی مردنی (بۆبی واتسون) دەکات ، بەڵام کەسیان نایەنسنەوە کەگوایە سێ لەسەر چواری شار بە پیاوو ژن‌و منداڵو سەگ‌و پشیلەوە هەمان ناو هەڵدەگرن! لەناکاو پیاوێکی کوژێنەوە دێتە سەرشانۆو باسی ئەوە دەکات کە گوایە گایەك گوێرەکەیەکی بووە ، مشکێکیش چیایەکی بووە . . ! لەدواییدا داوای ماڵ ئاوایی دەکات لەبەرئەوەی گفتی هەیە لەگەڵ ئاگرێکداو ، سێ‌ڕۆژەلــــە ڕۆژژمــــێرەکــــەیدا نووسیویەتەوە . . بەم شێوەیە هەموو کەسانی‌ی شانۆییەکە بەقسەی پڕوپووچ‌و بێ ماناو لابەلای‌ی ژەنگ گرتوو دەدوێن . لەکۆتایی شانۆییەکەدا بەیەکدا چوونێکی بێهۆو بێانا لەنێوان خێزانی بسمیت‌و مارتن ڕوودەدات . . بەڵام چۆن بەم شەڕە کۆتایی بە شانۆییەکە بێت؟ نووسەر دوو سەربکەونە سەر شانۆو ئەو دوو سێ یاخی بووە بدەنە بەرگوللەی دەمانچەو بیانکوژن . لە ئاکامی ئەم کارەیش بەڕێوەبەری شانۆ سوپاسی خۆی بەرامبەر بەم کارەی ئەفسەری پۆلیس ڕابگەیەنێت ، کە گوایە ئەم کارەی وانەیەك پێك دەهێنێت‌و ، ڕێ نایی بینەران دەکات تا پارێزگاری‌ی داب‌و دەستوور بکەن . لەپاش ئەمەیش سەربازەکان داوای چۆڵ کردنی هۆڵەکە لە بینەران بکەن ، پەردەیش دابدرێتەوەو کۆتایی بە شانۆییەکە بێت . ئەم کۆتاییە لای نووسەر زۆر گران بوو ، لەبەر ئەوەی دەبێت پارەی حەوت هەشت کەسێك بدرێت بۆ سێ دەقیقەیەك . بۆیەوای بەباش زانی کە لە کاتی شەڕو هەلچوونەکەی نێوان دوو خێزانەکەدا کارەکەرەکە بێت‌و هاواریان لێ‌بکات‌و بڵێ«ئەوە نووسەری شانۆییەکەیە»و ئاکتەرەکان بە دوو ڕیز بە چەپڵەڕێزان

پێشوازیی دانەربکەن . کە بە توندو تیژییەوە بەرەو بینەران دەبێتەوەو دەستی ڕادەوەشێنێتو هاوار دەکات «ئەی گەلحۆینە! لەچنگم ڕزگارتان نابێت!» داواییش پەردە دادەدرێتەوە . بەلام هەردوو ئەم پێشنیارە لەلایەن دەرهێنەرو ئاکتەرەکانەوە پەسەند نەکران . لەپاشاندا لەسەر ئەوکۆتاییە پێك هاتن . کە لەکاتی شەڕی نێوانی دوو بنەماڵەکەدا پەردە دابدرێتەوە ، دوایش دووبارە پەردە لەسەر سەرەتای شانۆییەکە هەڵبدرێتەوەو ئاکتەرەکان دەوری برگەکانی سەرەتای شانۆییەکە بگێڕن . . . بەم شێوەبەش بینەر هەست بە مۆرکی بێهوودنی بکاتو . لەوە بگات کە لە بازنەیەکی داخراوی بۆشدا دەسوورێتەوە .

لە کاتی پرۆڤەکردندا کێشەی ناوونیشان بۆ ئەم شانۆییە هەدەدەد. ناوو نیشانێکی بۆ شانۆییەکەی هەڵبژارد وەك : (کات ژمێری ئینگلیزی)و (بەشی وانەی ئینگلیزی)و(شێت بوونی بیگ بەن . . .) . هیچ کام لەم ناوو نیشانانە جێی ڕەزامەندیی دەرهێنەری شانۆگەریەکە نەبوو ، بەرهەڵستیی کرد بەوبیانووەی کە لەوانەیە وا لێکبدرێتەوە کە مەبەستی ئەم شانۆییە تەڵفیی کردنە بە کۆمەڵگای ئینگلیزی . لە کاتی پرۆڤەدا ئەکتەرێك زمانی وەرچەرخاو بە هەڵە لەباتی ئەوەی بڵێت (مامۆستاژنی قژزەرد ووتی(ژنە گۆرانی بێژی سەر رووتاوە- ، نووسەر هاواری لێ بڵندبووەوەو ووتی «دۆزیمەوە! .)بەم شێوەیە ناوونیشانی یەکەم شانۆیی ناماقوڵی «ئۆجێن یۆنسکۆ داندراو ، لەساڵی (١٩٥٠)دا بینەرانی فەرەنسی بۆیەکەم جار لەسەر تەختەی شانۆ بینیانو پێشوازییەکی مام ناوەندیان لێکرد . کاتێك کە پرسیاریان لە نووسەر کرد بۆچی ناوونیشانی (ژنە گۆرانی بێژە سەررەووتاوەکە)ی بۆ شانۆییەکەی هەڵبژرادووە؟ لەوەلامدا ووتی :(چونکە لەشانۆگەریەکەدا نەژنە گۆرانی بێژێك هەیەو نەسەر ڕووتاوەو قژێکیش! ئەم هو/یەش بەسە بۆ هەڵبژاردنی ئەم ناوو نیشانە!)(١٣)

### وانەی هیچوپووچی

لەساڵی (١٩٥١) دا دووەهەم شانۆگەریی یۆنسکۆ بەناوو نیشانی (وانە =دەرس) خرایە سەر شانۆ . شانۆگەری ناماقوڵی یۆنسکۆ دەیەوێت ئەوەمان پێ بسەلمێنێت کە هەموو شت بەبێ ئامانج لە گێژاوەیەکی خڕدا بەبێ هوودەیی دەسوورێتەوە .

تێکڕا شتەکان بێماناو بێ سەرو شوێنن . بێگومان دەمو دووو وتو ێژو قسەکردنیش ، لە شتەکانی تر ماناداتر نین ، بەڵکو هەروەك هەموو شتێکی کە لەم بوونەدا بێ ماناو سواوو ژەنگاوین . بەڵکو زمان بریتیە لە چەند ڕستەو برگەیەکی پووچەڵی سواوی کلێشەدار ، کە هەردەم بەبێهوودە بەکاریان دەهێنین لەژیانی ڕۆژانەماندا نووسەر لە شانۆیی (وانە)دا تەقەلاو کۆشش دەکات لەپێی/ناوی ڕووخاندنو تێکشکاندنی زمان ، بەو بیانووەی کە گوایە زمان لە ژیانی ڕۆژانەماندا دەوری کاری گەری خۆی نابینێت ، وەك ئامرازێك بە مەبەستی لەیەك گەیشتن . لەم شانۆ/یەدا مامۆستایەك وانە بە کچە قوتابییەکی دەڵێتەوەو ، هەرچەند دەکاو دەکۆشێت ناتوانێت کارەکەی بەجێ بگەیەنێتو وا لەوکچە قوتابیە بکا . تا لێی تێ بگات . بە دڵ شکستیەوە بەقوتابیەکەە دەڵێن «خانم دەنگەکان . دەبێت باڵەکانیان لەکاتی فڕیندا ببەستین . . تانەکەونە سەر گوێیە کەڕەکانەوە» .

هەموو هەوڵدانی مامۆستاکە بێهوودە دەبێ . گەلێ ڕستەو برگەو ووشەی سەیر سەیرو پچڕ پچڕو هەڵبزرکاو دەهێنێتەوە بەبێ ئەوەی ئەو کچە قوتابیەی لێیان تێبگات . لە کۆتایی شانۆییەکەدا مامۆستاکە بە چەقۆیەك . تەمسیلیانە . قوتابیەکەی خۆی دەکوژێت . .

### کورسییەکان

لە حوزەیرانی ساڵی (١٩٥١) دا یۆنسکۆ سێیەم شانۆیی بەناوی (کورسیەکان) نووسی ناوەڕۆکی ئەم شانۆییە هەر ئەو بیرو باوەڕە بێهوودەیی‌یەی نووسەر دەردەبڕێت ، کە گوایە زمانو قسەو ووتو وێژ نەزۆكو پووچەڵو بێمانان . نووسەر دەیەوێت پێمانڕا بگەیەنێت (جاگەر زمان پووچەڵ بێت چۆن ڕامان دەگەیەنێت ! ؟) کەئەو هەموو قسانەی دەیانکەین جێوڕیی خۆیان ناگرنو کەسیش لێمان تێناگات . ئێمە گەر بکەوینە قسەوە وادادەنێین کە بۆ کۆمەڵێك دەدوێین ، بەلام لە ڕاستیدا وانیەو ، جگە لە خۆمان زیاتر کەسی کە لێمان تێ ناگاتو کەسیش لێمان حاڵی نابێت ، کەچی دەڵێینو مەبەستمان چییە . . ! گەر زمان ئامرازێکی کاریگەر بێت بۆ دارشتنو هەڵسانەسەرپیی هەموو بابەتێکی ئەدەبێ ، ئەوە بە پێچەوانەوە زمان لەم شانۆگەیەیدا دەوری خۆی دەبینێت . شانۆگەیی (کورسیەکان) دەربارەی خێزانێکە کە لە دوو پیری پەككەوتە پێكهاتووە . هەردووکیان بە گۆشەگیری لە نێوەڕاستی دوورگەیەکی بچووکدا دەژین . لەم شانۆگەریەدا ئەم دووپیرە دەیانەوێت ئاهەنگێکی گەورە بگێڕنو ، میوانی

خەیالییش لە هەموو چین و دەستەیەك ، تەنانەت ئیمپراتۆریش بۆ ئەم ئاهەنگە بانگ کراون هەردووکیان پەیتا پەیتا کورسی بەتاڵ لەسەر شانۆ ڕیز دەکەن بەرادەیەکی هەموو جوولەیەکیان لەکاردەکەوێت . لە کۆتاییدا ووتاردەر دێتە سەر شانۆ کە هەوای ڕزگارییە بۆیان ، بە ووتاردەریان و ڕاگەیاندووە کە پەیامێك بۆ ڕزگاریی گشت مرۆڤایەتیە دەبێ بەخەڵکی ڕابگەیەنێت . هەردووکیان لە بانێکی زۆر بەرزەوە دا خۆیان فڕێ دەدەنە خوارەوەو دەڵێن «بژی ئیمپراتۆر» .

دوای ئەوە «ووتار دەر» بەرامبەر کورسیە بەتاڵەکان ڕادەوەستێت . دەم دەکاتەوە تا شتێك بڵێت ، لاڵ و پاڵ دەبێت و دەردەکەوێت کە هەم کەڕەو هەم لاڵە . پەردە پێوەدەدرێت . یۆنسکۆ وێنەی کەسانی شانۆگەریەکەی کێشاوە کەدەیەوێت بەزمانی یەکێکیانەوە بڵێت مرۆڤ «تەنهایە ، گۆشەگیرە ، بەزارەدارە ، هەتیوە . . تا مۆخەکەی هەست بە هەتیوی دەکات» یاخود دەربارەی قسەو وت وو یژو زمان بڵێت «زۆر گرانە ئاتەوەی هەمە دەری ببڕم . . بەڵام پێویستە هەموو شتێك بڵێم» مەبەستی سەرەکیی هەرەگرنگی نووسەر ئەوەیە کەگوایە ، هەموو شتێك لە بووندا وەك ئەو کورسیانە بەتاڵن و بۆشونی هەموو پەیامێك و بیروباوەڕێکیش وەك پەیامی دووپیرەکە بێ ئاکام و بێ ئەنجامە هەموو قسەو وت وو یژو دەربڕینێکیش وەك دەربڕینەکەی «ووتاردەر»ەکە بوونیان نیە .

(یۆنسکۆ) لەساڵی (١٩٥٣) دا یەکەم شانۆیی درێژی خۆی بەناوونیشانی (ئەمیدێ) وە نووسی دەربارەی ژن و مێردێك کە لە ناوەڕاستی تەمەنیاندان . پازدە ساڵ بەسەر ژن و مێردا یەتیاندا تێپەڕیوە ، دووره پەرێزی و گۆشەگیریان لە ژیانیاندا گرتۆتەبەر . لەسەردەمێکی کۆندا شتێك لە نێوانیاندا مردووەو لاشەکەیشی (لەوانەیە مەبەست لەو تەرمە خۆشەویستیەکەیان بێت ؟ !) لە ژوورێکی ئەودیویانەوە ڕۆژ بەڕۆژ لە زیادبووندایەو ، نێوەندی ئەو شوێنەیشی بۆگەن و پیس کردووە . ڕۆژێك لەرۆژان لاشە زەبەلاحەکە زیاتر دەئاوسێت و دەرگای ژووری دانیشتن دەشکێنێت . بۆئەوەی لەوتەرمە ڕزگاریان بێت ، پیاوەکە لەگەڵ خۆیدا هەڵی دەگرێت و بەرەو جۆگەلەکەی دەرەوەی دەبات . ئەوەی جێی سەرسوڕمانە لە ڕێگەدا لاشەکە دەبێت بە بالۆنێك و پیاوەی مێردە لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت .

## کەرکەدەن

نووسەر شانۆیی (کەرکەدەن)ی لە ساڵی (١٩٦٠) دا نووسی ، ئەم بەرهەمەی دەنگ و سەدایەکی زۆر بەربڵاوی دازە . لە پاریس و لەندەن خرایە سەرشانۆ . یەکەم جار (جان لویس بارو) دەری هێنا ، دووەم جاریش (ئۆرسۆن وێلز) دەری هێناو ئەکتەری بەناوبانگ (لۆرەنس ئۆلیڤێ) دەوری تێدا بینی . کورتەی شانۆیەکە ئەوەیە کەخەڵکی شارێکی بچووك تووشی گرفتێك دەبن ، گرفتەکەیش ئەوەیە هەموو ئارەزووی ئەوە دەکەن ببنە ئاژەڵی ( کەرکەدەن) . بەم شێوەیەش هەموو خەڵکی شار دەبن بەو ئاژەڵە گەورەیە ، تەنها یەك کەس یاخی دەبێت ، نایەوێت ببێت بەو ئاژەڵە ناقۆڵایە . لە کۆتاییدا کەئەو تاکە کەسەیش دەیەوێت وەکو خەڵکی تر ببێت بەو ئاژەڵە ، بۆی دەردەکەوێت ناتوانێت بگۆڕێت ، لەبەر ئەوەی چارەنووسی لەوەدایە کەدەبێت بە ئادەمیزادەیەتیی خۆی بمێنێتەوە .

یۆنسکۆ بیری ئەم شانۆگەریەی لە زمانی نووسەری هاوەڵی (دنیس دێ ڕۆجیمۆنت)ەوە وەرگرت . ئەم نووسەرە بۆ یۆنسکۆ دەگێڕێتەوە کە لە ساڵی (١٩٣٨) دا لە (نۆرمبێرگ)ی ئەڵمانیدا چاوی بە خۆپیشاندانێکی نازییەکان دەکەوێت . لەگەڵ خەڵکیی خۆپیشاندەراندا چاوەڕوانیی (هیتلەر) دەکات ، دوای چاوەڕوانیێکی زۆر (هیتلەر) بەخۆیی و دارو دەستەباوەڕ دەردەکەوێت ، خەڵکیش هیستیریا دەیان گرێت وەك نەخۆشیەك بەبێ ئاگاییەکی تەواو هەموو دەس دەکەن بە چەپڵە لێدان و هوتاف دان . لەسەر باسەکەی دەڕوات و دەگێڕێتەوەو دەڵێت کە خەڵکی پەیتا پەیتا زیاتر دەس دەکەن بە هات و هاوارو چەپڵە کوتاندن بۆ ئەو کابرا نیوە شێتە گەمژە چەنە بازە . ئەمیش تووشی ڕاڕایی و دڵەکوتێ دەبێت لەنێو ئەو حەشاماتەدا هەست بە گۆشەگیری دەکات و موچڕکە بە لەشیدا دێت و تووکی سەری ڕەپ دەوەستێت ، دەرك بەمانای ئەو ووتەیە دەکات کە پێی دەڵێن (هیچ وپووچیەکی پیرۆز) لە ئاکامیشدا دەتوانێت خۆی ڕابگرێت ، تاکو لەگەڵ ئەو لێشاوە گەمژەییەدا ڕانەماڵدرێت ، بەو شێوەیەش پارێزگاری لە سروشتی مرۆڤایەتیی خۆی دەکات باسی ئەم بەسەرهاتە بووە زادەی بیری شانۆییەکەی (کەرکەدەن) .

(یۆنسکۆ) دەیەوێت ، ئەوەمان پێ بسەلمێنێت کەگوایە هەموو بیرو باوەڕو ئایدیۆلۆژێك بەبێ جیاوازی ، مانای دەرچوونی مرۆڤە لە سروشتی مرۆڤایەتیی خۆی . . یۆنسکۆ لێرەدا دەکەوێتە هەڵەیەکی زۆر گەورەوە ، دوای ئەوەی کە نایەوێت سنوور لەنێوان ئایدیۆلۆژیی و

بیروباوەڕەکاندا دابنێت و دەس نیشانیان بکات . نووسەر نایەوێت جیاوازی نێوانی ئایدیۆلۆژی و بیروباوەڕی فاشستی و نازی کۆنەپەرستی و ڕەگەزپەرستی ی نامرۆڤایەتی لەگەڵ بیروباوەڕی مرۆڤایەتی و سۆشیالیستی و پێشکەوتن خوازیدا بکات . بەڵکو بەیەك چاو سەیری هەموویان دەکات .

شانۆیی (کەرکەدەن) لە زۆربەی زۆری وولاتانی جیهاندا پیشاندرا . هەر لە وولاتە سەرمایەدارەکانەوە تادەگاتە وولاتە سۆشیالیستیەکان . وەك : ئینگلستان . ئیتالیا . ژاپۆن . ئەسکەندەناڤیا . چێك و سلۆڤاکیا . یۆگسلاڤیا . هۆڵەنداوگەلی وولاتی تر . تیپی (جان لوی بارۆ) لەسەر شانۆی ئۆدیۆن - کەئێستا ناوی شانۆی فەرەنسایە - پیشانیاندا - لە وولاتی ئەڵمانیادا زیاتر لە هەزار جار پیشان درا . وە لە ئەمەریکادا سەدەها جار پیشاندرا .

یۆنسکۆی عەبەسی دژی هەموو بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژی یەك دەوەستێت ، هەوڵی پووچەڵ کردنەوەیان دەدات ، وەك هەموو هەوڵەکانی تری بۆ پووچەڵ کردنەوەی هەموو شتێك لەم بوونەدا . لەم بارەیەوە دەڵێت :

(گەر من بۆ ئایدیۆلۆژیەتێك دەنگ هەڵبڕم و سەرپێچی ی ئایدیۆلۆژیەتەکانی ترم کرد کەمێشکی خەڵکیان پڕکردووە ، ئەوسا منیش دەبم بەکەرکەدەنێکی کە ، سەرلەنوێ هەوڵی بڵاوبوونەوەی گرفتی پەتای کەرکەدەن دەدەم)[١٤] .

لەلایەن زۆر لە ڕەخنەگرانەوە ، ڕەخنەی توندوتیژی لی گیراو ، دەربارەی نووسرا کە مرۆڤێکی بێ بیروباوەڕە ، وەهیچ دەربارەی زۆر لەو دیاردە جەرگ برانەی ئەم جیهانە جەنجاڵەی ئێمە هەڵوێستێکی مرۆڤایەتی نیە . بەڕای یۆنسکۆ گوایە دەبێت نووسەر هیچ ئایدیۆلۆژی و پەیامێکی نەبێت و بۆ بیروباوەڕێکیش تی نەکۆشێت . لەئەنجامی ڕەخنەیەکدا ووتی : من نووسەرم . پۆستەچی نیم . . یۆنسکۆ بە هەموو توانایەوە دژی ڕێبازی واقیعی دەڕوات و نکۆڵی لی دەکات دژی ئەم ڕێبازە دەڕوات کە دەڵێ :

ڕیالیزم . واقیعی ڕاستەقینە نیە . واقیعیەت مەزهەبەو . شتێکی گەلی جیاواز . لە واقیع . بەڵکو واقیعێکی مەیوە لەکات و شوێندا . ڕیالیزم و واقیعیەت بە هەوڵدانی بۆ بەستەڵەککردنی ڕاستەقینە . خوی و ژیان دەشێوێنێت)[١٥] . نووسەر بەهەموو توانایەوە بەرهەڵستی ی ڕێبازی ڕیالیزمی دەکات . ئەو ڕێبازەی کە مەبەستی دەربڕینی واقیع و دژواریەکانی ژیانە . بە مەبەستی دەس نیشان کردن و چارەسەرکردنی ئێش و ئازارەکانی مرۆڤ کە پێیانەوە دەتلێتەوە لەژیاندا (یۆنسکۆ) دوژمنی سەرسەختی (برتۆلو بریخت)ی نووسەری شانۆیی ی ئەڵمانی بوو . بە (نووسەری چەپ ڕەوی شوێن پێ هەڵگری) دادەنا . هیچ شتێکی هەست بزوێنی لە بەرهەمەکانی ئەو نووسەرە . ڕیالیستە مرۆڤایەتیەدا بەدی نەدەکردو پێ ی دەگوت (نووسەرێکی سەرەتایی) . ئەمەبە ڕای نووسەرێکی ناماقوڵی بێهوودەی ی بەرامبەر کەڵە نووسەرێکی پێشکەوتن خواز . کە هەردەم لە ژیانیدا بە هێزو توانای بیرو قەڵەمی ، قەڵای ستەمکاران و چەوسێنەران و داگیرکەرانی دەڕووخاند .

هەروەك دەس نیشانمان کرد ، هەموو شت لەژیاندا هیچ و بێهوودەو ناماقووڵە . هەر لە هەڵس و کەوتی مرۆڤەوە تادەگاتە زمان و هەڵوێست و بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژی هیچ شتێك لە دەس نووسەرانی ناماقووڵ ڕزگاری نەبووە . مۆرکی بێهوودەییان بەسەر هەموو شتێکدا نەخش کردووە . شوێن و کاتیش لەژێر دەستی نووسەرانی ناماقووڵ پووچەڵ کراونەتەوە . تێکرا هەموو شت لەم بوونەدا پووك و بێ مانان . نووسەر دەربارەی شانۆیی ی کورسیەکان دەڵێت :

(بابەتی ئەمسیلەکە پەیامی دوو پیرەکە نیە بۆ مرۆڤایەتی . هەروەها مانای داکەوتنیان نیە لە ژیاندا . وە پەژارەی ناخ نیە کە پیرە پەككەوتەکان هەستی پێ دەکەن . بەڵکوو ئەو کورسی یە بەتاڵانەیە کەوا دەسنیشانێکە بۆ بزربوونی خەڵکی و پادشاو خواوەندو مادەو بوونی حەقیقەت . وە دەسنیشانە بۆ بەتاڵی ی موتڵەق . بابەتی ئەمسیلەکە دەربارەی نەبوونە)[١٦] . زمان هیچ ماناو پەیامێك ناگەیەنێت لە ژیانی ڕۆژانەدا . هەروەك ، یۆنسکو لەشانۆیی (وانە) و (کورسییەکان) بە ڕوونی دەسنیشانی کردووە . بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژی بەهەمان شێوە ناماقوڵە هەروەك یۆنسکۆ لە شانۆیی ی (کەرکەدەن) دا دەسنیشانی کردووە . بەڕای یۆنسکۆ خاوەن بیروباوەڕێکی مرۆڤایەتی وەك (برتۆلو بریخت) لەگەڵ مرۆڤێکی نازی و ڕەگەزپەرستدا هیچ جیاوازییەکی نیە ! هەرچی هەیەو نیە لەم جیهانەدا بێ ماناو هیچ و پووچەو ناماقوڵە . وەهەرچی زاراوەیەکیش هەیە وەك : مرۆڤایەتی ، سۆشیالیستی . میللەت و نەتەوە . بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژی ، خەبات و تێکۆشانی چینایەتی . هەژارو دەوڵەمەندی سەرمایەدار . چەوساوەو چەوسێنەر ، داگیرکەرو نیشتمان داگیرکراو . . هتد . بەڕای عەبەسیەکان سەرجەمی هەموویان بریتین لە قالب و کلێشەو لە ڕاستیدا بوونیان

ییە . . ! هەموو خەبات و تێکۆشانێکیش
ە پێناوی بیروباوەڕدا لە شتێکی هیچ و
پووچ بەولاوە هیچی کە ناگەیەنێت . . جا
شتێکی سەیرو سەرسوڕهێنەر نیە گەر
نوسەرێکی بێ‌هوودەیی وەك یۆنسکۆ بە
چاوی پڕ بەزەییەوە بڕوانێتە زایۆنیستە
ڕەگەزپەرستەکان و پشتگیری خۆی لە
ئیسرائیل ئاشکەرا بکات ، بەپێچەوانەی
نوسەرانی ڕیالیستەوە کەهەردەم
پشتگیری خۆیان لە هەموو شوێن و
کاتێکدا ، لە گەلی فەلەستینی زەوی
داگیرکراو دەربڕیوە یۆنسکۆ بەردەوام ،
بەبێ شەرم دەستی زایۆنیستەکان
دەگوشێت و برادەری و دڵسۆزیی خۆی
بۆیان دەردەبڕێت . چەند ساڵێك
لەمەوبەر ، بەبۆنەی ڕۆژی شانۆی
جیهانییەوە ، پەیامی (یۆنسکۆ)ی نووسەر
بەبۆنەی ئەو ڕۆژەوە بە هەموو وولاتانی
جیهاندا پەخش کرا ، بەلام لەلایەن چەند
وولاتێکەوە ئەو پەیامە ڕەت کرایەوە ،
یەکێك لەو وولاتانە عیراق بوو .

## کات‌وشوێن‌و ناماقوولّ

ڕاستە کە کات و شوێن نیسبین و
موتلەق نین . بەلام پێوانەیەکی نیسبی‌ی
تایبەتیان هەیە . بەپێچەوانەوە لە شانۆی
عەبەسدا بوونیان نیەو دەسڕێنەوە .
هەروەك لە شانۆگەری‌ی (ژنە گۆرانی بێژە
سەرڕووتاوە) کەدا هاتووە مستەر سمیت
حەفتە بە سێ ڕۆژ دادەنێت ، کەوا گوایە
بریتیە لەسێ شەممەو پێنج شەممەو دووبارە
سێ شەممە . . هەر لە هەمان شانۆییدا
(سمیس خانم) ڕادەگەیەنێت کە کات ژمێر
نۆیە ، بەلام کات ژمێر گەورە دیواریەکە
حەڤدە جار لێ‌دەدات . ئەمانەیش هەموو
نموونەن بۆ پووچەلّ کردنەوەی
وەخت‌وکات .

## وەخت‌و کات

لە شانۆیی‌ی (بکوژ – القاتل) دا .
بیرانجیّ دەلّێت : (لەوانەیە تەمەنم شەست
ساڵ بێت . یاخود حەفتا ساڵ . یاخود
سەدو بیست ساڵ . بەتەواوەتی نازانم ؟)

لە شانۆیی‌ی (کچێك لە تەمەنی
شوکردندا) دا نووسەر دەیەوێت ژمارەو
تەمەن و ساڵ پووچەلّ و بێ‌بایەخ بکات .
لەم شانۆیەدا ئافرەتێك ئارەزووی
بەشوودانی کچەکەی خۆی بە پیاوێك
ڕادەگەیەنێت . لەکاتی ئامادەبوونی
ناوبراودا بۆ سەر شانۆ لە باتی ئەوەی بینەر
کچێك لە تەمەنی شوکردندا بەدی بکات ،
دەبینێت پیاوێکەو ، ناو شان پان و سمێلّ
ڕەشە . تەمەنیشی خۆی لە سیّ (٣٠)
ساڵێك دەدات ! پووچەلّ کردنەوەی
تەمەن و ژمارە لەم ووت و وێژەدا
دەردەکەوێت .

پیاو : بوانژۆر بچکۆلەکەم ! (بە
ژنەکە) : بەڕاستی چاپووکە تەمەنی
چەندە ؟

ئافرەت : نەوەدو سێ ساڵە :

ماتماتیك و ژمارە بەباڵاترین نموونەی
مەنتیق دەژمێررین ، دەبینین نووسەرێکی
بێ‌هوودەیی وەك (یۆنسکۆ) بەپاچ و
خاکەناس هەولّی خاپوور کردنیان دەدا .
لەشانۆگەی‌ی (وانە) دا مامۆستا بەوپەڕی
دلّنیایەوە دەلّێت (١+٧ دەکاتە ٨ جاری
وەهایش هەیە دەکاتە ٩ نۆ) سەرەتای
هەولّدان بۆ تێکشکاندنی مەنتیق و ژمارەو
کات و شوێن لەلای دادایزمەکان سەری
هەلّدا ، دوا بەدوای ئەوانیش
سوریالیەکان هەمان کۆششیان دەکرد . لە
زۆرێك لە تابلۆکانی (سلڤادۆر دالی)ی
سوریالیستدا دەبینین کاتژمێرەکان وەك
هەویریان لێ‌هاتووەو شۆڕبوونەتە
خوارەوەو تینیان تێدا نەماوەو داچۆڕاون .

لە شانۆی ناماقولّدا کەس خاوەنی
کەسایەتی‌ی خۆی نیە . نەخۆشی‌ی
لەبیرچوونەوە تووشی مرۆڤایەتی بووە .

مرۆڤ دەرك بە دەورو پشتی خۆی
ناکات . هیچ پەیوەندییەکی مرۆڤایەتی
بەدی ناکرێت . ئەم دیالۆگەی نێوان ژن و
مێردێك باشترین نموونەیە بۆ ئەم
مەبەستە :

**ئاغای مارتن** : من لە ژمارە نۆزدە
جێگیرم ، ئەی خانمی خۆشەویست .

**خانمی مارتن** : ناماقولّە : گەورەم
منیش لە ژمارە نۆزدەدا جێگیرم .

**ئاغای مارتن** : کەواتە ، کەواتە ،
کەواتە ، کەواتە ، کەواتە ، ئەی خانمی
ئازیزم لەوانەیە لەویّ چاومان بەیەکتر
کەوتبێت .

**خانمی مارتن** : گەورەم ئەمە زۆر
ڕەی تێ‌دەچێت . بەلام من بەتەواوەتی
نایەتەیادم .

**ئاغای مارتن** : شوقەیەکم لە نهۆمی
پێنجەمدا هەیە ، شوقەی ژمارە هەشت
ئەی خانمی ئازیزم .

**خانمی مارتن** : ناماقولّە ، ئەی
خودای ئاسمانان ، ئای ئەمە چۆن
ڕێکەوتێکی سەیرو سەرسوڕهێنە ! ئەی
گەورەم منیش لەنهۆمی پێنجەمداو ،
لەشوقەی ژمارە هەشتدا دادەنیشم .

شانۆییەکانی (ئۆچین یۆنسکۆ)
لەزۆربەی زۆری وولاتانی جیهاندا ، لەسەر
تەختەی شانۆکان پیشان دەدرێن .
تێکستەکانیشی وەرگێڕراونەتە سەر زۆربەی
زۆری زمانانی زیندووی جیهان . دەتوانین
بلّێین کەوا زۆربەی شانۆگەریەکانی ئەم
نووسەرە تا ئێستاکێ وەرگێڕراونەتە
سەرزمانی عەرەبی . بەلام وەك من پێی‌ی
بزانم تاکو ئێستا تەنها یەك شانۆیی‌ی کورتی

ئەم نووسەرە کە بە ناوی (بۆشایی)یە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی کوردیو لەگۆڤاری ڕۆشنبیری نوێدا بلاوبووەوە .

**سەمویل پیکێتو چاوەڕوانی بێ هوودە**

کاتێك کە ناوی شانۆی ناماقوڵ دێتە ناوەوە . ئەوە بێگومان ناوی (سەمۆئێل بیکیت) خۆی بەرز دەکاتەوەو خۆی دەخاتە ڕوو وەك کۆڵەگەیەکی گەورەو بەتین لە مەیدانی بێهوودەییو هیچوپووچدا . ئەم نووسەرە لەساڵی (١٩٠٦) دا لەشاری (دبلن)ی ئیرلەندە هاتۆتە دونیاوە . لە سەرەتادا (بیکیت) وەك یارمەتیدەری مامۆستای زمانانی ڕۆمانی لە کۆلیجی (ترنتی)ی بەناوبانگ وانەی ووتۆتەوە لەپێش جەنگی دووەمی جیهانیدا ئیرلەندەی بەجێ هێشتووەو ڕووی کردۆتە شاری (پاریس)ی پایتەختی فەرەنسا . لەوێ لەگەڵ (جێمس جۆیس) کە ئەویش هەر ئیرلەندەییە — ئاشنایەتی پەیدا دەکات . لەگەڵ هەڵگیرساندنی ئاگری جەنگدا ڕوودەکاتە بەشی داگیرنەکراوی وولاتی فەرەنسا ، لەوێ دەس دەکات بە کرێکاری . هەرلەوێ یەکەم چیرۆکی خۆی دەنووسێت . لە کۆتایی جەنگدا دەگەڕێتەوە شاری پاریسو دەس دەکات بە نووسینی سێ شانۆییو چوار چیرۆك ، بەلام سەرکەوتن بەچنگ ناهێنێت . لە ساڵی (١٩٤٨) دا شانۆیی (چاوەڕوانی گۆدۆ)ی نووسی ، ئەم شانۆییەی لەلایەن هەموو بەڕێوبەرانی شانۆکانەوە ڕەت کرایەوە بەو بیانووەی کە (ناشانۆگەرییە) . هەرکە لە ساڵی (١٩٥٣) دا لەسەر شانۆی (دی پابلیۆنی بچووك) پیشاندرا سەرکەوتنێکی زۆری بەچنگ هێنا . چوار سەد شەو لەسەریەك پیشاندرا . ئەم شانۆییە بێ هوودەییە ناماقوڵە وەك شانۆییەکی ئاسایی نیە ، کە بریتی بێت لە ڕووداوو سەرەتاو ناوەڕۆكو کۆتایی . بەڵکو لە سەرەتاوە تا کۆتاییەکەی بریتییە لە قسەو دیالۆگی دوو کەسی پەڕەگەندە . یەکێکیان ناوی (ئەستراگۆن)ەو . ئەوی تریان (ڤلادیمیر) . هەریەك لەم دووانە کلاوێکی ڕەشیی لەسەرەو قسەی پچڕ پچڕو ئاجرو باجری بێ‌ماناو ناوەڕۆكو ناماقوڵ دەکات . ئەوەی کەدەیزانن ئەوەیە کە چاوەڕوانی شتێك دەکەن کە ناوی (گۆدۆ) هەڵدەگرێت . ئەم (گۆدۆ)یە کێ بێتو چی بێتو چۆنە ؟ ئەوە خۆیشیان نایزانن . بگرە نووسەری شانۆییەکە خۆیشی هیچی لێ‌نازانێت ! . کاتێك کە لە (بیکیت)ی نووسەریان پرس ووتیان ئەم (گۆدۆ) یە دەبێ چی بێتو کێ بێت ؟ لە وەلامدا ووتی : (ئەگەر بمزانییایە . لە شانۆییەکە خۆیدا دەم ووت)[١٧] .

بەبێ هوودەیی بەردەوام هەردوو پاڵەوانی شانۆییەکە چاوەڕوانیی گۆدۆ دەکەن . لەو هەڵوێستەوەی (کە هیچ روونادات . کەس بۆلامان نایەت ، کەسیش ناڕوات . ئەمەیش بارێکە کە هەرگیز لەتوانادا نیە) . شانۆییەکە بریتیە لە دوو پەردە کە دوو ڕۆژ پێك دەهێنن . دیکۆریش زۆر هەژارە ، دارێکی بێگەڵای رووت لە تەنیشت لارێیەکدا ڕوواوە . کەسانی شانۆییەکەیش وەك ووتمان بریتین بەرادەی یەکەم لە (ڤلادیمیر)و (ئیستراگۆن) کە بەهیوای ژوانی (گۆدۆ)وە لەوێ وەستاون . لە پەردەی یەکەمدا (بۆزۆ)و (لوکی) بۆ ماوەیەك دێنە سەرشانۆ . (بۆزۆ) چەوسێنەرە (لوکی)یش چەوساوەو کۆیلەیە ، (بۆزۆ) ملی (لوکی)ی بە پەتێك بەستۆتەوەو بە ئارەزووی خۆی پەلکێشی دەکاتو فەرمانی بەسەردادەدات ، تەنانەت فەرمانی (بیرکردنەوە)یشی بەسەردادەدات ! .

لەکۆتایی پەردەی یەکەمدا منداڵێك دێتە سەرشانۆو بە (ڤلادیمیر) و (ئیستراگۆن) دەڵێت کە گۆدۆ (ئەم شەو نایەت . بەڵکو بەبێ گومان سبەی دێت) . هەردووك دەستەخەرۆ دەبن . لەم کاتەیشدا ووردە ووردە تاریکی دادێتو مانگ لە سینەی ئاسماندا هەڵدێت . ڕۆژی دوایی . کە پەردەی دووهەم پێك دەهێنێت . هەرهەمان کێشەی پەردەی یەکەم لە ئارادا دەبێت کە ئەویش ئەوەیە (ئێستا چی بکەین ؟ چاوەڕوانیی گۆدۆ دەکەین) . لەم پەردەیەدا چەند باسو خواسێك دێتە ئاراوە وەك : پێڵاوە شڕەکانی ئیستراگۆن . یاخود ئەو بیرەوەرییە کۆنانەی دوو پەرەگەندەکە . ویاخود ئەو دارەی کە دوێنێ ڕووتو بێگەلا بوو . بەلام لەم پەردەیەدا گەڵای لێ‌ڕوواوە . جارێکی تر (بۆزۆ) و (لوکی) پەیدا دەبنەوە نەك وەك دوێنێ . بەڵکو بەشێوەیەکی جیاواز . (بۆزۆ)ی چەوسێنەر کوێر بووەو (لوکی)ی چەوساوەیش لال بووە . لەم پەردەیەدا بەهەمان شێوەی ڕۆژی پێشوو پەیامبەری (گۆدۆ) جارێکی تر دێتو پێ‌یان دەڵێ ئەم ڕۆیش ناوبراو نایێت . لەم کاتەیشدا بەرە بەرە ڕۆژ بەرەو ئاوابوون دەچێت . بەم شێوەیەی خوارەوە کۆتایی بە شانۆییەکە دێت :

یستراگۆن : پەتکت پێیە ؟
ڤلادیمیر : نەء
ئیستراگۆن : کەواتە ناتوانین .
ڤلادیمیر : بابرۆین
ئیستراگۆن : چاوەرێکە . ئەوە پشتێنەکەمە
ڤلادیمیر: زۆر کورتە .
ئیستراگۆن : لەنێو لنگمدا دەتوانیت خۆت بخنکێنیت .
ڤلادیمیر : ئەی کێ لەنێو لنگی مندا خۆی

خنکێنێت ؟

ئیستراگۆن : راسته .

ڤلادیمیر : یەك ئەنجامە (ئیستراگۆن ئەو گوریسەی کە شەرواڵە فلتەکەی رادەگرێت . رایدەکێشێت‌و شەرواڵەکەی دەکەوێتە بانی پێ‌ی هەردوو سەیری پشتێنەکە دەکەن) لەوانەیە گەر تەسکی کەینەوە سوودمان پێ بگەیەنێت بەڵام دەبێ بەتین بێت وەکو دەتەوێت .

ئیستراگۆن : بەزووترین کات دەبینیت . (هەریەکەو سەرێکی پشتێنەکە دەگرن‌و رایدەکێشن . پشتێنەکە دەپچرێت‌و هەردووك دەکەون) .

ڤلادیمیر : ئەم بشتێنە بەس شایستەی نەفرەت لێکردنە . (بێ‌دەنگی) .

ئیستراگۆن : دەڵێیت کەوا پێویستە سبەی بگەرێینەوە ؟

ڤلادیمیر : بەڵێ .

ئیستراگۆن : دەتوانین پارچە گوریسێکی باشتر بهێنین .

ڤلادیمیر : بەڵێ (بێ دەنگی)

ئیستراگۆن : دیدی .

ڤلادیمیر : بەڵێ .

ئیستراگۆن : من ناتوانم ئاوەها بەردەوام بم .

ڤلادیمیر : تۆ وا تێ دەگەیت .

ئیستراگۆن : چۆنە جیا ببینەوە ؟ لەوانەیە باشتربێت بۆمان .

ڤلادیمیر : سبەی خۆمان دەخنکێنین (بێ‌دەنگی) ئەگەر بێت‌و گۆدۆ نەیەت .

ئیستراگۆن : ئەگەر هات ؟

ڤلادیمیر : رزگارمان دەبێت .

ڤلادیمیر : (کڵاوەکەی ، کەهی (لوکی)یە دادەکەنێت سەیری ناواخنەکەی دەکات‌و دەستی پیادا دەسوێت‌و رایدەوەشێنێت‌و بانەکەی دەداتە بەرنووکی پەنجە ، دووبارە دەیکاتەوە سەری)

ئیستراگۆن : باشە ؟ برۆین ؟

ڤلادیمیر : شەرواڵەکەت هەڵبرە .

ئیستراگۆن : چۆن ؟

ڤلادیمیر : شەرواڵەکەت هەڵبرە ؟

ئیستراگۆن : دەتەوێت شەرواڵەکەم داگرم ؟

ڤلادیمیر : شەرواڵەکەت هەڵبرە ؟

ئیستراگۆن : (دوای ئەوەی هەست دەکات کە شەرواڵەکەی دابەزیوە) راستە (شەرواڵەی هەڵدەبرێت . بێ‌دەنگی) .

ڤلادیمیر : باشە ؟ برۆین ؟

ئیستراگۆن : بەڵێ . بابرۆین . (لەجێ‌ی خۆیان نابزوێن . پەردە) .

## جۆدۆ وسمایل نامە

بەم شێوەیە کۆتایی بە شانۆییەکە دێت . بەبێ ئەوەی (گۆدۆر) دەرکەوێ . زۆر شت دەربارەی شانۆگەرییکەکەو هێمای (گۆدۆ گوتراوە . دەڵێن گوایە (گۆدۆ) هیوایەکی بێ‌ئاکامە کە هەردەم هەموو مرۆڤێك بێ‌پەرواو بێ‌هوودە وەك مزگێنیەك چاوەروانیەتی . ئەوەی هەیە کە ووشەی (گۆدۆ) لەرووی زمانەوانیەوە لە ووشەی (گۆد) ی ئینگلیزیەوە نزیکە ، کە بە مانای خوادێت . ئێمە کاتێك کە منداڵ بووین‌و لە مزگەوت لەلای مەلا دەمانخوێند ، پەرتووکێکی ئایمان هەبوو کە بە شیعر دارێژرابوو ناوی (أسماعیل نامە) بوو ، لەو پەرتووکەدا گەلی چیرۆك‌و ئەفسانەی سەیر سەیر هەبوون .

ئەوەی جێ‌ی سەرسورمانە ئەوەیە کە چیرۆکێکی تێدابوو ، کەزۆر لەشانۆیی‌ی (چاوەروانی‌ی گۆدۆ)وە نزیك بوو . لەو چیرۆکەدا کابرایەك دەچێتە سەر شاخێك‌و خواردن ئامادە دەکات‌و بەبێ هوودە چاوەروانی‌ی خودا دەکات وەك مزگێنیەك بۆ رزگار بوون . جانازانم ئەم چیرۆکە لە (تەورات) ەوە وەرگیراوە یاخود نا؟ چونکی تەورات سەرچاوەی هەموو چیرۆك‌و ئەفسانەیەکی ئاینیە . لەم دواییەدا زۆر بەدوای ئەو (أسماعیل نامە) یەدا گەرام‌و بەچنگم نەکەوت .

وەك ووتمان ناوەرۆکی شانۆیی‌ی (چاوەروانی‌ی گۆدۆ بریتیە ، لە چاوەروانی‌ی بێ‌هوودەی (گۆدۆ) . ئەو دوو کەسە لە سەرەتای شانۆییەکەوە تا کۆتاییەکەی هەر بە هیوای هاتنی (گۆدۆ)وەن . بەبێ‌هوودەیی کاتەکەیان دەبەنە سەر سەرەرای نەخۆشیەکانیان (ڤلادیمیر بە پرۆتستاتیەوە دەتلێتەوە ، ئیستراگۆن پەراسووی شکاوەو یەکێکیان لە دەمیەوە ئەوی تریان لەپێیەوە بۆنی ناخۆشیان لێ دێت بەبێ هیچ ناوەرۆکێکی بایەخدار دەدوێن :

ڤلادیمیر : قسە نابرێتەوە

ئیستراگۆن : دەبێ قسە بکەین تاخۆمان هەڵبخەڵەتێنین کە گوایە هەین .

ئەم دوو کەسەی شانۆییەکە خاوەن کەسایەتی خۆیان نین‌و هەویەی تایبەتیان نییەو سەر بە هیچ نەتەوەو زەوییەکی تایبەتیش نین و کەسایەتیان روون نیە هەروەك کەسایەتی‌ی (گۆدۆ) ی شارراوەی نادیار : ڤلادیمیر ناوێکی رووسییە ، ئیستراگۆن ناوێکی ئەسپانییە ، لوکی ئینگلیزیە . . . سەرەرای ئەمانەیش هیچیان خاوەن ئیش‌و کارو کاسبییەك نین . هیچ ئامانجێکیش نیە کە لە ژیانیانداپاڵیان پێوە بنێت .

وەك پێشتر روونمان کردەوە کە وەخت‌و کات لای (ئوچین یونسکو) بزرەو بوونی نیە ، دەبینین لای (سەمۆئێل بیکیت)یش خەتی راست‌و چەپ بەسەری‌دا دراوەو

سەرەنگوم کراوە . هەروەك لەم قسانەی (بۆزۆ)دا دەردەکەوێت : (بە کاتی نەفرەت لێ‌کراوت بەس نەبێت ئازاردانم ! ئەمە شتێکە جێی بێز لێ‌کردنەوەیەکی زۆرە! کەی! کەی! لە ڕۆژێك‌دا . ئەمە بەس نییە بۆت . ڕۆژێك وەك هەموو ڕۆژانی کە . ڕۆژێك لەڕۆژان ئەو لال بووو منیش ڕۆژێك کوێر بووم . ڕۆژێکیش هەردووك کەردەبین . ڕۆژێك لەدایك بووین ڕۆژێکیش دەمرین . هەمان ڕۆژ هەمان چرکە . ئەمە بەس نەبێ بۆت؟

ڤلادیمیرو ئیستراگۆن تووشی لەبیر چوونەوەی هەمیشەیی بوون . تەنانەت بۆ ڕۆژی دوایی نازانن کە دوێنێکە لەکوێ بوونە . شوێنیش وەك کات هیچ بایەخێکی ئەوتۆی نییە . ئیستراگۆن وای لێ دێت تا ڕەنگی پێلاوەکانی لەبیردەچێتەوە :

ئیستراگۆن : ئەمە هی من نییە .

ڤلادیمیر : (زۆر بەسەر سوڕمانەوە) هی تۆنییە !

ئیستراگۆن : پێلاوەکانم ڕەش بوون بەڵام ڕەنگی ئەم قاوەییە .

ڤلادیمیر : تۆ دڵنیایت ڕنگی پێلاوەکەت ڕەش بوو؟

ئیستراگۆن : باشە ، ڕەنگی مەیلەو خۆڵەمێشی بوو .

هەڵوێستی (بیکیت) بەرامبەر بە زۆردارو ستەمکارو چەوسێنەر ، هەڵوێستێکی داخەتاوە ، بۆنموونە (بۆزۆ لە شانۆیەکەدا وەك چەوسێنەرێك‌و (لوکی) شیوە وەك چەوساوەیەك دەردەکەوێت یەکەمیان بەپەت‌و قامچی دووهەمیان لێ دەخوڕیت‌و وەك بەندەیەکو کۆیلەیەکی ژێر دەستەی خۆی ڕەفتارو هەڵس‌و کەوتی لەگەڵ‌دا دەکات . لەپەردەی دووەم‌دا چەوسێنەر کوێر دەبێت . چەوساوەیش لال دەبێت . نووسەر دەیەوێت ئەم کێشەیە وەك موعادەلەیەك بخاتە ڕووو بڵێت : کە مادامەکی چەوساوەو چەوسێنەر بەدەستی سروشت‌و چارەنووسەوە دەتلێنەوە . دەبێت جیاوازی لە نێوانیان‌دا نەبێت . نووسەر دەیەوێت ستەم کارو ستەم لێ‌کراو لە ذوو تای تەرازوودا بەرامبەر یەك ڕابگرێت بەبێ جیاوازی . وەك ئەوەی کە (لوکی) ی بەش خواراو دەبێت ڕازی بێت بەبەشی خۆی وەك چارەنووسی‌و ، نابێت پرکێشیی جەلادەکەی بکات‌و بەگژی‌دا بچێت‌و یاخی بێت!

## ژن‌و . . کۆتایی گەمەکە

ئەو شتەی کە نکوولی لێ‌ناکرێت ئەوەیە کە ژن مایەی بەردەوامیی ڕەگەزو جنسی مرۆڤایەتیەو ، هۆی بەردەوامیی ژیانە ، بە پێچەوانەوە لەلای (بیکیت) ژن سەرچاوەی مردنە .

ڕەخنەگری ناودار (مارتن ئیسلن) لەم بارەیەوە دەڵێت :

(لە شانۆیی «چاوەڕوانیی گۆدۆ» دا مێینە یان بوونی هەیە بەشێوەی تیل نیشانی (تلمیحیە) لەپێناوی نەفرەت لێ‌کردنی‌دا (لەلایەن بۆزۆوە) کەگوایە (ئەو سەگە زەمێنیەیە) ،یان تاوانبارکراوە بەوەی کەگۆڕ لەنێو لنگیەوە لەدایك دەبێت ، بەڵام لە شانۆیی (کۆتای گەمە)دا سەرەڕای مردنی ڕاستەقینەی دایك لەنێو تەنەکەی زبڵ‌و پیساوی‌دا ، ناوی ژنێك بەشێوەیەکی لابەلایی لە دیالۆگ‌دا دەهێندرێت . ئەویش بیکی دایکە کە هام نایەوێت نەوتی بداتێ بۆ چراکەی ، لەبەر ئەوەیش (لە تاریکیدا دەمرێت)[18] .

لەساڵی (١٩٥٧) دا بیکیت شانۆیی (نهایە اللعبە- کۆتای گەمەی) نووسی لەم شانۆیەدا سێ نەوە لە کوانویەکی کەم ڕووناکی هەژاراندا دەژین نەوەی یەکەم بریتیە لە (ناگ) و (نیل) ی مێردو ژنی پیری پەك کەوتەی ئیفلیج ، کەلە نێو تەنەکەی زبڵ‌و پیسی‌دا دانیشتوون‌و سەریان بەدەرەوەیە . نەوەی دووهەم بریتیە لە (هام) کە ئەویش ئفیلج‌و کوێرە . نەوەی سێیەم بریتیە لە (کلۆف) کە بە دەستی (هام) ی باوکیەوەو ،(ناگ )و (نیل) ی باپیرەو داپیرەیەوە تووشی ڕۆژی خۆی بووەو ناتوانێت شانی دانوێنێتەوە . ئەوەی شایستەی باسە ئەوەیە کە ووشەی (هام) لەزمانی ئینگلیزی‌دا لەووشەی (هامر)ەوە نزیکە کەبەمانی مێکوت دێت . ووشەی (کلۆف) نزیکە لەمانای (بزمار) . ناوەڕۆکی ئەم شانۆگەریە بریتیە لە دەنگ هەڵبڕینی نارەزایی بەرامبەر ، بە لەدایك بوون‌و ژیان و مردن :

گلۆف : ئەی گەمژە ، تۆمنت بۆ هێنایە ، دونیاوە .

هام : نەم دەزانی .

هەروەك لەم شانۆییەدا دەردەکەوێت ، ژیان وەك ئاوی گۆمێکی بۆگەنی وێستاو وایە «ژیان هەمووی هەر پرسیارەو هەر هەمان وەڵامیشە ئەگەر ئەو پرسیارە بکرێت یاخود نەکرێت» (ناسۆریش خۆی لە خۆی‌دا گاڵتە جاڕییەکە کەهیچ گاڵتەجاڕییەك هاوتای نیە) . (شەپۆلەکان قرقۆشمن ، خۆریش خاڵیکی سفرە . بەم ووتانە کەسانی شانۆگەرییەکە دێنە زمان‌و بیروباوەڕی خۆیان دەردەبڕن . (هام) دەیەوێت بێهوودەیی‌و پووکی‌و بۆشایی ژیان دەربڕێت ، کەدەڵێت (بۆشایی بێ‌کۆتایی

گەمارۆی داوێن‌و هەموو مردووانی چەرخەکان بێت‌و بگێڕێنەوە بۆ ژیان جارێکی تر ، دانەیێك زیخ پێك دەهێنن لەنێو ئەم بیابانەدا ) .

ماوەیەك لەمەوبەر برادەرێك شانۆییەکی یەك پەردەیی نووسیبو پیشانی دام ، داوای لی‌کردم رای خۆم بەرامبەری دەربڕم . دوای خوێندنەوەی ووتم : برادەری ئازیزم ئەم شانۆییەی تۆ لە شانۆیی (کۆتای گەمە) ی (بیکیت)ەوە زۆر نزیکە . . جا ئیتر ئەگەر لە ئاگاییەوە هەڵقولابێت یاخود لەبێ ئاگاییەوە بێت ! درێژەم بەقسەکانم داو ووتم شانۆییەکەی بیکیت لە ساڵەکانی پەنجا نووسراوە . . جاگەر بێت‌و ئەو شانۆییەی بیکیت هەڵسەنگێنین ودژی بووەستین یاخود پشتگیریی لێوە بکەین ، هەر یەك ئەنجامان دەس دەکەوێت ئەویش ئەوەیە کە لە تۆ باشتری نووسیوەتەوە .

ئیتر برادەر گەر کاروبار بەم شێوەیە بێت‌و لەوساڵانەدا نووسەرێك بابەتێکی لە تۆ باشتری نووسیبێت . جاچ پێویستیەك هەیە تاتۆ بچیت لاسایی بکەیتەوە . . !؟ ئەمە کێشەی تۆنیە بەتەنها بەڵکو کێشەی گەلێك لە نووسەرانە لەلای خۆمان‌و گەلێ شوێنی تر . گوایە ئێمە هیچ ئێش‌و ئازارو کێشەیەکی ئەوتۆمان نییە تا لەسەریان بنووسین . . ؟

## ئەدامۆف‌و پاشگەز بوونەوە

ئەو نووسەرەی کە دەنگی خۆی لەگەڵ دەنگی نووسەرانی ناماقوڵدا جووت کرد ، (ئارسەر ئەدامۆف)بوو . ئەم نووسەرە لەساڵی (١٩٠٨)دا لەبنەماڵەیەکی ئەرمەنی لە قەفقاسیای رووسیای قەیسەریدا هاتە دونیاوە . بۆ خوێندن لە (جنێف) ژیا دوایش لە (ماینز) . لە ساڵی (١٩٢٤)دا وەلەتەمەنی شازدە ساڵیدا بەیەکجاری لەشاری (باریس ) جێگربوو . .

یەکەم بەرهەمی ئەم نووسەرە چیروکیکی ، شانۆیی بوو بەناوی (پیلانی مەزن‌و بچووك) لەلایەن (جان ماری سیرۆ)وە لەتشرینی دووەمی ساڵی (١٩٥٠)دا دەهێنرا . سێ رۆژ بەدواوە (جان ڤیلار) شانۆیی‌ی دووەمی (ئەدامۆف)ی لەسەر تەختەی (شانزیلیزێ) دەرهێنا ،کە بەناوی (داگیر کردن– الغزو)وەوەبوو . ئەدامۆف ئاشنای (ئارتۆ)ی دەردهێنەر بوو وسترندبێرگ‌و کافکاە کارێکی زۆریان کردبووە سەری . ئەدامۆف دەگێڕێتەوە کەوا رۆژێکیان رووداوێکی بچووك لە رووالەت‌دا تووشی دەبێت‌و لە ئاکامی‌دا دەڵێت (ئەمەیە شانۆی رەسەن ، پێویستە چارەسەری بکەم) .

گوایە نووسەر کوێرێك دەبینێت لە شەقامەکان‌دا دەسوورێتەوە ، لەناکاو دوو کچی لاو بە تەنیشتی‌دا تێدەپەڕن ، بەبێ ئەوەی ئاگایان لێ‌بێت لێ‌ی دەکەون‌و لەتری پێ دەدەن‌و دەس دەکەن بە گۆرانی ووتن‌و دەڵێن (کاتێك کەچاوم نوقاند بوو وجود زۆر قەشەنگ هاتە پێشی چاوم) .

لەساڵی (١٩٥٣)دا نووسەر شانۆیی‌ی (هەموودژ بە هەمووی) نووسی دوایە دوای ئەمەشی گەلێ‌ش نۆیی نووسی وەك (مانی رەوت)و (ژوان)و (مامۆستا تاران) ، کەئەم دوایەنیان یەکێکە لەشانۆییە هەرە بەناوبانگەکانی (ئارتەر ئەدامۆف نووسەر بەردەوام بوو لە نووسینی بەرهەمی شانۆیی کە هەموویان بۆنی بێ‌هوودەیی‌و عەبەسیەتیان لێ‌هەڵدەستێت . لەپاشان‌دا نووسەر بیرو باوەری خۆی دەگۆرێت‌و پشتی خوی لە دەستەی نووسەرانی ناماقوڵ وەردەگێرێت‌و دەسبەرداری ئەدەبی ناماقوڵ دەبێت . لە قۆناخی تازەیدا (ئەدامۆف) رێبازی ریالیزمی‌ی رەخنەیی (الواقعیە النقدیە) دەگرێتەبەر . ئەگەر نووسەر لە قۆناخی یەکەمدا نامەقووڵی‌و بێ‌هوودەیی ژیـــان‌و گەردوونی دەردەبری ،دەبینین لە قۆناخی دووەمی‌دا ناماقوڵی‌و بێ‌هوودەیی سروشتی کۆمەڵگای چینایەتی دەردەبرێت‌و پەردە لەسەر دیارە ناهەمزارە نامرۆڤایەتیەکانی کۆمەڵگای بۆرژوای سەرمایەداری هەڵدەماڵێت هەروەك لە شانۆگەریی (پینگ پۆنگ)و (پاول‌و پاولی)دا بەرووی دەردەکەوێت .

## جان‌جینێ‌ی هەژار

ئەو نووسەرە فەرەنسیەی کە بەبێ ئاگای تەواوی خۆی شانۆگەری‌ی عەبەسی‌ی دەنووسی (جان‌جینێ) بوو کەساڵی (١٩١٠)لەفەرەنسا لەدایك بووە . ئەم نووسەرە هەر لە سەرەتای چاو هەڵێنانیەوە لەسۆزی دایك‌و باوك بێ‌بەش بوو ماڵە جووتیارێك بۆماوەیەك دەیگرنە خۆیان ،لەدوای هەڵەو خەتایەکی بچووك بە دەزگای راستکەرەوەی هەتیوانی (أصلاحیة الأحداث) دەسپێرن . لەوێش هەڵدێت‌و رادەکات‌و دەس دەکات بە کاری دزی‌و تاوانی جۆراو جۆر ، لەم شار بۆ ئەو شارو ، لەم بەندیخانە بۆئەو بەندیخانە لەساڵی (١٩٤٢)دا لەبەندیخانەی شاری (مژین) یەکەم هەڵبەستی بەناوونیشانی (کیژۆڵەی گوڵان دەنووسێت) .

لەساڵی (١٩٤٧)دا یەکەم شانۆیی‌ی بەناوونیشانی (کارەکەرەکان) دەنووسێ . ئەم شانۆگەرییەش وەك ژیانی نووسەر خۆی بۆنی نامەقوولیەت‌و تاوانی لێ‌هەڵدەستێت هەندێك لە رەخنەگران ووتیان لەوانەیە مەبەستی نووسەر پشتگیری کردن بێت لە

هەژارو کارەکەرو چەوساوەکان نووسەر ئەم بۆچوونەی رەت کردەوەو ووتی (پارێزگاری لە چارەنووسی کارەکەرەکان ناکەم . وەك بزانم نیقابەیان هەیەو کاروباریان دەگرنە ئەستۆ . جان جینێ شانۆیی (رەش پێستەکان ی) نووسی . وەڵامی پێشووی دووپات کردووەوە . کە مەبەستی پشتگیری کردن نیە لە رەش پێستەکان . بەم شێوەیە وەڵامی رەخنەگرەکانی داوە :

(وەك بزانم حیزبێك هەیە پارێزگاری لەرەنگدارەکان دەکات ومن هیچم بەسەریانەوە نیە) . بەڵێ ئەمەیە هەڵوێستی نووسەرێکی عەبەسی کە مرۆڤێکی سەرلێشێواوە تاکرەوە . کەهەر بۆخۆی دەژێ‌و چارەنووسی خۆی بەتەنها لامەبەستەو بەس . مرۆڤێکە بەبێ ئامانج‌و هیچ هیوایەکەوە لە ژیاندا هەنگاو دەنێت . ژیان لەبەرچاوی وەك کاغەزێکی رەش وایە . ژیانی پڕە لە ترس‌و لەرز لەچارەنووس‌و مردن . لە ژیاندا هیچم بیرو باوەڕو پێوانەیەك‌و ئاستێکی مرۆڤایەتی بەدی ناکرێت .

ژیانی مرۆڤ بێ‌هوودە هەروەك ژیانی منداڵێکی ساوا وایە کە دەورووبەری پڕە لە ووشەی بقە) ئەوەی شایستەی باسە ئەوەیە کە نووسەرانی بێ‌هوودەی وەك ئەنجامی رێبازەکان پێشووتریان گەیشتنە رێگایەکی بەستراوو هیچم ئاکامێکی ئەوتۆیان بەچنگ نەهێناوە رێبازەکەیان پووچەڵ بووەوە دوای ئەوەی کە بۆ چەند ساڵێك دەوری خۆی بینی وەك رەنگ دانەوەی زرووف‌و بارو دۆخی سەردەمێکی تایبەتی

**ئەنجامو . . کاڵی‌ووشك نەکردوو**

ئێستاکێ قوتابخانەی بێ‌هوودەی بە تەواوەتی پەکی کەوتووەو لەکار وەستاوە لەم ساڵانەی دواییدا هیچ بەرهەمێکی ناماقووڵ بەدی ناکرێت کە لە تواناییدا هەبێتەدەنگدانەوەیەکی ئەوتۆ بخاتەوە . تەنانەت ئەو نووسەرانەی کە رابەری ئەم قوتابخانەیە بوون‌و بە دامەزرێنەری دادەنرێن . بۆ ماوەیەکی زۆر دەچێت وازیان لە نووسین هێناوە . یاخود توانای نووسینی بەرهەمێکی وایان نییە تاناوبانگێکی باش دەربکات . ئەوەی کەپێیان بوو هەموویان هەڵڕشت . ئەمەیش بەپێچەوانەی رێبازی ریالیزمەوەیە کە هەرگیز ووشك بوونی بۆینیە . ئەگەر هەموو رێبازو قوتابخانە ئەدەبی‌و هونەرییە جۆربەجۆرەکان لە کۆتاییدا تووشی وەستان‌و بەستەڵەکی بوون ، ئەوە بەپێچەوانەوە ئەدەب‌و هونەری رەیالیزمی وەك ئاوی کانیەك هەردەم لەهەڵقوڵاندایەو ووشك بوونی بۆینە بەردەوام‌و زیندووە لە هەموو شوێن‌و سەردەمێکدا . رێبازی ریالیزمی سۆشیالیستی توانی خۆی بەسەر بیرو هۆشی ئەدیب‌و نووسەران‌و هونەرمەندانی پێشکەوتن خوازی جیهانی سەردەمماندا بسەپێنێت ، دوای ئەوەی کە زۆری میللەتانی جیهان بیروباوەڕی سۆشیالیستی‌و پێشکەوتنخوازی گرتیانەوەو بروایان پێی هێنا وەك ئایدیو لۆژیەتێك کە هەردەم لە خزمەتی مروڤایەتیدایە بەبێ جیاوازی کردن لەنێوان تاك‌و کۆمەڵدا . بەڵکو تاك یەکێکە لەو کۆمەڵەی کە تیایدا دەژی سەرکەوتنی کۆمەڵ مانای سەرکەوتنی تاکە ، داکەوتنی کۆمەڵیش مانای داکەوتن‌و تێکشکاندنی مرۆڤی تاکە .

لەم سەردەمەی ئێمەدا دەبینین نووسەران‌و هونەرمەندانی واقیعی‌و ریالست رۆژ لەدوای رۆژ لە بوژاندنەوەیەکی هەمیشەیی‌و هەردەم بەرەو پێشەوە هەنگاو دەنێن . بەرادەیەك نووسەرە هەرە بەناو بانگەکانی ئەم سەردەمەی ئێمە لەو نووسەرو هونەرمەندانەن کە رێبازی ریالیزمیان گرتۆتەبەرو دژی چەوسێنەرو داگیرکەر دیکتاتۆریەت دەوەستن . بەڵام ئەوەی جێی ستەم‌و داخە ئەوەیە کە هەندێك لە رۆشنبیران‌و نووسەرانی وولاتە تازەپێگەیشتووەکان لە جیهانی سێهەمدا پەیڕەوی بیرو باوەڕی وجودی بێ‌هوودەیی دەکەن‌و خۆیان بەرامبەر هەموو ئێش‌و ئازارو ئەشکەنجەکانی کۆمەڵگاکانیان گێل دەکەن . راستیەکی گومان لێ‌نەکراوە کە هەر نووسەرێك بێت‌و لاسایی ئەو تەوژمە بۆرژوازیانە بکاتەوە ، سەرئەنجامی ووشك بوونەوەیەو ئەدەبێکی نەزۆك دێنێتە کایەوەو بەرهەمەکەیشی بەرهەمێکی نەمرو زیندو نابێت . بائەوە لەیاد نەکەین ئەگەر ژیان ناماقوڵ بێت لای لێ‌هوودیەکان ، ئەوە شایستەی باسکردن‌و لێکۆڵینەوەی راستەقینەیە لای نووسەری ریالست گەر لەلای نووسەرانی ناماقوڵ مرۆڤ دوای تەراویلکە (سراب) کەوتبێت ئەوە لای ریالستەکان مرۆڤ دوای بیرو باوەڕ کەوتووە . بێگومان هەموبیرو باوەڕێکی بێ‌هودیی سوقیەت‌و بەرەلایی هەردەم لەخزمەتی سەرمایەدارو بۆرژواو شێخ‌و ئاغادایە . بەرادەیەك ستەم کار کلیلی قەدەغە لەدەرگای هەموو بیرو باوەڕێك دەدات ، تەنها دەرگای بێ هودەیی نەبی . . ! جانازانم کێ رایەکی کەی هەیە بادەری بڕێت .

## پەراوێزەکان

١ – موسوعة المصطلح النقدى– اللامعقول–نووسینی : ئارنۆڵد پ .هنجلف . وەرگێڕانی د . عبدالواحد لؤلؤة . وزارة الثقافة والفنون . بغداد ١٩٧٩ ،ل ٩ .

٢ – المسرحية من أبسن الى اليوت . نووسینی ريموند وليمز . وەرگێڕانی . د .فايز أسكندر . وزارة الثقافة والأرشاد القومي . القاهرة . ١٩٦٣ ، ل ، ١٧٢ .

٣ – سەرچاوەی پێشوو . ل ، ١٥٠ .

٤ – مسرحية هنرى الرابع ، نووسین . لويجى بيراندللو وەرگێرانی ، محمد اسماعيل محمد ، الدار القومية للطباعة والنشر القاهرة ، ١٩٦٦ – پێشەکیەکەی وەرگێڕ–ل ، ٢١ .

٥ – موسوعة المصطلح النقدي – اللامعقول . ل ، ٦٢ .

٦ – تأريخ المسرح الحديث ، نووسین جنڤيف سيرو . وەرگێڕانی ،د . بدرالدين القاسم وزارة التعليم العالي . جامعة دمشق ، ١٩٧٤ ، ل ،٢٤ .

٧ – سەرچاوەی پێشوو .ل ،١٨ .

٨ – أليوت– نووسینو وەرگێڕانی دکتۆر فائق متي . دار المعارف بمصر ، ١٩٦٦ .هەڵبەستی–رجال الجوف–ل ،١٥٠ .

٩ – مسرح اللامعقول وقضايا أخرى .يوسف عبدالمسيح ثروة . بيروت ١٩٧٥ ، ل ، ١٠ .

١٠ – دراسات في المسرح المعاصر . نووسینی يوسف عبد المسيح ثروة منشورات مكتبة النهضة بغداد ١٩٧٢ ،ل ،١٩

١٢ – مجلة الأقلام . العدد (٥) السنة التاسعة ١٩٧٣ . العبث والحريه . مؤيد الطلال ،ل ،١٣ . ل ،٢٣٨

١٣– المسرح الفرنسي المعاصر . دكتور لطفي فام . الدار القومية للطباعة والنشر . القاهره ل ٢٣٨

١٤– سەرچاوەی پێشوو ل ، ٢٥٥ .

١٥– (أوجين يونسكو( وسیٚشانۆگەرییی (المغنية الصلعاء . الدرس . الرباعيه)وەرگێرانی (محمد جمعه)و (محمود خجازى) القاهرة ١٩٦٤

– پێشەکیەکەی دوەرگێڕ–ل ،٥٣ .

١٦– تأريخ المسرح الحديث ل ، ٥١ .

١٧– دراسات في المسرحية الحديثة . نووسین . موس السوداني .منشورات وزارة الاعلام العراقية . بغداد ، ل ،١٦ .

١٨ – سەرچاوەی پێشوو .ل ٥٢ .



# پەیوەندی شانۆ بە هونەرەکانی ترەوە

نووسینی: د. کمال عبید
وەرگێڕانی: عبدالکریم محمود شێخانی

● شانۆ باوکی هونەرە . ئەم ووتەیە کە بەسەر زار و زمانانەوەیە وامان لیّ دەکات بەو چاوە سەیری بکەین کە باوکی (شرعی)ی هەموو هونەرەکانە . باشە دەبێ تا کەی ئەم ووتەیە وەربگرین کە لە نێوان شانۆخوازەکان و خەڵکی تردا بڵاوبۆتەوە و بە جۆرێکی ئەوتۆ کە ووتوویژ لە سەر کردنی بۆتە جۆرە کات بە فیڕۆدانێك ، یان مرۆڤ تاوانبار کردن بەوەی کە نرخ و ڕاستی‌ی شانۆ نازانێت؟

شانۆ هونەرێکی باڵا و ڕەسەنە . باڵایە چونکە توانیوێتی لە سەدەی پێنجەمی پێش زایینەوە تا کۆتایی سەدەی بیستەم خۆی لەبەر هونەرەکانی تردا ڕابگرێت کە بە درێژایی ئەو سەردەمە سەریان هەڵدا ، هەروەها توانی ئەو مەیدانەی بکات بە هۆی پەرەسەندن و گەشەکردنی هونەرەکانی تری هاوسێ . سەرەڕای ئەمە و ئەوەش لەوەدا سەرکەوت کە بیر و باوەڕی مرۆڤانە پێشکەش بە خەڵك . بە مرۆڤی ئاسایی و پاشا و ئیمپراتورەکان بکات . ئەمەش بە هۆی نووسەری بەرزەوە بوو کە شانۆ ئاراستەی کردن بۆ ئەوەی بە قووڵترین ناخی مرۆڤایەتیدا بچنە خوارێ تا زوڵم و زۆری لەناوبەرن و بە شوێن مرۆڤ و ڕووناکی و دادپەروەریدا بگەڕێن .

بە تەواوی وەك (مۆریس ماتەرلینگ)ی بەلچیکایی لە دراماکەیدا (چۆلەکەی شین) کە بە دوای بەختیاریدا گەڕا ، یان وەك شکسپیر کە لە زوربەی دراما باڵاکانیدا بە شوێن مرۆڤایەتیدا گەڕا . لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ، ئێمە ناتوانین حوکمێکی ڕەهای تێدا بدەین ، یان حوکمێکی ڕەهای پێ بدەین و بڵێین : شانۆ باوکی هونەرەکانە ، بۆچی؟ یەکەم ، چونکە لەوەتەی هونەرەکان پەیدابوون ، هیچ هونەرێکی جێگیر یان نەگۆڕ نی‌یە . دووەمیش چونکە ناکرێت ئەو هونەرانە وەك خێزانێکی ئاسایی لە ماوەی یەك سەردەمدا بمێننەوە . ئەمەش بە ڕەچاو کردنی ئەوە کە گەشەکردنی ئایدیۆلۆجی و ڕۆشنبیری . کاتێك هونەرێك دەپێچێتەوە . یارمەتی‌ی لە دایك بوونی هونەرێکی تازەی تر دەدات لە ئەنجامی خولی سروشتی‌ی مرۆڤایەتی و مێژوو . بۆ

نموونە ، تەنانەت با هونەرێکی وەك هونەری ڕۆمانتیکی زیاتر لە سەدەیەکیش لە زۆر وولاتدا ڕەگی خۆی داکوتابێت کە پێویست ناکات ئێمە باسیان بکەین چونکە لای هەموو کەس ئاشکرایە .

سێیەمیش ، چونکە ئەو ماوە درێژەی ڕۆژگار بە درێژایی مێژوو ، لە ئەنجامی باری شارستانێتی و لە دایك بوونی تەکنیك و ، دوای ئەوە سەر هەڵدانی هونەری جیا جیا ، بەندیوارییەکی پتەوی بە پەیوەندیی شانۆ و بەو هونەرە سەر هەڵداوانەوە هەیە ، بەو مانایەی کە هونەرێکی وەك هونەری (ئیعلان)- کە گرنگترینی ئەو هونەرانەیە و بەندیوارییان بە هونەری شانۆوە هەیەو لە ڕژێمێکی گونجاوی گرنگدا هەرەوەزیی لەگەڵدا دەکەن – نەبووە و شانۆ نەیزانیوە تا دوای پەیدابوونی هونەری نووسین کە لەگەڵ دەرچوونی پیت و چاپخانە لە ناوەڕاستی سەدەی پانزەهەم ، ئینجا سەرەتای سەدەی شانزەهەم دوای ئەوە سەری هەڵدا .[1] جا ئەگەر سەیرێکی ئامانجی هونەری ئیعلانمان کرد ، وەك دەروون ووروژاندن بە بەکار هێنانی هۆی هێڵکاری و نووسین و نیگار و نەخش و ڕوون کردنەوە و هونەری هێڵکاری و وێنەکێشان و چاپکردن و نەخشەی ڕوونکاریی سەر دیوار ، یان ماددەی جیاوازی وەك تەختە و ئاسن بۆ خزمەت کردنی ئامانجی ئایدیۆلۆجی و ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و هونەری . . ئایا ئەوەیان بۆ دەرناکەوێت کە هونەرێکی نوێی وەك هونەری ئیعلان لە سەردەمی شانۆی یۆنانیی کۆندا وەك هونەرێکی گشتیی ئەمڕۆ کە وای لێ بکات کار بکاتە سەر جەماوەری هاوچەرخ ، هێشتا پەیدا نەبوو بوو؟ یاخود ئایا ئەوەمان بۆ ڕوون نابێتەوە کە (برتۆلت بریخت)ی ئەڵەمانیی خاوەن داستان لە شانۆکەیدا (بەرلینر ئینسامبل) ، کە هەموو ئامانجەکانی شانۆکەی بەم ڕەگەز گشتییانە هێنایە دی کە لە هونەری ئیعلاندا هەن؟

کە باسی پەیوەندیی شانۆ بە هونەرێکی ترەوە دەکەین مەبەستمان کام هونەرە لە کاتێکدا کە ژمارەی هونەرەکان لە سەد هونەر تێپەری کردووە و ماوەی ناو بردنیانمان نییە؟ بەڵام تەنیا ناوی ئەوانەیان دەبەین کە پەیوەندیی زیاتریان بە شانۆوە هەیە ، وەك هونەری (تشکیلی)و (تجرید)و وێنەکێشان و پێشکەشکردن و نواندن و هونەرەکانی کۆمەڵ و جووڵانەوە و هونەری خۆلی و نیگار و سەما و باڵێ و (زخرفة)و زەخرەفەی گڵی و کۆڵین و سێرك و سینەما و شیعر و هونەری گەل و هونەری بێ دەنگ (پانتۆمایم) و هونەری دوانگە (منصة)و ئیعلان . . . و زۆر هونەری تریش لەو هونەرانەی کە ناو بە ناو لە نێوان هونەرەکانی شانۆدا پەیدا دەبن و ناو بە ناویش نامێنن . بەم شێوەیە کارەکە بە ڕاستی سەرسوڕهێنەرە ، چونکە کاتێ بەرپەرچی ئەو ڕایە دەدەینەوە ، یان دەستەواژەی «شانۆ باوکی هونەرەکانە» بە باش نازانین . هەرچەندە من شانۆزانم-ئێمە بە پێی توانا و بۆ دەرخستنی ڕاستیی ئەو دەربڕینە بە شێوەیەکی زانیارییانە و ڕاست ووت و وێژی لەسەر دەکەین ، بێ ئەوەی دوای ئەو گوتانە بکەوین کە لەگەڵ مانای دەربڕینەکەدا ناگونجێن یان دانی پێدا نانێن .

هەر هونەرێك لەو هونەرانە لە بار و پێویستییەکی دیاری کراودا دێتە کایەوە کە سروشتی ئەو سەردەمەی هونەرەکە چاوی تێدا دەکاتەوە دەیسەپێنێت و ، ئەو هونەرەش شوێنی خۆی دەکاتەوە تا هونەرێکی نوێی تر سەر هەڵ دەدات کە شتی نوێ بخاتە ڕوو ، و هونەری یەکەم بپێچێتەوە ، یان بیخاتە جیهانی مێژووەوە . ئەمە وەك سروشتی هەموو شتێکە ، سروشتی هونەریشە .

لێرەدا ئەو هونەرانەی پەیوەندییان بە شانۆوە هەیە دەکەین بە دوو بەشەوە . هونەری زۆرکاری (جبری)و هونەری ویستکاریی (إختیاری) . هونەرە زۆرکارییەکان ئەوانەن کە هەر دەبێت شانۆ بەکاریان . بهێنێت . تەنانەت ئەو هونەرانە تێکەڵ بە پێکهاتە زمانییە هونەرییەکەش دەبن و ناکرێ وازیان لێ بهێنرێت ، ئەگینا شانۆ ئەو هونەرە شانۆگەرییەی خۆی نامێنێت .

بەڵام هونەرە ویستکارییەکان ئەوانەن کە دەشێ لە ناو پێکهاتە هونەرییەکەی هونەری شانۆدا هەبن و لەوانەشە نەبن بە جۆرێك کە کارێکی ئەوتۆ ناکەنە سەر هونەری شانۆیی .

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ، پێویستە دەست بۆ ئەوە درێژ بکەین کە سنوورێکی دیاری کراو لە نێوان هونەرە زۆرکارییەکان و هونەرە ویستکارییەکاندا نییە . بەو واتایە کە لە سەردەمێکی دیاری کراودا هەن و لە سەردەمێکی تریشدا نین .

تەنانەت لەوانەیە کە لە یەك سەردەم و لە یەك وولاتدا دەرهێنانی شانۆیی ئاوازی

هونەری گەلی بەکار بهێنێت وەك (برخت) گۆرانی ی ناو بازاڕ و کۆمەڵە کۆرالی یەکانی بەکار هێنا ، کەچی دەرهێنانێکی تری شانۆیی نایەوێت سوود لەو ووزە و توانا فۆلکلۆری یانە وەرگرێت . تێك چڕژان و دژایەتی لە هونەری شانۆدا لەمەدا خۆی دەنوێنێت ، ئەو تێك چڕژان و دژایەتی یە کە بوونی شانۆ دەوڵەمەندتر دەکات و دەیکاتە مەتەڵێکی هەمیشەیی .

• هونەرە زۆرکاری یەکان :

لە واقیعی سەرنج دانی هاوچەرخ و بایەخ دان بە مێژوو ، و لقەکانی ، ئەم هونەرانە دەکرێن بەم بەشانەوە :

**أ – هونەری دیکۆر و دیمەنە شانۆیی یەکان :**

ئەمرۆ لە سەدەی بیستەمدا ناتوانین هونەری دیکۆر و دیمەنە شانۆیەکان بخەینە پشت گوێ . دەزانین کە دیمەنی شانۆیی لە شانۆی یۆنانی ی کۆن و پێش ئەویش لە سەردەمە بەردی یەکاندا ، بایەخێکی ئەوتۆی نەبووە . وێنە ئیسپانیایی یەکانی سەردەمە بەردی یەکان کە دۆزراونەتەوە ڕووداوی ڕاووشکار و وێنەی مرۆڤ و گیانەوەر پێکەوە بە قەبارەیەك کە لە نێوان ١٠–١٥ سانتیمەترادایە دەردەخەن و هەروەك دیمەنێکی شانۆگەریش ڕووداو و جووڵانەوە و چالاکی و دەربڕینی تێدایە ، جا ئەمە هی ژنان بێت لە کاتێك‌دا کە خەریکی جل و بەرگ دروون و بەروبووم کۆ کردنەوەن ، یان هی ئەو پیاوانەی کە خەریکی ڕاوە ئاژەڵ و ڕاوە ماسین . بۆ نواندنی ڕووداوەکەش لەو ئەشکەوت و بناری ئەو شاخانەدا خۆیان ئامادە دەکرد کە مرۆڤ کردبووی بە یەکەم شوێنی نیشتەجێ ی خۆی پێش قۆناغی کشتوکاڵ و جێگیر بوون . لە شانۆ سەرەتایی یەکانی بەرایی ئیغریق (گریکی)دا نواندن بە ڕۆژی ڕووناك لە شانۆیەکی ئاوەڵادا دەکرا کە جێگەی سی هەزار بینەری تێدا دەبووە و بێ دیمەن و دیکۆری شانۆیی و بێ ڕووناکیش بوو .

هەروەها دەزانین لە سەردەمی تازەماندا شانۆی (برسی گرۆتفسکی)ی پۆڵەندی نەترسانە تاقیکاری یەکەی خۆی بە ناوی (بەرە و شانۆیەکی هەژار)[2] بەکار هێنا ، ئەو شانۆیە سەیرەی کە وازی لە دیکۆر و جلی شانۆیی هێنا و زۆر جاریش وازی لە هونەری مۆسیقا و بایەخە زۆرەی بە توانای ووشە و هاوکاری کردنی لەگەڵ جووڵانەوەی لەشی ئەکتەرەکانیش هێنا .

لە نێوان ئەو تاقی‌کردنەوە تازانەدا– ئەوانەی کە ئەوەندەیان پێ نەچوو لەناوچوون یان بڵێین شاردرانەوە– باسی شانۆی چایخانە و شەقام و گەراج و (بەدرۆن)مان گوێ لێ دەبێت کە ئەوانیش ئەوەندە گوێ نادەنە دیکۆر ، یان دیمەن ،ئەمەش بە هۆی سروشتی ئەو شوێنەی نواندنەکەی تێدا ڕوو دەدات ، یان بە هۆی ئەوەی کە ناتوانرێت دیکۆر بە شێوەیەکی هونەری جێ‌بەجێ بکرێت .

هەروەها ئەوە باس دەکەین کە شانوی شکسپیری یان (ئەلیەزابیثی)سەبارەت بە دیکۆر یان دیمەنەوە بەرەو نیشانە یان(رمز)ەوە چوو . پێویستیش بوو کە وا بکات ، بە تایباتی لە شانۆگەری یەکانی ولیەم شکسپیردا کە دیمەنی تێدا یەك لە دوای یەك دێن وەك دیمەنەکانی سینەمای ئەمرۆ ، بە شێوەیەکی سەرسوڕهێن دیمەنە شانۆیی یەکانی جیا و هەموو جۆرن ، لە شەقامێکەوە بۆ کۆشکێك ، بۆ شوێنی خەوتن ، بۆ مەیخانەیەك ، بۆ مەیدانی شەڕ ، بۆ گۆڕێك ، یان بۆ قەڵایەك وەکو لە شانۆگەری یەکانی (قەیسەر و کلیۆباترا ، ئۆتێللو «عطیل» ، ماکبث و ، ڕۆمیۆجولیت)دا دیارە .

پێویستە ئەوەش بڵێین کە دیکۆر لە نێوان ئەو سەردەمانە و لەناو شانۆ و شانۆگەری یەکاندا وا بەرجەستە نەبووە کە لەم دوایی یە لە شانۆی سروشتی ، یان ڕۆمانتیکی ، یان شانۆی واقیعی ، یان کۆمەڵایەتی‌دا دەی بنین . لە شانۆی سروشتی‌دا لای (ئەندریا ئەنتوان) چاومان بە ووردترین دیمەنی دوکانی قەساب دەکەوێت ، و بەڵکو کارە شانۆیی و ئێکسواری یەکان وامان لێ دەکەن کە تەنانەت ئەو دڵۆپە خوێنانەش بەدی بکەین کە ناو بەناو لەو لاشە گۆشتە دەکەونە خوارێ کە لە شوێنێکی دیاری سە تەختەی شانۆکدا هەڵواسراوە . لە شانوی ڤیکتۆر هوگۆی ڕۆمانتیکیش‌دا دەبوایە دیکۆرێکی ووردی ئەوتۆ هەبێت کە (مذهب)ی ڕۆمانسی ی پێوە دیار بێت . ئەی ئەگەر وا نەبێت چۆن لە شیعر و شاعیریەت دەگەین لە دیمەنی بەیەك گەیشتنە شارراوەکەی درامای (سیرانو دی بەرجراك)ی شاکاری ئەدمۆند ڕۆستان؟یان ئایا مەکسیم گۆرکی ساڵی ١٩٠٢ لە شانۆگەری یەکەی‌دا «چلپاو»زۆر بە ووردی سەیری هەژارە کلۆڵەکانی نەکردووە کاتێك بیست کلۆڵ لە ژوورێك لە ژێر زەبری قامچی کۆستیلۆڤی بۆرژوازی و ژنەکەی لە شانۆیەکی ڕاستی واقیعی ی ڕاستەوخۆدا دادەنێت؟لەم بابەتەش لای باوکی شانۆی کۆمەڵایەتی ی نەرویجی (هەنریك یبس)بە هەموو ووردەکاری یەکەوە هەیە ، بە تایبەتی لە هەردوو شانۆگەری یەکەی‌دا(ماڵی نۆڕای بووکە شووشە)یان (سۆلنسی گەورەی

بەناکان) .

لێرەدا بایەخی هونەری دیکۆر و دیمەنی شانۆیی هونەرەکانی شانۆمان بۆ دەردەکەوێت ، لەگەڵ ئەوەی کە بایەخیش بەو تاقی‌کردنەوەیە تازانە دەدەین کە ئەم هونەرە دەخاتە پشت‌گوێ و بڕواشیان وایە کە درەنگ یان زوو هەر دەبێت بگەڕێتەوە بۆ بەکار هێنانی دیکۆر بۆ ئەوەی بینەران هەست بە واقیع بکەن و لە تیشکۆی (تجرید)یان بپچڕێت هەرچەندە ئەگەر دان بەوەدا بنێن کە هەستی بینەرانی دەوورووژێنێت ، بەڵام لە ڕاستی‌دا بەرەو پێچ و پەنا و ڕێگای ناڕاستەوخۆیان دەبات و لە نیشانەی داخراو و گرێ کوێرە بەولاوە هیچی تر لای بینەران زیاد ناکات . بەڵام کاری شانۆ–بە پێی پێویستی و ئەرکەکانی – دەبێت ، یان پێویستە تەنیا هەست وورووژاندن نەبێت ، بەڵکو دەبێت بیگۆڕێت بۆ بیرێك یان پەیڕەوکردنی ڕەفتارێك ، بە تایبەتی دوای ئەوەی کە ئەمڕۆکاری شانۆ بووە بە کارێکی گەلی بەر لەوەی کە تەنیا هەر کارێکی هونەری بێت . ئایا ئەمەش بەڵگەیی‌یە بۆ ئەوە کە شەپۆلی «هونەر هەر بۆ هونەرە» بەرەو نەمان چووە .

**ب – هونەری دوان و هونەری نواندن :**

دوو هونەری سەرەکین و هەر واش دەبن . لێرەش‌دا پێویست بە درێژە پێ‌دان ناکات . لە ڕاستی‌دا هونەری دوێنەر لە هونەری نوێنەری (ئەکتەر) جیایە و . . وەکو مامۆستا دکتۆر زکی طلیمات[3] دەڵێت–لە ژێر باڵی دەوری شانۆیی‌دا تێکەڵ بە هونەری نواندن دەبێت و ناچاریشە کە زوربەی ڕەگەزەکانی هونەری دوێنەر بەکار بهێنێت . هونەری نواندن هونەری هونەرە سەرەکی‌یەکانی پێکهێنانی هونەری شانۆیە و کەمترەرخەمی لەو هونەرەدا دەبێتە هۆی لەناوچوونی شانۆ و هونەری شانۆیی . بەڵگەش بۆ ئەمە هەرەس هێنانی هونەری هاوچەرخە لە شانۆ عەرەبی‌یەکاندا ، لە کاتێك‌دا هەڵی قسەکردن لەناو دەچێت و کرداری هونەری – لە گاڵتەجاری جیاناکرێتەوە لە شانۆدا . . ئەو شوێنەی کە گەلان دەرس و پەندی لێ وەردەگرن .

دەشتوانین بڵێین کە هەردوو هونەرەکە (دوان و نواندن) بەندیواری‌یەکی پتەویان بە زمانی زگماکیانەوە هەیە ، لێرەدا مەبەستم زمانی عەرەبی‌یەو ، تاکو زمانەکەمان زیاتر بەسەر شانۆگەری‌دا ، پەخشان یان شیعر–زاڵ بێت ، ئەوا هونەری شانۆ پتر بەرەو چاکی و بەرزی دەچێت و ، تاکو شێوە زمانە هەموجۆرەکان تێکەڵی شانۆ بن ، ئەوا هونەری شانۆ لە سەنگ و کێش‌دا بەرەو سووکی دەچێت . . . هاوکێشەیەکە ڕاڤە کردنی گرانە .

**ج – هونەری بینا :**

ئەمیش هونەرێکی کۆنە و لە سەرەتای پەی‌دا بوونی شانۆوە بەندایواری‌ی پێ‌یەوە هەیە و کار دەکاتە سەر دامەزراندنی شانۆ ، یان وەکو دەڵێن «شانۆخانە»«الدار المسرحية» . ئەم کار تێ کردنەش لەوە پەی‌دا دەبێت کە بیناسازی‌ی شوێنە شانۆیی‌یەکە بێ‌گومان شێوەیەکی بیناسازی دەسەپێنێت ، کە سەرەنجام کاریش دەکاتە سەر هونەری شانۆیی .

لەوانەشە زۆرم پێ لێ هەڵ نەبڕیێ ئەگەر بڵێم ئەو کاریگەری‌یە دەگاتە هونەری نواندنیش ، بەڵام ئەمە چۆن؟

لە سەرەتای سەدەی بیستەم‌دا (ماکس راینهارت)[4]ی دەرهێنەری نەمسایی لە ساڵی ۱۹۱۱ دا درامای (ئۆدیۆس پاشای مەیدانی سێرك)ی بە یارمەتی‌دانی زیاتر لە ۲۰۰ کۆمبارس لە دەوری ناسەرەکی‌دا بۆ پیشان‌دانی جەماوەری ئەثینای سەردەمی مێژوو و . ڕووداوەکانی درامای سۆفۆکلیس پێشکەش کرد . هەروەها بیناسازی‌ی ئیتالیایی بەناوبانگ لە لایەن زوربەی شانۆ عەرەبی‌یەکان پەیرەوی کراوە ئەم جۆرەیان شانۆ دەکات بە دوو بەشەوە ، شوێنی نواندن و شوێنی بینەران . لەم بارەیەشەوە (فاروق شعبان)ی لێ‌کۆڵەرەوە نامەیەکی نوێی پێشکەشی ئەکادیمیای زانیاری‌ی هەنگاری (مەجەری)کردووە لە ۱۷ ی ئەیلوول (سێپتەمبەر) ی ساڵی ۱۹۷۹ دا بۆ وەرگرتنی پلەی دکتۆرا لە ئەندازەدا بە ناونیشانی (بەکار هێنانی شوێنەواری سروشتی بۆ بیناسازی‌ی شانۆیی) . دڵێم بیناسازی دەورێکی باڵای لە هونەری شانۆی‌یدا هەیە . باشە چۆن بینای شانۆیەکی ئیتالیایی دەتوانێت درامایەکی ڕەسەنی یۆنانی پێشکەش بکات کە مۆرکی بیناسازی‌ی یۆنانی پێوە بێت؟ ئایا ئەم پێشکەش کردنە دژایەتی ، یان بڵێم خۆ خەڵەتاندنێکی هونەری نی‌یە؟ ئەو تاقی‌کردنەوەی (کرم مطاوع)ی‌دەرهێنەر کە لە شانۆی (الجيب المصری)لە ساڵی ۱۹٦٤ دا پێشکەشی کرد ، کاتێك هۆڵی بینەرەکانی گۆڕی بۆ هۆڵێکی بازنەیی و ڕیزێمی کورسی‌یەکانی گۆڕی بۆ ئەوەی نواندنەکە لە ناوەڕاست‌دا بێت ، تاقی‌کردنەوەیەکی ڕاست و دروست بوو .

◀

کاتێکیش کە خوا لێ خۆش بوو (نجیب سرور)دراماییەکی بە ناونیشانی (أ ب)لەسەر هەمان شانۆی بازنەیی و ڕووداوەکانی دەرهێنا . لە بینەرەکان نزیك بووەوە و پەردەی سەرەتای لابرد و لە گیانی سەردەمەکە نزیك کەوتەوە و بە ئێجگاری بیناسازی‌ی ئیتالیایی ناباوی خستە پشت گوێ . دەشێ کە ڕاستی‌ی ئەو دژایەتی‌یەی بیناسازیمان بەدی کردبێت ئەگەر درامای (ئەنتیجۆنا)مان لەسەر شانۆ سووتاوەکەی (دار الأوبرا المصرية)دا چاو پێ کەوتبێت . نە ڕووناکی ، نە پەردەی پاشایانەی ئەرخەوانی و نە ڕێژنمە کۆنەکەی شانۆکە . توانی ئەو بەربەستە گەورەیەی نێوان تەختەی شانۆ و لۆج و کۆشك و دەورەکان نەهێڵن . کە بە ڕاستیٔ لە گیروگرفتەکانی بیناسازی‌ی شانۆی هاوچەرخە سەبارەت بە شانۆ و هونەری شانۆوە وەکو یەك .

**د – هونەری بێ دەنگ (پانتۆمایم : Pantomime**

بە ڕای ئێمە و ڕای زوربەی شانۆزانە هاوچەرخەکان ، هونەری بێ دەنگ لەو هونەرە سەرەکی‌یانەیە کە بەندیواری‌یەکی پتەوی بە هونەری شانۆیی‌یەوە هەیە . مەبەستمان لێرەدا ئەو شانۆگەری‌یە بێ دەنگانە نی‌یە کە مارسیل مارسۆ Marcel Marceau ی فەرەنسایی و تیپە سەربەخۆکەی کە چەندانێکی لە فەرەنسا و دەرەوەی فەرەنسادا لێ پێشکەش کردن ، تاکو لە ساڵی (١٩٤٦)ەوە توانی سەرکەوتنێکی جیهانی لەم ڕووەوە وەدەست بهێنێت ، بەڵکو بەراستی مەبەستمان ئەو هەوڵانەیە کە شارلی شاپلنی هونەرمەندی جیهانی لە فلیمی بێ دەنگدا دای و ئەرکی (راینهارت)ی دەرهێنەری نەمسایی و تایرۆف و مایەرهۆلدی ڕووسی‌یە . هەروەها مەبەستیشمان هەندێك لەو هونەرمەندە فەرەنسایی‌یانەیە کە ئەرکێکی زۆریان لە هونەری بێ دەنگ‌دا کێشاوە . وەکو (دکرۆ .E Decraux . چ سەبارەت بەوانەی کە لە قوتابخانەی نواندنی پاریس . یان لە شانۆی (ئەلفیە کۆلۆبییە) دا پێشکەشی کردن . هەروەها (جاك کۆبۆ)ی دەرهێنەری فەرەنسایی لە ساڵی ١٩٢٣ دا . دوای ئەوەش بەردەوامی‌ی دکرۆ لەگەڵ دەرهێنەری فەرەنسایی هاوچەرخدا (جان لوی بارۆ)لە ساڵی (١٩٣١)ەوە ، ئەو بەردەوامی‌یەی کە هونەری بێ دەنگی ویژدانی بە دابەش کردنێکی زانیاری‌یانەی ڕەسەن پێشکەش کرد ، بە مانای جیاکردنەوەی جیهانی بابەت وەك پێکهاتوویەکی بزێو و کەسایەتی و بیرۆکە (فکرة) و ئامرازی دەربڕینی هونەری ، ئەمانە هەموو ، (مارسۆ)لە نمایشنامەی پانتۆمایم‌دا پێشکەشی کردن . نمایشنامەکانیش ئەمانەن : (پەیژەکان ، دژی با ، بیللانجۆ ، لاوان ، پی‌گەیشتن «کاملی» ، پیرێتی ، مەرگ) .

هەروەها مەبەستیشمان ئەو ماوە زەمانی‌یەیە کە دەربڕین‌دا دەکەوێتە نێوان وشەیەك و یەکێکی ترەوە ، یان نێوان ڕستە و دەستەواژەکانەوە لە زۆر باردا .

ئەم بێ دەنگی‌یە لە جیهانی هونەری شانۆدا مۆسیقایەکی هەوایی‌یە ماوەیەکی دیاری‌کراو داگیر دەکات . . . کە ئەویش ماوەی بێ دەنگی‌یە یان دەتوانین ناوی بنێین هونەری پانتۆمایم .

پێکهاتنی بنیادنانی هونەری پانتۆمایمیش لە سێ یەکە پێك دێت :

- **ئیشارە یان (رمز) Gesture**
- **باری لەش . یان هەڵوێست Attitude**
- **جووڵانەوە . یان گوێزانەوە Movement**

لە یەکەی بەراییدا . . . ئیشارەت لە جووڵاندنەوەی بەشێکی لەشی مرۆڤ پێك دێت . وەك دەست یان سەر بە شێوەیەکی هەرەشەکاری . لە یەکی دووەم‌دا ناوەرۆکە درامی‌یەکە لە شێوە جیاکانی لەش‌دا خەست دەبێتەوە و خۆی دەنوێنێت بە ڕەچاو کردنی ئەوەی کە ئەم یەکەیە لە هونەری بێ دەنگ‌دا گرنگترین ئامرازی دەربڕینە . لە یەکەی سێ‌یەمیش‌دا جووڵانەوە و ڕاگوێزان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر هەندێ جار جێگای دەربڕینی هەست و ڕووداوەکان دەگرێتەوە و هەندێك جاریش بە شێوەی ئیشارەت دەردەبڕێت .

بێ‌گومان ، هونەری بێ دەنگ وەك هەموو هونەر و بوونەوەرێکی تر گەشە پێ‌دانی تێدایە . بۆ نموونە ڕێگا بێ دەنگەکەی دکرۆ وەك هونەرێکی ژمێریاری‌ی شێوە ئەندازەیی لەوە بە دوا ڕێگای بۆ (سوبیران– J.Souberan) ی فەرەنسایی خۆش کرد بۆ تێ هەڵکێش کردنی هەندێك شێوەی گەشەکردوو سەبارەت بە بایاخ دان بە مەودای شوێن و مەودای کات ، هەروەها بۆ جیاکردنەوەیەکی تەواو و توانای نێوان ئەندامەکانی لەش و ئەرکە درامی‌یەکانی لە ناو جووڵانەوەیەکی شیکاری‌دا .

جا ئەگەر هونەری نواندنی شانۆیی پێویستی‌ی بە وەستان و بێ‌دەنگی و بۆشایی هەبێت کە مۆسیقا و گونجان و ماوە ئەنجام بدات ، باوەر ناکەم دەرهێنەرێکی تازە ،

وەك ئەوەی کە پێی دەڵێن نوێنەری نمایشی شانۆیی ، بتوانێت هونەرێکی وا بخاتە پشت گوێ لە کاتێکدا کە خۆی بە خۆشیی هونەری شانۆییەوە خەریك دەکات .

**• هونەرە ویستکارییەکان :**

لە سەرتادا دەڵێین ئەم دابەش کردنانە تەنیا پەیوەندییان بە بیرکردنەوەی کەسایەتی خۆمانەوە هەیە و نەمان خوێندۆتەوە و لاسایی کەسیشمان تێدا نەکردۆتەوە . بەڵام لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی بابەتی پەیوەندیی هونەری شانۆ بە هونەرە دەربڕینکارییەکان (تعبیری)یان (تشکیلی)یەکانی ترەوە هاتووە . ئەمەش وا ناگەیەنێتە کە پۆلێنکارییەکی (تصنیف)تر بدۆزینەوە . گرنگ لێرەدا سەلماندنی هۆی ئەو دابەش کردنە یان پۆلێنکارییە خۆیەتی .

**أ - هونەرە (تشکیلی)یەکان تێکرا :**

وامان بە باش زانی کە هونەرە (تشکیلی)یەکان پێکەوە بخەینە بەشی هونەرە ویستکارییەکان . چونکە چەند هونەرێکی زۆرن و هاوت و هاودژن . لێك نزیکن و لێکیش دوورن ، یا بە لای کەمەوە هەندێکیان زور لە هومەری شانۆوە نزیکن و لە هەمان کاتیشدا هەندێك جار لێیەوە دوورن . تەنانەت لە کۆتاییدا زۆر گرانە سنوورێکی تەواو بۆ ئەرك و پەیوەندییەکانی ئەو هونەرانە دابنێین . بۆ نموونە هونەری وێنەکێشان کە لقێکی سەرەکیی هونەری (تشکیلی) یە سەبارەت بە دەربڕینی هێڵ و ڕەنگەوە لە هونەری شانۆ نزیك دەبێتەوە . بە تایبەتی ئەگەر زانیمان کە تایبەتمەندییە جوانییەکانی لە دەربڕینکاریی بینینداییە . واتە ئەوەی بە چاو دەبینرێت (وێنە کێشانی دەرگایەك یان پەنجەرەیەك لەسەر دیواری دیکۆرەکەدا) . وە لەبەر ئەوەی هونەری وێنەکێشان لەو هونەرە کۆنانەیە کە لە چەرخی ڕاپەڕین (عصر النهضة)دا دەورێکی باڵای بووە ، بە تایبەتی سەبارەت بەوەی وێنەکێشی ئیتالیایی (لیۆناردۆ داڤینشی) ئاشکرای کرد ، لەبەر ئەوە بەندیوارییەکی پتەوی بەو شانۆیەوە هەیە کە گەشەی کردبوو ، یان ئەوسا بەرەو گەشە کردن دەچوو لە کاتی سەر هەڵدانی شانۆی چەرخی ڕاپەڕیندا ، بە تایبەتی لە هەر یەك لە ئیتالیا و ئیسپانیا و ئینگلتەرەدا . لە ئیتالیادا ئەو کاتەی کە جووڵانەوەی تازەی بیناسازی لەسەر دەستی (ئەندریا باللدیۆ) کە یەکێکە لە گەورەترین بیناسازەکانی شانۆ لە ئیتالیالە چەرخی ڕاپەڕیندا سەری هەڵدا ، هەروەها سەبارەت بە سەر هەڵدانی کۆمیدیای هونەر (کۆمیدیا دی لارتی) . لە ئیسپانیاشدا هونەری شانۆ هەروەها هونەری دەربڕینکاری- ئەو ڕەگەزە سەربەستییانەی بەرز کردەوە کە لە لایەکەوە یەکێتیی ئیسپانیای سەبارەت بە کۆمەڵ دەربڕی و لە لایەکی تریشەوە ئەو گیانە ئایینییەی دەنواند کە ئەوسا باڵی بەسەر ئیسپانیادا کێشابوو . بەڵام لە ئینگلتەرەدا ، کاتێك کە شانۆی مرۆڤایەتی لە ڕۆژگارەکانی چەرخی ڕاپەڕیندا زاڵ بوو . بە تایبەتی دوای دڵبێزران و خۆ دوور خستنەوە لە شانۆگەرییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا کە پڕ بوون لە ڕووپۆشی ئایینی و نادیاری و(معجزه) ، هونەری وێنەکێشان توانی شوێنی خوی لە شێوەیەکی شانۆیی شانۆی ئینگلتەرەی ئەوسادا بکاتەوە . شانۆیەکی ئەوتۆ کە تەنیا شێوەکەی لە هی چەرخەکانی ناوەڕاست بچێت . شانۆیەکی سەر نەگیراو ، تەختەی شانۆ لەبەر دەمی بینەرەکانی ناوەڕاستی هۆڵەکەدا درێژ دەبووەوە کە ئەویش سەر نەگیراو بوو ، و سێ لای هەبوو . لەوێدا گەلێك نووسەری ئینگلیز دەرکەوتن (شکسپیر ، مارلۆ ، کید ، گرین ، لۆرج ، ناش ، تبیل ، ئینجا «بن جۆنسۆن»)ی کلۆڵ کە هەموو ڕەخنەگرەکان دەڵێن بەدبەخت بوو چونکە لە سەردەم و کاتی شکسپیردا هاتە جیهانەوە ، ئەو توانا زۆرەی بە تەواوی لە بەرانبەر ئەو پاڵەوانە لە ئیستراتفۆرددا هاتە کزی .

هەروەها چاویشمان بە هونەری (زخرفە) دەکەوێت کە ئەویش هونەری جوانیو ڕازاندنەوەیەو یەکێکە لە لقەکانی هونەری بۆنە (مناسبة)و لە هونەری بیناسازیدا گرنگترین دەوری . هەیە . . (زخرفة)ی بیناسازی و ڕازاندنەوەی . وە هەر وەك زخرفە لە بۆیە کردنی دەرو دیواری کەنیسەکاندا خۆی دەنوێنێت ، ئاواش خۆی لە هونەری شانۆو دیکۆرو دیمەنەکاندا دەنوێنێت . ئەو هونەرە لە شانۆدا بە ڕاستی هونەرێکی پاشکۆیەو بایەخێکی زۆر یان کاریگەری نییەو تەنیا بەرگێکی جوانکاریی پێ دەبەخشێت بەڵام ناگاتە پایەی ڕووداو یان ووریاکردنەوە بۆ شتێکی درامیی گرنگ .

- هەروەها هونەری کۆڵین کە وەکو دەڵێن بە پایەی سێیەم دادەنرێت ،

یەکێکە لە لقەکانی هونەری (تشکیلی). کۆڵین هونەرێکە نزیك لە هونەری بیناسازیو جیاوازیی نێوانیان ئەوەیە کە هونەری کۆڵین دەکەوێتە نێوان هونەرە سەربەخۆکانو هونەری دمەلاسکیو لاسایی‌کردنەوەوە ، کەچی بیناسازی سەر بە هونەرە پاشکۆکانەو بە [ونەری لاسایی‌کردنەوە دانانرێت ، لەبەر ئەوە دەڵێین کە هونەرێکی ویستکاری‌یە و دەتوانرێت لە زۆر جێگای شانۆدا بەکار بهێنرێت ، یان هەر گوێشی نەدرێتێ ، بێ ئەوەی زیانێکی هونەری ببەخشێت. بۆ نموونە ، پەیکەری گورگ گیانداری ئیمپراتۆریەتی رۆمانی – کە دروشمێکی کۆنو ناسراوە – تاکو ئەمرۆش لە شانۆگەری‌ی ئەنتۆنیۆو کلیۆباترای شکسپیردا ، لەهەر شوێنێك پێشکەش بکرێت هەر دادەنرێت بەبێ ئەوەی باسی بکرێت ، تەنیا بۆ پەنجە راکێشان بۆ ئیمپراتۆریەتی رۆمانیو بەرزێتی‌یە لەناو چووەکەی. بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ، هونەری کۆڵین بە دەگمەن لە هونەری شانۆدا بەکار دەهێنرێت و چاوپۆشی لەو بایەخە هونەری‌و هەستە جوانکاری‌یە دەکرێت کە بە تەختەی شانۆی دەبەخشێت. بە رای من ئەو بایەخە کەمەی کە بە هونەری (تشکیلی) دراوە بەوە کە بە تەواوەتی سەر بە هونەری شانۆ نی‌یە وای کردووە یان بۆتە هۆی ئەوە کە لە هەوڵدانی هاوچەرخدا بایەخێکی زۆری پێ نەدرێت ، یان وای کردووە کە لە جووڵانەوەی شانۆگەری‌ی هاوچەرخدا ئەوەندە لەسەر بوونی سوور نەبن.

ئەگینا چۆن دەتوانین ئەوە لێك بدەینەوە کە شانۆی جرۆتفسکی و هەوڵ دانەکانی شانۆی شەقامو چایخانەکانو هی تریش کە وازیان لە ئەرکی هونەرمەندە تشکیلی‌یەکان هێنا؟

**ب – هونەری مۆسیقا :**

بە رای ئێمە هونەری مۆسیقا گرنگترینی هونەرە ویستکاری‌یەکانە لە ژیانی هونەری شانۆگەریدا. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە هاوکاری کردنی نێوانیان گەلێك ئۆپەرێتی سەرکەوتووی پێشکەش کردووەو هەروەها دەشتوانێت گەلێك مۆسیقای گەلیو درامای گۆرانیش پێشکەش بکات. مۆسیقا لە شانۆدا لە سەردەمی شانۆی یۆنانی‌یەوە هەبووە. ئەمەش وا ناگەیەنێت کە مۆسیقا لە قۆناغی شارستانێتی یۆنانی‌یەوە دەستی پێ کردووە ، چونکە مۆسیقای چەرخە کۆنەکان لە میسرو فارس‌و فەلەستیندا بە سێ هەزار ساڵ پێش ئەم قۆناغە کەوتووە. بێ گومان ئەمەش شان بەشانی مۆسیقای تر لە ناوچەی وەك هیندو یابان‌و خۆرهەڵاتی دووردا. گرنگترینی ئەو دۆزینەوانەی لە هونەری مۆسیقادا ماونەتەوە

– ئەوەشی کە پەیوەندی‌ی بە شانۆوە هەیە – ئەو گۆرانی‌یەیە کە لەسەر گۆری درامانووسی یۆنانی‌ی کۆن ئەسکیلۆس‌و ئەو دوو (ترتیل) ەیە کە بۆ خوا (ئەپۆللۆ)یەو لە پەرستگای (دلفی)دا دۆزراونەتەوە. ئەو کەسانەی بایەخیان بە دراماو شانۆ داوە وەك ئەفلاتوون‌و ئەرەستۆ و ئینجا (پلۆتارك)ی مێژوونووس ، خۆیان لە قەرەی مۆسیقاو لێکۆڵینەوەکانیشی داوە.

کەواتە مۆسیقا دەورێکی گرنگ لە ژیانی هونەری شانۆدا دەبینێت ، ئینجا ئەو مۆسیقایە چ بە تایبەتی بۆ ئەوە دانرابێت کە بە تەواوەتی لەگەڵ رووداوەکانی شانۆگەری‌یەکەدا بگونجێت ، یان بە پێی توانا لەو رووداوانە نزیك بێتەوە. بە شێوەیەکی گشتیش لە وولاتە پێشکەوتووەکاندا ئەو مۆسیقایە بە شێوەیەکی هونەری دادەنرێت‌و هەندێك جاریش لە رێگای ئامادە کردنی مۆسیقایی‌یەوە لە مۆسیقای جیهانی یان عەرەبی‌یەوە هەڵ دەبژێرێت. ئەو دەرهێنەرانەش ئەم رێگەیە دەگرن کە لە وولاتەکەی خۆیاندا پارەیان کەمەو ناتوانن مۆسیقای تایبەتی بۆ ئەو شانۆگەری‌یانە بنووسن کە دەریان دەهێنن. ئەم هەڵبژاردنەش چ لە لایەن دەرهێنەرەکان خۆیانەوە ، یان لە لایەن پسپۆرە مۆسیقایی‌یەکانەوە بێت ، بێ گومان لە باری هونەری‌یەوە ئەنجامەکەی لاوازترە.

هەندێك جاریش مۆسیقای سیمفۆنی بەشداری دەکات لە پیشاندانی ئەو شانۆگەری‌یە گەورانەدا کە پێویستی‌یان بە گەورەترین و بالآترین کاری مۆسیقایی هەیەو ئەمەش لە مۆسیقای سیمفۆنیدا دێتە دی ، ئەو مۆسیقایەی کە مێژوویەکی تا رادەیەك باشی هەیە لە سەرەتای تاقی کردنەوەیەوە لە چەرخەکانی راپەرین‌و زیندوو کردنەوەو لە سەردەمی (باروك)دا. دوای ئەوە سەبارەت بە بەکارهێنانی وەك پێشەکی‌یەکی ئۆپێرالی لە کردنەوەی شانۆگەری‌ی ئۆپێراییدا کە لەو سەردەمەدا بە (سینفۆنیا) دەناسرا. لەبەر تواناو رەسەنی‌ی ئەو مۆسیقا سیمفۆنی‌یە ، گەلێك شێوە مۆسیقای تری لێ کەوتەوە ، وەك سۆناتا ، کۆنشێرت ، مۆسیقای هاورێیان (الصحاب) یان مۆسیقای ژوورەوە کە مۆسیقای (شوێنی‌بچووك) یشی پێ دەڵێن.

بەڵام بە تێپەر بوونی رۆژگار و ، لە ئەنجامی پەیوەندی‌ی راستەوخۆی مۆسیقا بە هونەری شانۆوە ، هونەری مۆسیقا

گەلێك شێوەی تری وەرگرت . ئەمەش شتێکی سروشتی بوو کە دەبوایە ئەو گۆڕانو گەشە کردنانە لە ئەنجامی بەکار هێنانی هونەرەکانی مۆسیقا لە نێوان دراماو شانۆگەریی جیاوازدا ڕوو بدەن . شانۆی نوێ پەیوەندیی بە مۆسیقای ئەلەکترۆنیشەوە هەیە کە تا ئێستاش شانۆی (لامعقول) و پاشماوەی ئەو شانۆیە لە ئەوروپادا داگیر دەکات ، ئەویش بریتییە لە دەنگو ئاوازێك کە مۆسیقای کارەبایی دەیڕەخسێنێتو ئەو مۆسیقایەش لە هەندێك ئامێری مۆسیقایی ئەوتۆوە دەردەچێت کە بە کارەباوە نووساون یان لە لێك کەوتنی هەندێك ئامێری ئاسنین یا مسینەوە دەردەچێت ، ئەو ئامێرانەش لە ئامێرەکانی تری مۆسیقا جیان کە ڕاستەوخۆ دەنگێکی ناسازیان لێوە دەردەچێت بێ ئەوەی بە هێزی کارەبا ساز بکرێن . لەبەر ئەوە سەبارەت بە هێزی دەنگەکەو کاریگەریو ماوەو ئەو بۆشاییە کاتیو شوێنییەی داگیری دەکەن ، ئەنجامی کۆتاییشیان جیایە .

ئەو مۆسیقا مادییانە (Musique Concr'ete) ، کە شێوەیەکی مۆسیقای ئەلەکترۆنین لەسەر شریتی تۆمار کردن دەنگە دەنگو هەرایەکی تایبەتی تۆمار دەکەن کە ئەگەر بە خێراییەك لێ بدرێت جیابێت لە خێرایی ئاسایی تۆمارکەرە (ریکۆرد)ەکە ، ئەوا چەوتیو شێواوی پەیدا دەکات .

ئیتر . . . هەندێك پەیوەندیی تری گرنگ بە هونەری شانۆوە هەیە ، ئەو پەیوەندییانەش لە چوارچێوەی پارمەتیدەر ، یان لە شێوەی هونەری تازەدا کاریگەرنو لە زمانی هونەریدا دەردەکەون ، وەك لە هونەری سینەمادا یان وەکو پێیی دەڵێن هونەری حەوتەم ، وە لەگەڵ ئەوەی کە شانۆ لە نمایشەکانیدا سینەما یان هەندێك شریت بەکار دێنێت بۆ ئەوەی کار بکاتە سەر ئەو جەماوەرەی کە لەم ساڵانەی دواییەدا زۆر حەز لە سینەما دەکاتو لەگەڵ ئەوەشدا سینەما بە تەواوی پشت بە دراممای شانۆییەوە دەبەستێ بیکات بە شریتی خەیاڵی ، مێژووی هونەر پێچەوانەی ئەمە تۆمار دەکات ، ئەویش ئەوەیە کە شریتی خەیاڵیی سەرکەوتوو بە دووبارە نووسینەوە بگۆڕرێت بۆ دراما وەك لە ئەدەبی فەرەنساییو سۆڤیاتیدا ڕوویدا .

ئەم لێکۆڵینەوەیە ماوەی ئەوە نادات کە باسی پەیوەندییە هونەرییەکان ، یان ئیستاتیکیی جوانکاریی نێوان هونەری شانۆو هونەرە هاوچەرخەکانی تری وەك هونەری (تجریدی)و هونەری سەماو هونەری دوانگە بکەین ، بەڵام ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە پەیوەندییەکی سروشتی لە نێوان هونەری شانۆو هونەرەکانی تر ، یان بە ووتەیەکی ڕاسترلە نێوان بەشی زۆری هونەرەکانی تردا هەیە ، بەڵام پەیوەندیی هاوکاریو پێگەیینو گونجانە ، نەك پەیوەندیی باوك بە ڕۆڵەکانیەوە . بەم بیروڕایەوە ، جارێکی تریش ، شانۆ بە باوکی هونەرەکان دانانێین وەکو دەڵێن .

**پەراوێزەکان :**

١ - کتێبەکەی لۆخهایمەر Lochheimer لە مۆسیقادا بە پروانامەی گۆرانییەکان دەژمێررێت . لە ساڵی ١٤٤٠ ز . دا نووسراوەو ٦٠ پارچەی لە دەنگی چەند دانەرێکی نەناسراوی تێدایە و باسی باری پۆلیفۆنی ئەڵمانی دەکات لە نێوان ساڵانی ١٣٠٠ ، ١٤٥٠ ز . داو ئاستی جیای مۆسیقای ئەوسا پێشکەش دەکات . کتێبەکە بە پروانامەیەکی گرنگی مۆسیقای ئەڵمانیایی زوو دادەنرێت .

٢ - (بەرەو شانۆیەکی هەژار) هەمان ناونیشانی ئەو کتێبەیە کە دەرهێنەری پۆڵەندی برسی گرۆتفسکی دەری کردو بیردۆزەو شانۆکەی خۆی تێدا ڕاڤە کردووە . ئەو شانۆیەی کە بیست ساڵی ڕەبەق بە هەر پێنج کیشوەرەکانی جیهاندا گەڕا .

٣ - «هونەری نواندن ، ئەوەیە کە ئەکتەر (نوێنەر) بچێتە ناو پێستی ئەو دەورە شانۆگەرییەی ئەنجامی دەدات ، و تا لەسەر تەختەی شانۆ دێتە خوارەوەو دەورە شانۆگەرییەکەی خۆی تەواو دەکات واز لە کەسایەتیی خۆی دەهێنێت» . بۆ یەکەم جار ئەم گوتەیەمان لە ساڵی ١٩٤٥ ز . دا لە ئامۆزگای باڵای هونەری نواندنی عەرەبی گوێ لێ بوو کە وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی ساڵی ١٩٤٤ ز لە قاهیرەدا دایمەزراند . ئەوەی کە ئێستا پێیی دەڵێن (ئامۆزگای باڵای هونەرە شانۆگەرییەکان)و ئەمرۆ سەر بە ئەکادیمیای هونەرەکانە - وەزارەتی فێرکردنی باڵاو لێ کوڵینەوەی زانیاریو ڕۆشنبیری .

٤ - Max Reinhardt ماکس راینهـــارت (١٨٧٣/٩/٩ - ١٩٤٣/١٠/٣١) لە نەمسا لە دایك بووەو لە هۆلیووددا مردووە . لە گەورەترین دەرهێنەرە شانۆییەکانی جیهانیی سەدەی بیستەمە . یەکەم کەسە کە شانۆی هاوینەی لە ساڵی ١٩٢٠ ز . دا هێنایە کایەوە .

«لەکۆڤاری «الأقلام»ی ژمارە (٩)ی ساڵی ١٩٨٠ دا وەرگێراوە

# پزیشکی لەناو کوردەواری

بێگومان پزیشکی گەلی «الطب الشعبي»ی کوردی بەشێکی گرنگە لە بەشەکانی کەلەپوری کوردیو پێویستی بە کۆکردنەوەو خ[illegible]ماندووکردن هەیە : ناوی دەرمانەکانو بەکارهێنانیانو هەر[illegible] یەکەیان بۆ چ جۆرە نەخۆشی‌یەك دەبیو چلۆنیتی بەکارهێنانیانو ناوی پزیشکەکان . ئەمەش پێویستێکی خێرایە چونکە رۆژدوای رۆژ ئەو زانیاریانەی کە لەم بابەتەوە کە لە کوردەواری‌دا هەیە بەرەو بزربوونو نەمان ئەچێ هەر پیرەمێردێك یا پیرەژنێکی شارەزا ئەمرێ ، هەندێك لەزانیاریەکانی پزیشکی گەلیو شتی تری کەلەپوریش لەگەل خۆی‌دا ئەباتە ژێر گڵ .

نەتەوە پێشکەوتووەکان لەزووەوە کۆتایی‌یان بە کۆکردنەوەی جۆربەجۆری کە لەپوریان هێناوە . بەشێوەیێکی ووردو فراوان کۆیان کردۆتەوە .

ئەبینین ئێستاش لە عیراقدا هەوڵدانێکی زۆر فراوان هەیە بۆ کۆکردنەوەی پزیشکی گەلیو بەشەکانی تری کەلەپووری عەرەبی . تەنیا هەر گۆڤاری «التراث الشعبي» هەموو مانگێك چەند باسێك بلاوئەکاتەوە .

ئیتر کۆکردنەوەی هەموو جۆرە کەلەپوری کوردی ، ئەرکو کارێکی پیرۆزو پێویستەو ، لە ئەستۆی رۆشنبیرانی کورددایە . بەلای منەوە کۆکردنەوەی شتێك لەم بارەیەوەو بلاوکردنەوەی ، زۆر باشترە لەوەی مل بدەینە وەرگێراندنی چیرۆکی غەیری کوردی ، کە چاپکراونو هەندێکیشیان دوپاتو سێ پاتیش کراون .

بۆ نووسین لەسەر پزیشکی گەلی ، دوو رێگا هەیە . یەکەمیان کۆکردنەوەیەتی بەشێوەیەکی خێراو رزگارکردنیەتی لە نەمانو ، هەرکەسە لەناوچەی خۆی .

دووەمیان ، کۆکردنەوەو بەرامبەرکردنی لەگەل «طب»ی کۆن . چ لە ناوی دەرمانەکان یا لە شێوەی بەکارهێنانی بۆ ئەو نەخۆشیانە زانراوە ، وەکو ئێستا لەم وتارەماندا دەیخەینە روو . بەلام ناسینی ئەو گیایانەی کە بەکارهێنراون ئاسان نیە . پێویستە



ئەو گیایانە یەك بەیەك بەشێوەو ناوە کورد یەکەیانەوە بیانناسین تا بزانین لە «طب»ی کۆندا ناوی چی‌یە بەراوردیان لەگەل ئەو زانیاری‌یانە بکەین کە لەلای حنین بن اسحق وابن بختیشوع . ابن ماسویەو ابن سیناو رازی‌و ابن بیطارو باشترین پزیشکەکانی‌تری موسلمانەکاندا . هێنراون .

بۆ ئەوەی بتوانین ئەم کارە بکەین پێویستمان بە «فەرهەنگێکی گیایی» کوردی هەیە . فەرهەنگێکی فراوانو ناوو وێنەی هەموو جۆرەگیایێکی تێدا بێت . ئەوجا بەهۆی ئەم فەرهەنگەوە ئەتوانین ئەو گیایانە لە «طب»ی کۆن بدۆزینەوە .

بێگومان ئەمەش بەهۆی فەرهەنگە وێنەدارەکانی عەرەبی . وەکو : «الموسوعة في علوم الطبيعة»ی ئەندازیاری کشت‌وکاڵی «ادوار غالب» . یا کتێبی‌تری وێنەدار . وەکو : «المنجد . التداوی بالاعشاب . الموسوعة العربية الميسرة»ەوە دەبێ .

بەبێ فەرهەنگێکی گیایی کوردی . ئەم جۆرە گیایانە لە «طب»ی کۆندا ناناسرێن . تا بزانرێ هەر گیایەك سوودی چی‌یە ؟ بۆ چ جۆرە نەخۆشیەك بەکارهێنراوە ؟ .

دیسان لەبارەی زمانەوانی و زانستی‌و کشتوکالیشەوە . سوود لەم فەرهەنگەوە وەردەگیرێت . بەڵێ . دوا رۆژ . زۆر پێویستی بە بوونی فەرهەنگێکی وەها ئەبێ . ناوی زۆر گیا لە فەرهەنگە کوردی‌یەکاندا هاتووە . بەتایبەتی «فەرهەنگی کشت‌وکاڵی»ی مامۆستا معروف قەرەداغی . کە سوودبەخش‌و جێگەی رێز لێ‌گرتنیەتی . هەرچەندە کە لەم فەرهەنگانەدا . بەووردی باسی ئەو گیایانە نەکراوە . وەکو : چۆنیەتی لق‌و پەلك‌و گوڵەکانیانو . رەنگی گوڵەکان . پێوانی گیاکان بە سانتیمەتر . یاخود چەند بڵند ئەبێ‌و کەی شین ئەبێ دیسان وێنەی دەستکردی گیایی‌یان تیانیە . وێداءەئهنگدا بۆ ناسینی گیاکە . مەرجێکی پێویستە لای زانست‌و پزیشکی‌یەوە . سوودێکی ئەوتۆ لەفەرهەنگەکانەوە نابینرێ . چونکی ئەرکی ئەم فەرهەنگانە زمانەوانی‌یە . بەڵوی گیرەکیشە و گیبرینە لە نووسیندا هەبێ . چ سوودێك دەگەیەنێ گەر نەزانرێ چۆنەو

چۆن نی‌یە ، یا وێنەی نەبێ تابتوانرێ لە «طب»ی کۆن‌دا بیدۆزرێتەوە ، یا چۆنەو بۆچی لای پزیشکانی موسلمان یا لە (طب) ی یۆنانی‌دا بەکارهێنراوە .

بەڵێ هەندێك گیای پزیشکی‌ی کوردی هەر بەناوە کوردیەکەی خۆیانەوە لە سەرچاوە پزیشکییەکاندا ماون . وەکو کتێبی (الجامع لمفردات الأدوية و الاغذية)ی ابن البيطار . . وە کتێبی «الحاوی»ی (ابو بكر الرازی) و (المختارات في الطب)ی (ابن هبل) و (تذكرة أولى الألباب)ی (داود الأنطاكی) .

دەرمانە پزیشکییەکانی موسڵمانەکان زۆربەیان بە عەرەبی نین ، بەڵکو بە فارسی‌و سریانی‌و یۆنانی‌و هندی‌و کوردی‌و ئسپانین . لەو ناوە کوردی‌یانەی وەکو خۆیان ماون یا گۆڕینیان بەسەردا هاتوە :

ریباس ، برنج (برنجوك)(١) .

جنار (چنار)(٢) – حب الزلم – زلم (زەلم لەشارەزورە)(٣) ، بابونه (بەیبونە) ، حندقوق (حەندەکوك : نەفەلیکی بۆنداڕە) ، وە بنەفشە (بنفسج) .

کە باسی فەرهەنگی گیایی ئەکەین ، یەکسەر ئەوە دێتە یادمان کە گەورەترین‌و بەناوبانگترین کتێب کە لە کاتی ئیسلامەتی‌دا لەسەر گیانووسرابێ ، لەکوردستان‌دا بووە ، لەلایەن گیاناس‌و ئەندازیارو فەلەکی‌و زانای گەورەی کورد (ابو حنیفەی دینوری) ، بەناوی «النبات» ، کە شەش بەرگ دەگرێتە خۆیەوە . وە بە رادەیەك پزیشکەکانی ئەندەلوس زۆر سوودیان لەم کتێبەوە وەرگرتوەو بایەخ‌و نرخێکی تایبەتیشیان داوەتێ .

جا ئایا ئەبێ دوای «دینەوەری» بە هەزارو سەدساڵ ، زاناو گیاناسێك لەناو کوردوا هەڵکەوتێ لەسەر گیابنوسێ ؟

لە دەشت‌و کێوی کوردستان ، زۆر جۆر گیا هەن ، ڕەنگە تا ئێستا لەلایەن گیاناسانی جیهان‌دا نەدۆزرابنەوە . لەم بارەوە ، وە لەم ساڵانەی ئەم دواییەدا ، کاك (ئیسماعیل سەرهەنگ) ڕەنگە توانیبی زیاتر لە (٢٠) بیست جۆر گیا ، کە تاکو ئەوکات بە شێوەیێکی دەوڵەتی نەدۆزرابوونەوە . لەشاخی سەفین بدۆزێتەوە . وە زۆرج[illegible]یش [illegible]گەڵ لیژنەیەکی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان [illegible] دوای (تحلیل) کرد[illegible]

[illegible]

هیوامان وایە مامۆستا ئیسماعیل سەرهەنگ زیاتر کۆشش

بکاو ئەو ئەرکە پیرۆزەش بەجێ‌بگەیەنێ ، کە لەگەڵ هەندێ برادەرانی ترەوە ، بتوانێ فەرهەنگێکی ئەم بابەتە دابنێن .

هەندێك لە دەرمانەکانی پزیشکی‌ی میللی کوردی لەسەرچاوەکانی (طب)ی ئیسلامی‌دا ئەبینین . جا ئەم یەکگرتنەوەیە چۆن هاتووە ؟ ، ئایا سەر چاوەی ئەسڵی بۆ هەردوکیان ، تەنیا پزیشکی میللی کۆن لە کوردوستان ولاتانی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بووە ؟ ، کە دووربنە هەندێکیان بۆ چەند هەزار ساڵێك لەمەو بەر بگەڕێتەوە . یان پزیشکی میللی کوردی ئەو دەرمانانەی لە (طب)ی نووسراو بە ڕێگای زاناو مەلایانەوە وەرگرتووە ؟ بەلامەوە ، هەردوو ڕێگا بوونیە . وە هیچ گومان لەوە ناکرێ کە هەندێ زانیاری‌ی پزیشکی‌ی بەرێگای نەخۆشخانە (بیمارستان)ی شاری نەسیبین (نصيبين) ، (کە ئێستا قەزای – ماردین –ە لە کوردوستانی تورکیا) لە پێش ئیسلام‌دا ، لە کوردستان‌دا بلاوبووەتەوەو کەوتۆتە نێو پزیشکی کوردی‌یەوە .

هەروەها بەهۆی قوتابخانەی (طب) ئەو شارە یان بەرێگای لقی (طب) لە ئەکادیمییەی نسیبینی ئەوکاتە . دیسانەوە بەرێگای نەخۆشخانەی شاری (فارقين – میافارقين) – قەزای دیاربەکر ، پایتەختی دەوڵەتی دۆسکی) و قوتابخانەی (طب)ی فارقين ، وە نەوەو دکتۆرەکانیان وەکو زاهد العلماء ، ابن دینار ، عبيد الله بن بختيشوع ، وە أبو نصر يحى بن جرير التكريتى .

قرالی کورد نصر الدولة أحمد کوڕی مەروان لە ساڵی (٤١٤ ك = ١٠٢٣ ز) دا نەخۆشخانەوەو قوتابخانەکەی دامەزراندووە ، تا ماوەیەکی زۆریش دوای ئەم دەوڵەتەوە ماوە(٤) .

هەروەها پزیشکی میللی کوردی سوودی لە نەخۆشخانەی شاری بۆتان وەرگرتووە کە لەکاتی مێژوونوس ابن شداد «٦٨٤ ك = ١٢٨٥ ز» دا بووە ، (واتە لە سەدەی سێزدەهەمدا)(٥) .

هەروەها نەخۆشخانەی (حران) کە سوڵتان مظفر الدين کوکبوری دروستی کردبوو و خانووی خۆی کردبووە نەخۆشخانەو ، دوای ئەوەی کە سەلاحەددینی ئەیوبی لەم نەخۆشخانەیەدا چاك بووەوە ، بە (دار العافية) ناونرا(٦)

بێگومان ئەو نەخۆشخانانەی کە لە کوردوستان‌دا هەبوونە ، پزیشکانی شارەزا کاریان تێیاندا کردووە . وە هەندێکیشیان وەکو زۆربەی پزیشکانی فارقين ، جۆرەها کتێبیان لەسەر (طب) داناون . جا بەم شێوەیە ئەم نەخۆشخانانە بوونەتە جێگای بڵاوکردنەوەی زانیاری پزیشکی‌ی لە هەندێ ناوچەی

کوردوستانداو کەوتۆنەتە نێو پزیشکی ی میللی کوردی یەوە . وە بە هۆی ئەو پزیشکانەی کە خەڵکی کوردوستان بوو ینە یان لەوێ ماونەتەوە ، وەکو (ماروثا) ی فارقینی (لەنێوان سەدەی ٤ ، ٥ زایینی) ، جبرائیل بن عبد العزیز بختیشوع (سەدەی دەیەمی زایینی) و ابو جعفر أحمد بن محمد بن أبي الأشعث (سەدەی دوانزەهەم) ، وە ابن هبل (سەدەی دەیەمی زایینی) ، عمر بن خضر الانیسری (سەدەی دوانزەهەمی زایینی ، وە إبن الصائغ الجزری (سەدەی دوانزەهەم) ، وە قەشە یشوع ال توماو قەشە شمعون ال تۆمای حەسەن کەیفی (سەدەی سێنزەهەم) ، وە فخر الدین الخلاطي (عبد العزیز بن عبد الجبار کە قوتابی ابن هبل بووەو یەکێك بووە لەو پێنج زانایانەی کە (مرصد) ی مەراغەی فەلەکی لەگەڵ نصیر الدین الطوسی دروست کردووە ، لەسەدەی سێنزەهەمدا) ، پزیشکی ی میللی کوردی دەوڵەمەند بووەو لەبەرەو پێش چووندا نەوەستاوە .

---

**پەراوێزەکان**

١ – برنج – برنجی خواردن نیە . بەڵکو بە کرمانجی سەرو پێ ی ئەڵێن : برنجۆك ناخوری ، تەماشەی : (تذکرة أولی الألباب) و (الجامع للعجب العجاب – مادەی برنج – چاپی المکتبة الثقافیة/بیروت – داود الانطاکی) بکە .

هەروەها (المعتمد في الأدویة المفردة ل ١٩ چاپی ١٩٥١ – المظفر الرسولي .

٢ – جنار ، کە لە (تذکرة أولی الألباب) دا ، أنطاکی ، لەژێر ئەم ناوەدا ئەڵێ «لب ، صنار ، صنر ، هەر جنارە . . (چنار)یش گەورەترین درەختە لەکوردوستاندا .

٣ – ئەم گیایە لەژێر ناوی «زلم» و «حب الزلم» دا هاتووە . ابن بیطار ئەندلسی ، کە گەورەترین پزیشکی گیاناسە ئەڵێ . گیای زلم لە ناوچەی شارەزور شین ئەبێ ، گیایەکی چەورەو دەنکی لە دەنکە نۆك کەمێك گەورەترە . لەسەرووەوە زەردەو ناوکەکەشی سپی یە ، تامی خۆشە .

وە ئەڵێ : لە ولاتی بەربەر پێ ی ئەڵێن (فول السودانی) ، بەڵام ئەمە جیایە لەگەڵ ئەوا .

هەروەها ابو عمران قرطبي لە (شرح اسماء العقار) دا باسی ئەکات .

دیسان (أنطاکی) و (المظفر الرسولی) لە کتێبەکانیاندا لەژێر ناوی (حب الزلم) باسیان کردووە . وە لەم گیایە کۆڵیونەتەوە کە بۆ چەند جۆرە نەخۆشی سوودی هەیە ، وەکو نەخۆشی : گورچیلە ، جگەر ، سنگ و ، بەهێزبوونی رادەی (جنس) . لەسەر چاوەکانی جوگرافیاش دا (جوگرافیای کۆن) ، باسی شاخی زەڵم وگیای زەڵم هەیە ، وەکو (رحلة مسعر بن مهلهل) الرسالة الثالثة – موسکو ١٩٦٠ – ل ١٨) .

هەروەها (القزوینی – اثار البلاد ل ٣٩٨) .

مسعر ئەڵێ : نەمزانیوە ئەم گیایە لەجێگایەکی تر هەبووبێ . بەڵام لەسەدەی دەیەمی زایینی دا جۆرێك لەم گیایە لە (اسکندریة) لەمیسر دەچانرا ، پێیان دەگوت (حب العزیز) ، چونکە خەلیفەی فاطمی (العزیز بالله) زۆر حەزی بەچاندنی کردووە .

وە هەروەکو (أنطاکی) ئەڵێ : دورنیە ئەم خەلیفەیە ئەم گیایەی ، چ لە کوردوستان چ لە ولاتێکی تر وەکو ولاتی بەربەر لە باکوری ئەفریقیا – ی بۆ میسر هێنابێ . وە (ابن البیطار) وای بۆ چووە کە لە سەدەی سێنزەمدا لەم ولاتە هەبووە بەڵام بەناوی (حب السودان)ەوە نەك (زەڵم) کە هەروەك خوێشی ئەڵێ لە شارەزوور شین ئەبێ .

هەروەها ئەڵێ : بەزمانی بەربەری پێ ی دەوترێ «زقاط» . . ئەسڵی لە ولاتی فارسە . . پەڵکی خڕە وەك دەرهەم . . بڵندایشی لە گەزێك کەمترە .

لە «المعتمد»دا – ل ٨ – وا هاتووە کە خەلیفەی فاطمی – العزیز – ئەم گیایەی بۆ میسر هێناوە .

هەرچۆنێك بێ . . ئەگەر زەڵم لەکوردوستاندا بۆ ولاتێکی بردرابێ . . وەیا ئەسڵی لە کوردوستان بێ یان ولاتێکی ترەوە . . ئەوە هەیە کە ئەم گیایە هەر بەناوی کوردی یەکەی خۆیەوە ماوەتەوەو کەوتۆتە نێو سەرچاوە پزیشکی یەکانی موسلمانان .

٤ – دەربارەی نەخۆشخانەی فارقین و دکتۆرەکانی . تەماشای ... بکە : «حضارة الدولة الدوستکیة في ... ٢ ل ٣٨٠ – ٤٠٢) . هەروەها هەردوو ... رەیەوە . گۆڤاری (بین النهرین ژمارە ٢١ و ٢٢ – ٢٣) .

٥ – تەماشای : ابن شداد/الاعلاق الخطیرة في ذکر امراء الشام والجزیرة : قسم الجزیرة ، المخطوط ، کە لە نامەخانەی زانکۆی أکسفورد نمرە (٣٣٣) ی پێ دراوەو لە لاپەرەی (٦٠) دا لەم باسە ئەکۆڵێتەوە . دانەیەکی وێنەگیراویشی لامان هەیە .

٦ – سەرچاوە پێشوو . . ل ١٧ و ١١٤ .

# سەرهاتییێت کەڤن
# سەرهاتیا حەمکێ ئاکرەیی

د کەڤندا ل میرگەها میر بەدرخانی ل جزیرا بوتا مرۆڤەك هەبۆ ناڤێ وی حەمك بۆ ! ! ل بازاریێ ئاکریێ وی کابرای هێسترەك هەبۆ بخۆ کاروان دکرن ژینا وی ل سەر هندێ بۆ . جارەکێ ل جار حەمك ل کاروانی د هاتەڤە ل هەرێما ناف کوریێ پاشی باریێ خو بێ تری گوری پ گەنمی . گەهشتە نێزیك بازێریێ ئاکریێ هێسترا وی گەلەك ماندی بۆ زانی ناگەهیتە بازێری ئو رۆژ ل ئاڤابێ بۆ ئینا باریێ هێسترا خۆ دانا سەر کانیەکێ د بیژنێ کانی کاروان ل گرەسێنی دانەکێ ب پیا یا دویرە ژ ئاکریێ . پاشی بێنا خۆ دا شیڤا خۆ خار ئالیك و ئاف دا هێستریێ شەف پ سەردا هات روینشت زێرەڤانی ل هیسترا خو کر هەتا نیف شەف .

حەمکی ژار گەلەکێ ماندیبۆ ژ سپێدیێ هەتا نزیکی روژ ئاڤابێ ل کەلا گەرما هاڤینێ ل دەشتا ناف کۆریێ هیسترا خۆ بێ هاژوتی ئینا خەوا وی هات نەشیا زەهتر زێرەڤانیێ بکەت . ئینا دەنگەکێ بلند



أسماعيل تاقي

دگەل خو ئاخفت کوتی بەدرخان بەگ دەمیٚ زیٚرەڤانیا من دیماهی بوهات . هندە ئەز دیٚ نڤم . ژ نوکە پاژڤە گوریاتەیە هەتا سپیٚدیٚ . ڤیٚجا ئەگر ل گوریا تە هیٚسترا من بیٚتە دزین من ژ تە تڤیٚت . کابرایٚ مە سەریٚ خو ل سەر خورجەکیٚ دانا ئو لیٚ نڤست . هندەك مرووڤ نزیکی وی بوون گول ئاخڤتنیٚت حەمکی بون وان مرۆڤا گوتە ئیٚكو دوو ئەم دیٚ رابین هیسترا ڤی مرۆڤی دیٚ دزین کامیر بەدرخان ل جزیرا بوتا ریکا حەفت هەشت روژا ل ئاکریٚ دویرە دیٚ بو وی چکەت ئو چەوا میر ژ جزیریٚرا زیٚرڤانی دیٚ کەت ئو ڤیٚ شەڤا تاری کەس دیارنیە هەبیت نەبیت ئەڤ مرۆڤە ییٚ دینە . وان زانی حەمك نڤست نڤستنەکا گران هاژ خو نەما هەروەکی مەگوتی گەلەکیٚ ماندی بو . ئەو گونەهـ کار رابون هیٚسترا وی ژ سنگی ڤەکر ئو پ بارڤە دزین ئوچن . حەمك سپیٚدیٚ رابو ژخەویٚ بەریٚ دایٚ کو چو هیٚستر ل ویٚریٚ نەمایە . . ژاری هەردوو دەستیٚت خو ب سەریٚ خو دادان خوین د گیانیٚ وی دا هشك بو ئو چۆ سەودا د سەریٚ وی نەما گەلەك تیٚك چو . ئوگۆت میر بەدرخان دیٚ هۆ میرانییٚ کەی هیسترا من ل دەما زیرەڤانیا تە هاتە دزین ؟ من هیٚستر ژ تە تڤیٚت . . حەمکیٚ ژار دەستیٚت خو دانە کیٚلەکا خو ئو بەریٚ خودا جهیٚ جزیرا بوتا ئو پشتا خودا دەشتا ناف کوریٚ . ئو چو هەر چو چ هەفت روژ چ هەشت روژ کابرایٚ من وتە گەهشتە جزیریٚ . پسیارکر ئیٚکی نیشا وی دا ئو گوتیٚ دیارا تشتکیٚ پ سەریٚ تە ییٚ هاتی هەرا لالی میری شەرمیٚ لیٚ نەکە میریٚ مە خو ل مە مەستر ناگریت ییٚ هەنیٚ دەستیٚ خو دریژکرە کومەلەکا مرۆڤا روینشتبون ل بن دیوارەکی میر دگەل وان دابۆ گوتی هەرە هەر هەکی من گوتی شەرمیٚ ژیٚ نەکە میریٚ مە ییٚ چامیرە ئو ییٚ راستو دروستە گەلەکیٚ ئەڤیە حەز ژ راست و درستا دکەت ئو ل گەل بچویکا بچویکا ل گەل ژارا ژارە . حەمکی ئەڤە ژ وی کابرای بهیست گەلەك پیٚ خوش بو چەنکو حەمکی میر نەدیت بو نەچو بو لالی حەمکی وەزانی کو دیتنا میری گەلەك یاکرانە ئو دەست ژارا .

ناکەڤیت . ب ڤیٚ هندیٚ حەمك بچگەرکەفت ئو هەر راست چۆ لالی میری پاشی سلاڤ کرنیٚ میری سلاڤەکە گەرم لیٚ وەرگرت گەلە کروویٚ خو ل گەل خوشکر ئو تەنشت خو دانا ئوگرتیٚ برایٚ هیٚژا تو ل سەر چاڤیٚت من هاتی تە چ داخازە دیٚ بوتە ب جە هـ ئینم بیٚژە شەرمیٚ نەکە؟ ئینا حەمکی گوتی میریٚ کوردا ئەز ل بازاریٚ ئاکریٚ یی هاتیم ل دویڤ هیسترا خو هاتیم ل زیٚراڤانیا تە هاتە دزین ڤیٚچا من هیٚستر دڤیٚت . . . میری کوتیٚ بلا برایٚ خوشتەی هەر وەکی من گوتی پیٚش نوکە تە چ تڤیٚت دیٚ بیت بو من رونکەڤە چەوا بو ئو هیستر چەوا هاتە دزین حەمکی سەرهاتیا خو بو میری گۆت ژ سەری هەتا کەهشتە لالی میری . . .

میری گەلەك پیٚ خوشبۆ ئو گۆت تو ل سەر سەریٚ من هاتی هەر ل ویٚریٚ هەتا لیٚرە . تو ل سەر راستیی ئو گەلەك راستە هیسترا تە دەمیٚ زیٚرەڤانیا من هاتیە دزین ئو گۆت یان نابیت خو ب میر دانیٚم یان چبیت ل کیٚمو کاسی ل ملتی ئەز گونەهـ بارم هەر ویٚ گاڤیٚ گازی کرە سەروکی خەربەندا گوتیٚ هەرە هیٚسترەکا کۆك بدە برایٚ ئاکرەیی . میری حەمك خلاتیش کر سەروکیٚ خەربەندا دەستیٚ حەمکی گرت ئو برە ئەختەخانا هیسترا ئینا هیٚسترەکا کۆك بو ئینا دەری دا حەمکی گاڤا بەریٚ خۆ دا هیستریٚ گوت !!! من ئەڤە نەڤیت چونکە ل هیٚسترا من چیترە کابرا چۆ ئیکە دی ئینا دەریٚ ئەوژی حەمکی نەڤیا ئینا گوتیٚ برا دیٚ تو وەرە بوخو ئیکی ب دلیٚ خو لیٚبکرە حەمك چوو ناف هیٚسترا ئینا ئیٚك بخو ئینا دەریٚ ووکی هسٚترا خو نەکیٚم نەزیدە پاشی چوو لالی میری . پاشی رازبینا خو بو میری ئاشکراکر ئو ئزنا خو ژیٚ خازت . میری روویٚ خو ل گەل وی خوشکر و گرتیٚ من ییٚت هەکی تە خوشتڤن چەنکو مرۆڤیٚ بزاڤ و لڤلڤوك ئو ل دویڤ راستی بچیت مافیٚ خو ل دویڤ کە سیٚ بەرنەدەت ئو خەباتیٚ بکەت بو نەهیٚلانا زورداریٚ . ئەو مرووڤ زندینە بەرکەفتینە ، ئو گوت مرووڤیٚت وەکی تە جەمك مللەتی دیٚ گەینە ژینا خوشو سەر فیراز هەرا برایٚ هیٚژا سەر چاڤیٚ من بچی ، حەمکیٚ منوتە ریٚکا خو گرت ئو زڤریا بو ئاکریٚ ب دلەکیٚ پر خوش و گەش . هنگی میری نامەك بو جیٚکریٚ خو ل ئاکریٚ هنارت یا دژوار تیٚدا نڤیسی چەوا هیٚسترا حەمکی هاتیە دزین ل میرانیا مەدا ما ئەم بوچینە ئەگەر دزوو ریٚ گر ب دلیٚ خو هەمو تشتا بکەن هەر کیٚماتیەك بگەهیتە ژارەکی ئەم گونەهـ بارین من تڤیٚت ئەو هیٚستر لە گەل دزا ئەگر تە ل بن عەردی ئینانیە دەریٚ دەما ئەڤ ناما میری گەهشتە جیٚکریٚ میری ل ئاکریٚ دەنك داڤە ل هەریٚمیٚ هەلبەت دزا زانی گەلەك ترسیان و ئالوز بوون تیٚك هاتن و تیٚك چۆن دا خو رزگارکەن ل ڤیٚ تەنگاڤیٚ ، ئینا شەڤەکیٚ درەنك ب تەکبیر چوونە مالا حەمکی پاشی

سلاڤێ حەمکێ ب خێر ئینان ئو چەند قسێت خوش کرن دزا زانی ئەڤ حەمکە مرۆڤەکێ باشە حەش جاکێ تکەت . ئینا خو ئاشکرا کر دزا گوت برا حەمك ئەم کەفتینە بەختێ میری پاشی بەختێ تە مەکرو تو نەکە . ئەم گونەهـ کارین ! ! هێسترا تە مە بێ دزی تە چتڤێت ئەم راوستاینە چت بێژی ئەم ئەوین هەکی تە تڤت . ئەم کەلەك حەسکەین هیسترا تە بزڤرینەڤە بوتە ، توژی بەختێ میری بدە مە دا مە رزگارکەی لڤێ تەنگاڤیێ ئەم پێشەمانین ل گەل وێ یا مەکری بەلێ هەکی زانا گوتی (پی‌شەمانا پێڤەتێن شاخێت بزنا) حەمکی گوتی ئەز خاریێ ل گەل میرێ مە کوردا . ناکەم چەنکو میرێ راستە ل گەل مە هەما . ما هنگو نەزانی **(ئەگەر ئەز بنڤم میر نانڤیت . حەمکی گەلەك بووان ئاخفت و گوتی دزی و رێ گری ئو دوو روپاتی و خاری ل گەل مللتی شەرمە ئو روپی رەشیە)** .میری تڤت ئەم یێك پارچە بین دەست سوکرا ئێك وەرینین خوشی و نەخوشیا بکڤە بین دزا گەلەك پێ خوشبو ئو دلێ وان ڤەبۆ ل قسیت حەمکی ئو باوەریا وان ب حەمکی هات و بێت بێژنە ئێك و دوو دێ بلا ئەم لڤێ تەنگاڤیێ رزگاربین شەرت بیت جارەکادی چو گونەهێ دی بەرامبەرێ مللەتێ خو نەکینی دا پاشە رووژێ شەرمەزار نەبین چەنکو دێ راستی هەر سەرکەڤیت مرن بو رێ گروو زوردار یا ئینا حەمکی گوتی گەلی خزما هونگ هێستری بینن نزیك مالا مە گریدەن ئو هەرن ئەز دێ هێسترا میری بۆو بەمەڤە چەنکو هیستر نەبا میری‌یە پتنێ یا مللتێ مەیە . ئو دێ راستی بوو بیژم چو لێ ڤناشیرم هونك نەترسن . سەر ڤێ هندێ پێك هاتن . ئینا چەند روژەك پێڤە چوون روژەکێ سپێدێ حەمك ل خەوێ رابو دیت هێسترا وی ل سنگی گرێ دایە .هەر هەکی پێك هاتین . حەمکی کارێ خوکر بو جزیرێ هەستا هیسترا میری برو چۆ چەند روژا هەتا کەهشتە جزیرێ . چو لالی میری . گوتێ مالاتە هەر ئاڤابیت هەر بژی بومە هەر میرێ مەبی ئو بن چاڤدێریا تەبین ، هێسترا من ئیناڤە ئەوێ هاتیە گوتن ل گەل دزا هەمو بو میری گوت ئو گەلەك ڤەپاریاڤە نك میری دا میر ل وان خوشبیت ئینا حەمکی پیهان دا میری کو چارەکا دی ئالوزیا نەکن من وەباورە ئەڤ دزەنا هاتنە رێزا مرووڤیت باش . میری گوتی هەرە حەمك ئەز ل وان خوشبوم ئو ئەز گەلەك ل تە رازیمە . تو چت بێژی دبیت هەرا ئاکرێ ئوئاگادار بە چت بیت بومن رونکەڤە . ئەز تشتەکی ل تە رازی نەبوم زڤڕاندنا هێستریێ تە بو ئیناڤە من دابو تە .

حەمکی گوتی ئەزبەنی ئەزو بچیکت خوڤە ب سەرو مالڤە گوری میرانیا تە بین ئو گوری سەر بەرزی و خوشیا مللەتێ خو بین . ئینا میری چارەکە دی حەمك خەلات کر حەمك زڤریڤە بۆ ئاکرێ ب دلەکی پر خوش ل خوشیا دا پێ وی‌نەتکشتە عەردی ئو ب مزگینڤە بو وان دزا کو میر ل وان خوشبو . لبەر هندێ وان دزی هیلا چ تشتکێ باش بو مللەتی با تکر بونە مروڤیت باش هند باشی و مێر خاسی دکرن . ل ولاتی دەنگ داڤە پاشی وێ هندێ میر ب مللتڤە ل وان رازیبون چەنکو ریزا پیس هیلان و هاتنە ریزا مرووڤیت باش . بێژن ئەو دز بونە کار بەدەست ل گەل حەمکی ل هەرێما ئاکری ناڤێ ئێکی حسن بو ئو یێ دی ناڤێ وی مام بو د بێژن دەما لەشکرێ عوسمەلی هاڤلدا میرانیا بەورخانی بناڤێ دینی چەنکو پ هیزا خو نەشیانە مللەتی ب فرتو ڤێلا شیان مللەتا بخنە بن دەستێ خو .

دین ل وان دوویرە چەنکو هەر دینك یێ ل گەل راستی دایە ئو دوژمنێ زوردارایا .

سەر دەڤێ چیروك بێژی د بێژیت حسن و مام شەرەك کر ل گەل لەشکرێ عوسمەلی یی کونەهـ بار شەرەکێ گرنك کر دەنك داڤە ل ولاتی ئو د بێژن چەند سالا ل گەلیەکی خو ئاسێ کر ئەو گەلی نوکەش ب ناڤێ وانە بێژنێ گەلی حسن ماما ئەو گەلی تکە ڤیتە روژ هەلاتا باژارێ ئاکرێ دەرگێ گمەلی کوندەکێ هەی بیژنێ زنتا ل دەڤ گەلی بیتە دوو رێ ئێك چیت بو بچیلێ ل ناف سورچیا ریا دی لناف گەلی تچیت دیسا دیمایا گەلی دەرکەڤی بیتە دوو رێ ئێك چیت بو دینارتێ ئو چیایێ پیرسی ئو بو هەرێما زیرباری (زیبار) ریا دی چیت بو (بێخمێ) ل گاڤا خودا ئەو رێ چێکر بو سکرێ بێخمێ (سدنجمە) گەلیێ حەسن ماما بەری رێکێ ڤەکەن گەلەکێ ئاسێ بو کەس نەشیا پیا تێرا بچیت دریژا گەلی زەهتر ل پنج کیلو مترا ئو گەلەك یێ خوشە هندی بیژی کانیت ئاڤێ یێت هەین ریبارەکە ئاڤێ ل نیڤەکێ چیت وارکێ پر خوش و رەندە ئو هاڤین گەها وێ هەریمێ یە ئەگر بێت‌و پیچەك خو پێڤە هاییدان دبیتە هاڤین گەهەکا پێ گوتی . ئەڤ سەرهاتیا ل میژا حەمویێ سارمی ل ئاکرێ بو من گوتی ئەڤ مروڤە تەمنا وی زەهتزە ل سەد سالا سەرهاتیا گەلەك زانیت ل گەل مێژویا ئاکرێ ئو مێرخاسێت چارا . چیروکا یێ‌ت دیسا مامی حەمویێ سارمی بو من یێ گوتی ناڤێ وێ چوا میرێت کەلا ئاکرێ ئاکرێ ت پارست ل دووژمنا ئو شەرێ عوزیر ئاغایێ تاڤ گەل (شیخ شاه ویشی) .

# ڕەووشتێکی سەیر

## (پاداشتی چاکە)

مام زێوەر لە پەنجا ساڵی تێپەڕی کردووە . ماندووی ساڵانی بە روخسارەوە دیارە . سەرەڕای غەم و خەفەتە زۆرەکەی . هەمیشە دەم و چاوی درژەو زەردەخەنەی بە لێوەوە نابینرێت . کە پرسیاری تەندروستی و هاڵ و هەواڵی لێ بپرسیت ، بە چەند ووشەیەکی کەم وەڵامت دەداتەوە . کاتێکیش ڕۆژێکیان سەبارەت هۆی ژن نەخواستنی لێیان پرسی . وەڵامی دایەوە کە شەمەندەفەری ژنخواستن تێپەڕی کردووە .

مام زێوەر کە خەڵکی بەو چەشنە بانگیان دەکرد لە دنیادا هیچی شك نەدەبرد عەرەبانەیەکی بچووکی دارین نەبێت . لە جێیەکەوە بۆ جێیەکی تری دەگوێزێتەوە ئەویش بەرانبەر بە چەند دەرمێك کە بەهۆیانەوە دەژێت .

ڕۆژێکیان بینیان خەڵکی لە دەوری عەرەبانەکەی مام زێوەر کۆبوونەتەوە . لەگەڵ گەنجێکی بیست و پێنج ساڵەدا . بە رواڵەتی دا وا دەردەکەوێت کە لەسەر مووچەیەکی پسایە بەرز ئیش دەکات . چونکە باشترین جل و بەرگی لەبەرکردبوو . . بە توندوتیژی لەگەڵ مام زێوەردا دەدووا . یەکێکیان گوێی لێبوو پێی ووت (پێم ووتیت لێم دووربکەوەوە) . من ڕێگات پێ نادەم لە بەردەمی هاوڕێکانم دا شەرمەزارم بکەیت) بۆیە پیاوە پیرەکەیان دیت رووخاو بەسەر گەنجەکەدا قیژاندی و چەند ووشەیەکی پچڕپچڕی لە دەم دەرچوو . . «ئەمەیە پاداشتم ؟ . . تۆ کوری منیت . منیش باوکتم و . بە خێوم کردوویت لەو کاتەوە دایکت کۆچی دوایی کردووە . ڕەنجیشم کێشاوە فێرە خوێندنم کردوویت و شادومانم کردوویت . من نانم لە دەم خۆ دەگرتەوە بۆئەوەی خەرجی ی زانکۆت پێ بدەم . ئەوەیش تۆیت هاتوویت ڕێگەم نادەیت چاوم پێت بکەوێت) .

خەڵکەکە لەمە سەریان سوڕ ما . کە زانییان ئەم مام زێوەرە باوکی ئەو گەنجەیە کە نایەوێت باوکی چاوی پێ بکەوێت و پێی ناخۆشە باوکی ببینێت و ئەم کارە نێ فیزیە ئەنجام بدات . . ئا ئەمە پاداشتی چاکەی باوکە . . کە دەبوو ئەو گەنجە بەپێچەوانەوە پاداشتی چاکەی باوکی دابایەوەو لەسەر سەری خۆی دایناباتا ! !

زیرەکی ئەو توانا سەرەتاییانەی وەك تێگەیشتنی ئاڵۆزەیەکانی زمانو لێکدانەوەو توانای هەستکردن بە پەیوەندی نێوان کاتو شوێن دەگرێتەوە . هەروەها توانای بەجیٚهێنانی ئەو فرمانانەش دەگرێتەوە کە لەگەڵ ژمارەو بەلایەکدا خستنی مەسەلەی کرداری دا هەڵسو کەوت دەکەن . زیرەکی پەیوەندی بە توانای بیر کردنەوەو دروستکردنی پەیوەندیو بەکارهێنانی ئەو شتانەوە هەیە کە هەستیان پیٚ دەکرێت . هەروەها زیرەکی بەشێوەیەکی کرداری ڕووت بریتییە لەوانەی تاقیکردنەوەکانی زیرەکی Intelligence Tests دەیان پێوێت .

توانایی مرۆڤ بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا هەڵسوکەوتی زیرەکانەی دەوێ . کاتیٚ شتێکی نویٚ ئەنوێنین یا بەشێکی زانراوەوە ئەیبەستینەوە و لەم کاتەدا کارێکی زیرەکانەمان کردووە کە کاتیٚ جۆرە گونجاندنێك بۆ ڕووداوە تازەکان دەکەین ئەویش بەشدارە . بەمانایەکی تر ئێمە هەڵسوکەوتی خۆمان لەگەڵ دەوروبەردا دەگونجێنین . بەڵام تاقیکردنەوەکانی زیرەکی ئەمڕۆ زیاتر بایەخ



بەو زانیاری‌یانە دەدەن کە لە لایەن منالأنی تەمەنی قوتابخانەوە بەدەست هێنراون. پیاوانی پیشە ئێستە زیاتر بایەخ بە پرۆسێسی گەشەکردنی زیرەکی دەدەن. منالێك رەنگە ئەو توانا ئەقلی‌یەی هەبێ بتوانێ وەلأمی پرسیاری تاقیکردنەوە باوەکان بداتەوە کەچێ خۆی‌ی بەشێوەیەك دەبینێ ناتوانێ وەلأم بداتەوە. یەکێکی تر لەوانەیە زۆر باش بێت لە وەلأم دانـــەوەداو بـۆیـــەش زیـــرەك دەرکەوێ. تەنانەت هێواشی گەشەکردنی ماسولکەش ئەشێ وا لە منالێك بکات نەزان دەرکەوێ گەرچی توانایەکی ئەقلی زۆر چاکی هەبێ.

بۆئەوەی چاکتر مەسەلەی پێناسەو پێوانی زیرەکی روون بکەینەوە بابەکورتی لە گیانەوەر بڕوانین. ئاخۆ شەمپانزی بۆ نموونە، ئەو توانا ئەقلی‌یەی هەیە بتوانێ قسەبکات ئەگەر میکانیزمی دەنگی وەك مرۆڤی هەبوایە؟ یان porpise کە لەوە دەچێ تا رادەیەك بە ئاسانی پەیوەندی زمانی بە خەلکەوە بکات توانای وای هەیەهێشتا نای زانین؟ زەحمەتە بتوانین گیانەوەر ویستان An;mal Lovers بەوە ئیقناع بکەین کە دروست‌کردنی هێلانە لە مەل‌داو، هەلسوکەوتی شاردنەوە لە سمۆرەداو دروست کردنی بەنداو لە لایەن سەگی دەریاوە، وە شاردنەوەو کۆکردنەوەی خواردەمەنی لە لایەن سەگەوە، نیشانەی زیرەکی نەبن — لەگەلێ ئەوەشدا ئەو گیانەوەرانەی دوور لە گیانەوەرانی تری هاوجۆریان بەخێو دەکرێن، وە بەبێ ناسینەوەیەکی ئاشکرای پێویستی داهاتوو، ئەم هەلسوکەوتانە هەر نیشان دەدەن. ئەگەر بۆ پیوانەی زیرەکی هەلسوکەوتی حەل‌کردنی دژواری دابنێین— ئەو هەلسوکەوتەی تێگەیشتنی هەلوێست‌و داهێنانی حەل‌و ئەنجام‌دانی کارێکی گونجاوی تێدایە— ئەوا دەتوانین ئەوە دەرئەنجام‌بکەین کە زۆربەی گیانەوەران زیرەکن. هەروەها ئەتوانین بلێین فلأن گیانەوەر زیرەکترە لە گیانەوەرێکی تری هاوجۆری کاتێ یەکەیەکە تێ‌بینی‌یان دەکەین.

بە نیسبەت مرۆڤەوە ئەتوانین بلێین زیرەکی لە هەلسوکەوتی‌دا دەردەکەوێ بەرامبەر خۆگونجاندنی‌و تا رادەیەك دەست‌بەسەراگرتنی دەوروبەر خەلك زیرەك یا نازیرەکن لە زور لایەنەوە. هەندێك مێشکێکی باشیان هەیە بەلأم کەم کەلك لە توانای ئەقلی‌یان وەردەگرن بۆیە مێشکیان نارێکە.

هەندێ کەس لە بەکارهێنانی بیردا زیرەکن بەلأم لە مامەلەی خەلك‌دا زیرەك نین. ئەوەش هەیە کە هەندێ کەس لە لایەنێکدا زۆر زیرەکن بەلأم لە لایەنێکی تردا وانین ئەشی یاسا بشکینن خوی خراپ بگرن یان نەتوانن خۆیان پۆ داهاتوو ئامادەبکەن. گەشەکردنی تەواوی‌زیرەکی هەر لە منالی‌یەوە دەست‌پێدەکات.

پێش ئەوەی منالێ فێری قسە ببێت، هەلسوکەوتی زیرەکانەی تا رادەیەکی زۆر لە هی گیانەوەر دەچێ. تا ئەو کاتەی کەمێك دەسەلأت بەسەر زمان‌دا پەیدادەکات، منالێ کەمێ بیرکردنەوەی پەتی نیشان دەدات، بە شێوەیەکی

سەرەتایی هەڵوێست هەڵ دەسەنگێنێ ، Conceptualizes Situations بە زۆری بەپێی هەوڵ–هەڵە Triai – error (المحاولة والخطأ) هەڵسوکەوت دەکات . دوای ئەوەی شارەزایی زمان گەشەدەکات پەیوەندی (هۆ–ئەنجامCause and effect سەر هەڵدەدات‌و هەڵسەنگاندن C;nceptualization بەردەوام دەبێ . ئەگەر منداڵ کۆسپی بێتە ڕێ وەك نەبوونی شارەزایی خوێندنەوە یا ناتەواوی قسەکردن ، ئەشێ منداڵ ، ئەگەرچی لە ڕاستیدا بڕێکی باش توانای هەبێ ، زیرەک دەرنەکەوێ . لە تاقی پێگەیشتن‌دا As adult سیفەتی جیاکەرەوەی پلەیەکی بەرزی زیرەکی ، واتە بەکارهێنانی تەجرید abstraction ، سەر هەڵ دەدات .

بە کورتی زیرەکی بریتی‌یە لە وانەی تاقیکردنەوەکانی زیرەکی دەیان پێوێت ، توانای حەل‌کردنی پرسیار ، توانای تێگەیشتن وە توانای بیرکردنەوەی پەتی . زیرەکی کۆی هەموو شارەزایی‌یەکانی فێربوونی All the learning experiences تاکە (فرد) . ئەشێ بەشێوەیەکی گشتی بڵێین بریتی‌یە لە توانای بەدەست‌هێنانی زانیاری تازە ، توانای سوودوەرگرتن لە شارەزایی وە توانای خۆگونجاندن لەگەڵ هەڵویستی تازەدا .

**تاقی‌کردنەوەی زیرەکی ئەوهۆکارانە کارلەزیرەکی ئەکەن**

دەروون‌زان بایەخ بە گەشەکردنی تواناکانی تاک دەدات Individual Abilities تاقیکردنەوە مێژوویەکی درێژی هەیە ، لە ساڵانی ۲۲۰۰ پێش زایین دەستی پێ‌کردووە ، واتە هەژدە سەدە پێش کونفۆشیوس . لە ۱۱۱۵ پ .ز چان دیناستی Chan Dynasty هەندێ تاقیکردنەوەی سەرەتای لەسەر هەندی لێ‌هاتوویی Skills وەک لێ‌خوڕینی ئەسپ‌و یاری‌کردن کرد . تەنانەت هەوڵی دا وە ئەو کەسانە هەڵ بژێرێت کە ئەتوانێت نووسینیان پێ بوترێتەوە . بەڵام لە اڵی ۱۸۹٤ دا دەروون زانی فەرەنسایی ئەلفرید باینێت Alfred Binet مەسەلەی پێوانی توانای فێربوونی نزیکتر خستەوە . لە مانەوە لە چەمکی کرداری ترەوە چەمکی ڕادەی زیرەکی Intelligence Guoteint هاتە ناوەوە . بەکارهێنانی ئەمە لە لایەکەوە بووە هۆی چارەکردنی زۆر دژواری کەسی‌و پەروەردەیی ، لە لایەکی تریشەوە بەجۆرێک زەرکەش کراوە لە ئیمپریالیزمی عەقلیدا بەکاردەهێنرێت .

ڕادەی زیرەکی بە IQ ناسراوە و تا ڕادەیەک لای هەموو قوتابی‌یەکی نوێ ڕوونە – بریتی‌یە لە ڕێژەی تەمەنی ئەقڵی Mental AGe بۆ تەمەنی زەمانی

IQ $_{K}$MA& G iww

لە پێناسەکە دەردەکەوێ کە تێکرایی تەمەنی ئەقڵی منداڵ یەکسانە تەمەنی زەمانی یەکەی کەرەت IQ لەسەدا . ئەگەر منداڵێکی دوازدە ساڵان تەمەنی ئەقڵی دە بێت ئەوا ڕادەی زیرەکی‌یەکە ئەکاتە $\frac{١٠}{١٢} \times ١٠٠ = ٨٣$ .

ئەگەر منداڵێکی سەروو ئاسایی دوازدە ساڵان تەمەنی ئەقڵی‌ی چواردە بێت ئەوا ڕادەی زیرەکی‌یەکەی ئەکاتە ۱۱۷ .

دەروون زانان وای بە باش دەزانن منداڵ ماوەماوە چەند ساڵ جارێك تاقی‌بکرێتەوە . بۆ نموونە لە تەمەنی ۵ ، ۷ ، ۹ ، ۱۱ ، ۱۳ ، دا . لـــەم ڕێگەیەو ،ئاستێکی پشت پێ بەستراوی توانی ئەقڵی ئەتوانرێ دیار بکرێ . بەڵام پێویستە ئەوە بزانرێت کە IQ تەنیا یەکێکە لەو هۆکارە گرنگانەی لەم مەسەلەیەدا بەشداری دەکەن . لە منداڵی گەورەدا چۆنێتی پاڵنەرو Motivation عاتیفە Emotion هەروەک چۆنێتی لێکدانەوەی ئیدراکی Percetual Inerpertation زۆر گرنگن .

**ئەو هۆکارانەی کار لە زیرەکی دەکەن :**

مرۆڤ مێشك‌و زیرەکی‌یەکەی بەیەکەوە بەستراون ، بەڵام پەیوەندی نێوانیان وەك کەسانی ئاسایی لایان وایە یا زانایان بەهیوان ، ئەوەندە ساکار نیە . ئەزانین کە زیرەکی نەبەستراوە بە قەبارەو کێشی مێشکەوە ، هەروەهاش هیچ سیفەتێکی فسیولوجی پەیوەندی‌دار بە زیرەکی یەوەش تا ئێستا نەدۆزراوەتەوە . هەرچۆنێك بێت بەڵگەی ئەوە هەیە کە کیمیای مێشك ئەبێ لە گەشەی زیرەکی‌دا گرنگ بێت بێ . شارەزایی ڕۆڵێکی گرنگی لە زیرەکی‌دا هەیە . بۆ نموونە ئەزانین کە تێك‌چوونی بەشێکی زۆر لە پلی پێشەوەی مێشك Frontal Lobe of Brain لە ساوادا ئەبێنە هۆی وون‌بوونی هەمیشەیی زیرەکی . بەڵام هەمان برین لە ژیانی لەوەو دوادا ئەشێ کار لە زیرەکی نەکات .

**زگماك : Heradity**

لە ساڵی ۱۸٦۹ دا گاڵتون Galton پەیوەندی‌یەکی ڕاستەوانەی لەنیوان خزمانی خوێنی‌و lood – Relatives و دەرکەوتوویی Eminence دا هەست‌پێ‌کرد .بەڵام بەرامبەر ئەم دۆزینەوەیە دوو ڕەخنە هاتنە پێشەوە : یەکەمیان هۆکارە دەوروبەری‌یەکان Invitonmental Faitors دەستیان بەسەردا نەگیرابوو ، دووەمیش ئەوەیە ئاخۆ دەرکەوتوویی لە

ھەموو ڕوویەکەوە پەیوەندی بە زیرەکی‌یەوە ھەیە چونکە بێگومان ھەردووکیان یەك شت نین . لە ساڵی ١٨٧٧ دا دۆگل Dudgale (٧٥٠) ئەندامی خێزانی (جەکل) ی بۆ مادەی حەوت نەوە دراسە کرد و بۆی دەرکەوت ناتەواوی لەم خێزانە تێکەڵاوەدا شتێکی باوە . ئەوەی بەتەواوی زانراوە حاڵی خێزانی (کالیکاك)ە کە لە ساڵی ١٩٢١ دا لی‌کۆڵراپەوەو بریتی بوو لە دوو ھێڵی نەوەکانی سەربازێك Two Lines of Descendants . لە سەرەتاوە کالیکاك کچێکی عەقڵ سووکی ھێنا وە نەوەکانیان زۆر حاڵەتی ناتەواوی ئەقڵی‌یان تێدا بوو . پاشان ژنێکی ئاسایی ھێنا ، لەنەوەکانی‌دا ناتەواوی لەو چەند نەوەیەدا کە لی‌ی کۆڵراپەوە ، بەدی نەکرا .

لە لێکۆڵینەوەی ئاڵۆزتری دوانەی ھاویەك Identical Twins دا بەڵگەی زیاتری کاریگەری زگماك لە زیرەکی‌دا پەی‌دابوو . بۆ نموونە لێکۆڵینەوەی ئەندامانی ھەمان خێزان لێك نزیکی ڕادەی زیرەکی نیشان‌داوە ، بە ڕادەی ٢٩٪ بۆ یەکەم ئامۆزاو ٩١٪ بۆ دوانەی ھاویەك . لە لێکۆڵینەوەی ئەو دوانە ھاوتایەدا کە دوور لە یەك بەخێوکراون دەرکەوتووە کە لێك‌چوونی زیرەکی ئەو دوانە ھاوتایەی بە جیا بەخیوکراون کەمترە لەوەی بەیەکەوە بژین . لێك‌چوونی باوان-مندال لە باوانی خوێنی‌دا lood Parents زیاترە وەك لە باوانی بەخێوکەر Foster Parents ، ئیتر منداڵەکە لای باوانی خوێنی بەخیو کرابێت یان نا – پیاو لە ھەموو ئەمانەوە ئەتوانێ دەردەنجامی ئەوە بکات کە زگماك ھێزێك ئەدات بە منداڵ کە لوانەیە یا لەوانە نیە دەوروبەر گەشەی پێ بکات .

**دەوروبەر** :

ئەگەر دوانەی ھاوتا بەجیا بەخێوبکرین ، IQ یان ئەشێ بەرادەی ٢٠ خاڵ جیاواز بێت . ئەمە دەری‌دەخات کە ھەرچەندە بەھۆ زگماکەوە دوو کەس ئەشێ وەك یەك دەست‌پێ‌بکەن لەوانەیە بەھۆی دەوروبەری جیاوازەوە جیاواز دەرچن . لە نموونەیەکی کاریگەری‌ی دەوروبەردا منالێك کە ئەوپەڕی دواکەوتوو بوو Retarded و لە دەوروبەرێکی ھەژارو خراپ‌دا مابوە ڕادەی زیرەکی‌ی زیاتر کەم بووە . لە لایەکی ترەوە نموونە زۆرە کە ڕاھێنانی تایبەتی کە دەوروبەرێکی باش دەرەخسێنێ ڕادەی زیرەکیش وردە وردە زیاد دەکات . ھەندێ منال لە پرۆگرامی Head Start دا کە زیرەکی‌یان بە ڕاھێنانی تایبەتی گەشەی کردبوو کاتێ گەڕێنرانەوە بۆ زروفی ئەوسایان دواکەوتن . بەڵام نموونەیەکی سەرنج‌ڕاکیش ئەو منالە ھەتیوەیەکە بە نازیرەك دانرابوو کەچی کە گەورە بوو زۆر توانای زیرەکانەی لێ وەشایەوە . مێژووی ئەم منالە بەدرێژایی چەندەھا ساڵ تێ‌بینی کرا . ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی منالی نیشانەی دواکەوتوی یەکی کەم بوون . بەڵام لە ھەلومەرجی گونجاودا . ئەو خرابوویە دەوروبەرێکی چا نەوەو تا ڕادەیەك گوێ‌ی درابوویە . ئەمرۆ کە گەورە بووە خاوەنی پلەیەکی پێشکەوتووە .

**ھۆکارەکانی تری گەشەی ئەقڵی**

ھاندان Motivation ئەشێ پەیوەندی بە زیادبوونی ڕادەی زیرەکی‌یەوە ھەبێت لەو کەسانەدا کە زیاتر ئارەزووی منافەسەو پەلامارو سەربە خۆیی‌یان ھەیە . کاری سەخت‌و ئارەزووی بەھێز بۆ زاڵبوون بەسەر پرسیاری (دژواری) زیرەکانەدا Intellectual Problems ، لەگەڵ بەردەوان‌بوون لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەرکی قورس‌دا ، ڕادەی زیرەکی زیاددەکەن . تەمەڵی (نەتوانین بەکارھێنانی توانای ئەقڵی) وا دیارە پەیوەندی بە کەمی ڕادەی زیرەکی‌یەوە ھەیە . ئەو باوك‌و دایکەی ھەلومەرجێکی گونجاد بۆ شارەزایی تازە دەرخسێن ، ئەوانە خەڵاتی بەرھەم‌ھێنانی زیرەکانە ئەکەن‌و گرنگی پێ ئەدەن ، ھانی منال دەدەن خۆیان دژداری‌یەکانی خویان حەل‌بەکن ، وە ئەوانەی شێوازێك بۆ بەرھەم‌ھێنانی زیرەکانە بۆ منالەکانیان دادەنێن . ئشێ بە ئاشکرایی پلە بە پلە زیادبوونی ڕادەی زیرەکی منالەکەیان ببینن . پێچەوانەی ئەمەش ڕاستە ، بۆ منالێك لە ھەلومەرجێکی پێچەوانەی توانا زیرەکی‌یەکانی‌دا بەخێوبکرێت . گەرچی دەروون زانان بەڵگەی ڕاستەوخۆیان نیە بۆ دەرخستنی ئەوەی کە مرۆڤ ئەتوانێ بەنقەست ڕادەی زیرەکی خۆی بەرزبکاتەوە ، ھەندێ قوتابی کولێج ئەتوانن ساڵ بە ساڵ ڕادەی زیرەکی‌یان چاك بکەن .

**دواکەوتوانی ئەقڵی The Mentally Rettarded**

**زۆر زاراوە دانراوە بۆ وەسف‌کردنی ئەو کەسانەی IQ** یان لە خوار حەفتاوەیە . دابەش‌کردنی تازە بریتی‌یە لە دواکەوتنی ئەقڵی زۆر کەم Mild ، کەم Moderate ، زۆر Severe وە ئێجگار زۆر یان تەواو یان قووڵ Profound . ئەوەمان لە بیر بێ کە ئەو شتانەی تاقیکردنەوەی زیرەکی دەیان‌پێوێ نیشانەیەکی ھەمیشەیی دابەش‌کردنەکە

نین . هەرچۆنێ بێ باش وایە دواکەوتنی ئەقلی Mental Retardation بە رادەی تەمەنی ئەقلی دەربیرین . دواکەوتنی زور کەم لەنیوان ٨-١٢ سال تەمەنی ئەقلیدایە . دواکەوتنی کەم ٦-٨ . زۆر دواکەوتوو تەمەنی ئەقلی ی ٣-٦ ساڵە وە تەواو دواکەوتوو تەمەنی ئەقلی ٣ ساڵەوە بە دریژایی ژیانی هەر وا دەمێنیتەوە . زۆر دواکەوتوو بە گەورەییش وەك منالێ دەجوولێتەو بە دەگمەن توانای قسەکردنو بەدەستهێنانی مەهارەتی سادەی هەیە . ئەوانەی زۆر کەم دواکەوتوون رەنگە بتوانن چوار تا شەش ساڵی قوتابخانە تەواو بکەن ، بتوانن بخوێننو بخوێنینەوە وە بە راهێنانی گونجاو لە دەوروبەرێکی باشدا رەنگە بتوانن خۆیان بژێنن . لەبەر ئەوەی تاقیکردنەوەکانی زیرەکی زیاتر بایەخ ئەدەن بە هۆکاری قسەیی Berbal Factors پیاو ئەتوانێ بزانێ بۆچی هەندێ دواکەوتوو دواکەوتووتر دەردەکەون وەك لە راستییان .

تاقیکردنەوەیەك کە زۆر بەکار دەهێنرێو بایەخ بە زیرەکی کۆمەلایەتیو پیشەیی دەدات تاقیکردنەوەی (Social Maturation Scale) کە خراوەتە زۆر بابەتەوەو پیشانی دەدات کە تەمەنی کۆمەلایەتی دواکەوتوییەکی عەقلی بەگشتی زیانۆە لەنەمەنی عەقلی بۆزور کەم وکەم دوواکەوتو تەمەنی کومەلایەتی لەنیوان ١٠ – ١٦ساڵ دایە تەنەلی کومەلایەتی ۆر دواکەوتوو ٤-٩ ساڵو هی تەواو دواکەوتوو لە خوار چوارەوەیە .

دواکەوتن دوو هۆی هەیە . ئەشێ بەهۆی ناتەواوی زگماکیەوە بێت ، یالەوانەیە لە بریتی کاتی لە دایك بوون گەشەنەکردنی مێشك بەهۆی ژەهراوی بوونی دایکەوە یە لەکاتی سكپریدا .

خراپ کارکردنی کوێرە گلاندەکان Endorine Glands ئەگونجێ ناتەواوی لە دوا بێت بەهەمان شێوەی شارێتی کرۆمۆسۆمەکان .

وا دانراوە کە لە ولاتە یەکگرتووەکاندا نزیکەی شەش ملیون منالی دواکەوتوو هەیە . زۆربەیان لە خێزانی رۆشنبیرنو ژیانی کۆمەلایەتیو ئابووریان بەرزە . کەمیان زۆر یا تەواوۆوونوئەتووانرێت زۆر کەم یارمەتییان بدرێت . راهێنانی تایبەتی یارمەتی زۆر کەمو کەم دواکەوتوو دەدات . کاتێ بایەخ دەدرێت بەو شتانەی کەسێك ئەشێ فێربکرێت بیکات ، نەك بەو شتانەی ناتوانێ بیکات ، زۆربەی ئەم کەسانە ئەتوانرێن راهێنرێن بەشێوەیەکی بەکەڵكو بەرهەمهێنەر بژین .

**بەهرەوەران The Mentally Gifted**

لەو پەری IQ دا زۆر زیرەك (١٢٠-١٤٠)وە بەهرەوەر یا بلیمەت (زیاتر لە ١٤٠) هەن . بلیمەتان زۆر چاك لێیان کۆلراوەتەوەو هەندیکیان بەدریژایی ژیانیان لەیاد نەکراون . لە منالیدا بلیمەت لە قوتابخانە سەرکەوتووە ، بواری ئارەزووی زۆر فراوانە ، خۆی بە زۆر شتەوە خەریك دەکات ، ژمارەیەکی زیاتر یاری دەکاتو کتێب زیاتر دەخوێنێتەوە . حەز دەکەن لەگەڵ هاوڕیکانیاندا ئاسایی (شعبی)بژین وە لە وەرزشدا باشن .

بەهرەوەران لە رووی عاتیفەوە لە خەڵکی زیاتر گونجاون . بە مانایەکی تر بەهرەوەران . بێجگە لە یەکەیەکەیان . حەز بە سەرکەوتوویی هەموو لایەنی دەکەن .

هەر چۆنێ بێ هەندیکیان زوو بێزار دەبنو تەنانەت رەنگە لە قوتابخانەش بکەون .

لێکۆڵینەوەکانی تێرمان Terman ئەو رایەیان سریوەتەوە کە دەڵێ بەهرەوە ر مرۆڤێکی تەنیای خراپ گونجاوە و بۆ ژیانی کۆمەلایەتی نابێ . تا رادەیەکی زۆر ، کەسانی زۆر زیرەكو بەهرەوەر خۆگونجێنو سەرکەوتوون .

لەبەر ئەوەی زۆر وریان بەهرەوەران تووشی دژواری دەبن . هەندێ جار زیرەك بوون بە باشتر دەزانن لەوەی بچن هاوڕێیەتی بکەن ، لەبەر ئەوەی لە منالانی هاوتەمەنیان بێزار دەبن ، منالی زیرەك بەدوای هاوڕێیەتی منالێ لە خۆی گەورەتردا دەگەرێ . هەندێ جار لەبەر زۆر پرس کردن بە چەنەباز ناو دەبرێت . لەبەر ئەوەی بەزۆری لە قوتابخانەیەکدا فێردەکرێ لەگەڵ ئارەزووو زیرەکی د ناگونجێ . منالی زیرەك ئەشێ دژواری خۆ گونجاندنی هەبێ . لەوانەیە بە (بەفیز) ناو ببرێتو بە جیاوازیو خراپی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرێت . جاری واهەیە بە شارەزاییەکی کەمەوە رووبەرووی دژداری دەبێتەوەو جاری واش هەیە وەك رێ ی لێ گیرابێ دەجوولێتەوە .

مامۆستایانی بە دیقەت تێبینی ئەوەیان کردووە کە منالی بلیمەت پێویستە بە چاوێکی تایبەتییەوە سەیری بکرێو ئەرکی وای بدرێتێ کە لەگەڵ تواناکانیدا رێك بێت کە بەزۆری چالاکی زیاتری منالێ دەگرێتەوە . بلیمەت کە گەورە دەبێ رەنگە دژواریی خۆگونجاندنی کەمتر بێت چونکە هەلی لە هەڵبژاردنی کارو ژیاندا زیاتر دەبێت .

Psychology

by

on Haller Gilmer

New York 1970



# کۆمەڵی هەنگ وئەو
# شتانەی لە بارەی
# پەروەردەیەوە وتراوە

مجید ندیم وەری گێڕاوە



هەنگ لەو گەزندە کۆمەڵایەتیەیە کە وەك بنەرەتیەك بۆ دابینکردنی ڕێڕەوی ژیانی ناوخۆی و شانەکەی ڕژێمێکی هەرەوەزی گرتۆتە بە ر . ئەم ڕژێمەش وا پشتی بە دابەش کردنی کارو هەڵسوڕانی پێویست بە ستوە کە وامان لێ ئەکات لە بەردەم ڕژێم و جوڵانەوەو گورج و گۆڵی و هاوکاری ئەم گەزندە بچکۆلەیەدا بۆ مانەوەو پاراستنی قەوارەی شانەکەی واق ورماو ڕابوەستین . بێگومان ئەم واق ورمانە نەك هەر وای لە لێکۆڵەرەوەکان کردوە کە لەم کۆمەڵە بکۆڵینەوەو نهێنیەکانی بزانن بگرە ساڵانیان بردۆتە سەر بۆ تێگەیشتنی جوڵانەوەو هەمو نیشانەیەك لە نیشانەکانی هەڵس و کەوتی ئەم گەزندەیە .

ئەمە بێجگە لەوەی لە ڕوی ئابوریەوە سەبارەت بە چاك کردنی زنجیرەی هەنگ و زۆرکردنی هەنگوین کە گەلێ لێکۆڵینەوە کراوە .

ئەم گەزندە سەرسوڕهێنەرە هەر لە کۆنەوە سەرنجی خەڵکی ڕاکێشاوە ئەم سەرنج ڕاکێشانەش لەوەدا دەرئەکەوێ کە لە تاجی فرعەونەکانی کۆنی میسردا وێنەی هەڵکەنراوەو لە بەرگەکانی ناپلیۆنیش دا وێنەی کراوە . هەروەها هەنگوینیش ساڵەهای ساڵ لە جێی شەکر سەرچاوەیەکی سەرەکی بوەو لەبارەی ئاینیشەوە پایەیەکی بەرزی بوە . بەڵام لە گەڵ ئەوەی کە مرۆڤ لە کۆنەوە دەربارەی هەنگ کۆڵیوەتەوە لە گەڵ ئەوەش دا لەم لێکۆڵینەوەی دا گەلێ باوەڕی چەوتیشی سەبارەت بە هەنگ بوە وەك (وایان ئەزانی کە هەنگی ناو شانە بەگوێرەی پەیڕەوی وردی (شا) ئەجوڵێتەوە . واتە شاژنیان بە شا دانوە) . هەروەها (فرجیل) کە نوسەریکی کۆنی لاتینە دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر بە وردی چۆتە بنج و بناوانی ئەوەی کە گوایە ئەبێ (گا) ئامادەبکرێت تا وەکو ژمارەی هەنگ زۆرتر بێ و بەرهەمی چاکتر بدەن ئەمەش بەو بڕوایە کە وایان زانیوە لەشی گای مردارەوەبو دروستکەری هەنگەو . بەڵام نهێنی ئەم ئەفسانەیە تا سەدەی هەژدەهەم هەروا مایەوە وەتە تا ئەو کاتەی کە دەرکەوت مێشێك هەیە شتێك لە هەنگ ئەچێ . ئەم مێشە ئەبێت گەرای خۆی لە لەشی ئاژەڵی مردارەوەبودا ئەکات و هێلکەکان لەو گۆشتە بۆ گەنە داهەڵدێن و گەورە ئەبن .

### پێگەیشتن و گۆڕانی هەنگ

لە لێکۆڵینەوەی ئەو چاڵانەدا کە گەزندەیان تیدایە . ئەتوانین بڵێین کە بە چەند ملیۆن ساڵێك هەنگ پێش

دەرکەوتنی مرۆڤ هەبوە . . هەروەها ئەو شتانەی ئەم لێکۆڵینەوەوانە دەریانخستوە ئەوەیە کە هەنگ لە زەردە واڵەی تاکەوە پەیدابوەو هەتا ئێستاش هەنگ لە زۆر کاروباریا ئەچێتەوە سەر زەوردەواڵەی پێشو ( وانە هەنگ پێش ئەوەی کۆمەڵایەتی بێ خواردنی گەزندەو جاڵجاڵۆکە بوە بەڵام کە کەوتە ژیانی کۆمەڵایەتیەوە خواردنەکەی بوە شیلەی گۆڵو دەنکە توو . کە ئەمەش ئەبێتە هۆی گۆڕانی دەمو گەدەو موەکانی کە لەشیان داپۆشیبو لە یەك جیابونەوە بۆ ئەوەی بە ئاسانی دەنکە تۆوەکانیان پێوە بلکێ ، دەرکەوتوترینی ئا ئەم گۆڕانانەشی کە لێیان دواین ئەوەیە کە لە هەردو لاقیانا چاڵ پەیدابو تا بتوانن دەنکی تۆوی تێدا کۆبکەنەوە . ئەمە بێجگە لە وەی کە لەگەڵ ئەم چاڵانەش‌دا شانەی دەنوك تیژبۆ لە شانەدانی دەنکە تۆو واتە جیاکردنەوەی لە موو کە رەسەی تایبەتی بۆ پەستاوتنی دەنکە تۆو لە چاڵاکانداو درکی درێژو رەق بۆ کۆکردنەوەی دەنکە تۆی ئامادەکراوی ناو چاڵەکان پەیدابون . . بەم جۆرە بە گوێرەی خاباندنی رۆژکار هەنگ توانی مێو دروست بکات بۆ ئەوەی لە هەڵچنینی شانەکانی‌دا بەکاری بهێنێ .

جا پێش ئەوەی کە بێنە سەر گۆڕانی ژیانی کۆمەڵایەتی هەنگی هەنگوین ئەبێ ئەوە بزانین کە هەنگی رۆژئاوا باڵەکانیان پەردەدران بەم جۆرەی لای خوارەوەن .

یەکەمیان بە پچڕێنەری گەلا ناسراوە ئەمەش گەزندەیەکن بەڵەکانیان پەردەدارن‌و کەمەرێك نیە کە سنگیان لە سکیان جیابکاتەوەو کەرەسەی دانانی هێلکەی ئەم گەزندانە وەك مشاری لێهات‌و مێکان بۆ بچڕاندی گژو گیاو کە لەبەر دروست‌کردنێکی ئەوتۆ بەکاری ئەهێنن کە وەك شوێنێك بۆ هێلکە لێ‌دانان بشێ . بەڵام کۆمەڵەی : دووەم کەمەرێکی ئەوتۆیان هەیە کە سنگیان لە سکیان جیابکاتەوەو مێرولەو هەنگ‌و زەردەواڵە سەر بەم کۆمەڵەیەن .

گۆڕانی ژیانی کۆمەڵایەتی هەنگی هەنگوین .

هەنگی هەنگوین گەزندەیەکی کۆمەڵایەتیەو لە کۆمەڵانی رێك‌وپێك‌دا ئەژی ، جا بۆ ئەوەی کە چونیەتی دەرکەوتنی کومەڵی هەنگ بەو رێك‌وپێکیەوە تێبگەین پێویستە کە وشەی تێگەیشتن‌و یاخود ناوی ژیانی کۆمەلایەتی ناو گەزندە شی‌بکەینەوە . لەم روەوە زۆر وتراوە بەڵام دوکتور ئیکس مورتان سنورێکی بۆ ئەم لێکۆڵینەوانە داناو توانی کە ئەم کارە پێش‌بخات . . بەڵام دوکتور (ئەی دیمس) وای بۆ چوە کە گەزندەی کۆمەڵایەتی (ئەو گەزندەیەیە کە لە ناو کۆمەڵێك‌دا ئەژی کە لە دایك‌و باوك یان بە لایەنی کەمەوە لە مێ‌یەك پەیدابوە کە تۆوکراوەو لەگەڵ منداڵەکانێتی .

ئەندامانی ئەم دوو نەوەیە لە شوێنێك‌و لەژێر بنمیچێك‌و یاخود خانویەك‌دا ئەژین‌و گەڵی هاوکاری هەمەجۆ ر یشیان لەناودا هەیە .

خۆ ئەگەر ئەم زانینە بە لامانەوە پەسەندبێ‌و لە گەلیا برۆین بۆمان دەرئەکەوێ کە گەزندەی کۆمەڵایەتی دایکەکانی لە هەمو ئەندامی خێزان تەمەنیان درێژترە .

کەچی ئەو گەزندانەی کە وا ژیانێکی کۆمەڵایەتیان نیە سێ‌یەکانیان پێش ئەوەی هێلکە کانیان هەڵبێن‌و بەچکەکانیان مل‌قوت‌بکەنەوە ئەمرن .

واتە ئەم تەمەن درێژی دایکە لە ژیانی کۆمەڵایەتی گەزندەدا وە لەو دایکە ئەکات کە خۆیان بۆ جێبەجێ‌کردنی هەندێ کار تەرخان بکەن‌و زیاتریش پەیوەندی بە منداڵەکانێوە هەبێ . . ئەم کارە ئەنجام بوە هۆی ئەوەی کە پەیوەندیەکی هەرەوەزی لەنێوان دایك‌و منداڵەکانی‌دا پەیدابێ . هەروەها گومان لەوەش‌دا نیە کە لە سەرەتادا واتە کۆن شاژنی هەنگ گەلێ کاری وەك دروست‌کردنی شانەو پەیداکردنی خواردن‌و چاودێری‌کردنی منداڵەکانیان کردوە کە ئەم کارانە شاژنی ئەمرۆی هەنگ نایانکات .

## گۆڕانی پەروەردەکردنی هەنگ

لە سەرەتاوە هەنگ لە ناو مرۆڤدا نەژیاوە هەر لە ئەشکەوت‌و موغارەکا ندا بون‌و دوای ئەوە بەماوەیەك گواستێوە بۆ شوێنی ئاوەدانی تاوەکو لەو ناوچەیەدا چاکتر کەڵك لە شیلەی گوڵو دەنکە تۆو وەرگرێت ، پاش ئەم گواستنەوەیە کەوتە ئەوەی کە پێ لە قەدی دارا ئەو شوێنانەدا شانە دروست بکات کە ئەیپارێزن . . بەڵام کە مروف بایەخی هەنگی بۆ دەرکەوت ویستی کە کەژنکی ئەوتۆی بۆ بخایەنی کە تیا بژی بۆ ئەمەش لە سەرەتادا چڵی تەر بان بۆ دروست‌کردنی سەبەتە بە کارئەهێناو ئەیویست کە لەناوەو دەرەوە بەرگی تێ‌بگرێ تاکو بتوانی پلەی گەرمای شانەکە بپارێزێ . . کەچی لە سەردەمی راپەرینی نوێ‌دا دوای لێکۆڵینەوەی رەوشتی هەنگ‌و شێوەی ژیانی سالی (١٨٥١) (لانکستورۆثی) زانا توانی ئەوە دەربخات کە هەنگ چەند ئەتوانی بە باڵ بڕبکات ئەم زانایە ئەوەی زانی کە هەنگ لە $\frac{٥}{١٦}$ی گرێ‌یەك لە بازنە یەکی شانەداو لەنێوان بازنەو دیواری شانەدا بەجێ‌ئەهێڵێ ، ئەم بڕکردنەش چەسپەو ئەم زانینە وای لەم زانایە کرد کە سنوقێکی تەختە دروست‌بکات‌و بەجۆرێ

دابەشی بکات کە ئەم برکردنەی تیدا توشی تەگەرە نەبەت .

دوای ئەم زانایە (گەهونس میهرینگ)ی زانا هات و ئەوەی دەرخست کە پێی ئەوتری بنچینەیەکی مێوی ، دەرخست ئەمەش بریتیە لە تەنەکەیەکی نەرم و نیان و چوارچێوەیەکی لە مێو دروست کراو و سەرەتای شەش چاویەکی بە سەروە یەو هەر هەنگەکە خۆی ئەکەوێتە تەواوکردنی ئەم کارە شەش چاوەیەی . ئەمەش هەرچۆنێك بێ توانایەکی گەورە ئەداتە دەست ئەم تەقەللا گەورەیەش کە بۆ بەرهەم هێنانی مێو ئەدرێ ئەبێتە بەرهەمدانی هەنگوین و بەتایبەتی ئەگەر زانیمان ئەو تەقەللایەی کە هەنگ ئەیدا بۆ دروست کردنی مێو پێنج ئەوەندەی ئەو تەقەللایەیە کە بۆ دروست کردنی هەنگوین ئەیدا . . ئەم قۆناغەش ئەو کاتە رون بوەوە کە ( فراز ئالی) سالی ۱۸٦٥ دۆزرایەوەو یارمەتیەکی گەورە بو بۆ پالاوتنی هەنگوین بێ ئەوەی بازنە مێویەکان بشکێن و لەناوبچن و یارمەتی هەنگیشی دا کە بەرهەمی زۆرتر بدا .

**ئەندامانی تیرەکە .**

ژیانی تیرەی هەنگ پشت بەو کارە تایبەتیە ئەبەستێ کە هەریەکێ لە ئەندامەکانی ئەیکەن کە ئەمەش لەسەر بنچینەپێکهاتنی سیکس و لەشی هەمو ئەندامیك دروست بوەو هەر ئەندامێك لەم ئەندامانەش ناتوانێ بە کارێك هەلسێ کە کاری خوی نەبێ . هەروەها تیرەکەش بەم جۆرەی لای خوارەوەیە .

**۱ - شاژن .**

مێنەیەکی بێ کەم و کورتیەو بۆ دایکی تیرەکە ناوئەبرێ و بە عەرەبی پێی ئەلێن (الیعوب) چونکە رەسەنترین ئەندامی تیرەکەیەوە لە هەمو تیرەیەکیش دا هەر شاژنێك هەیە (شاژن لە هەمویان درێژترو گەورەترە) سکی لە سکی ئەندامانی تیرەکەی باریك ترەو بالەکانی ناگاتە دوا پاشوی و لاقەکانیشی لە لاقی مێنە ئیشکەرەکان درێژترن و پاشوشی چالێ کۆکەرەوەی دەنکی تیانیەو نەچیلدانەی هەنگوین و نە لوی بۆ دەروانی مێو هەیە ، بۆ هێلکەدانان شتێکی کەوانی هەیە کە بۆ گەزینی شاژنێکی تر بەکاری ناهێنێ و کەرەسەی مندال بونیش زۆر گەورەیە لە کاتێکدا کە هی مێنە ئیشکەرەکان بە دەرەوە نیە . هەروەها رەنگی شاژن بەگوێرەی پشتەکانی هەنگ ئەگۆرێو درێژترین تەمەنی هەیە کە بە لایەنی کەمەوە چوار سال ئەژی .

**۲ - مێنە ئیشکەرەکان**

ئەمانە ئەندامانی مندال بونیان تەواو نین و بچوکترین ئەندامی تیرەکەن و لە هەر تیرەیەکیش دا چەند هەزارێك ئەبن . واتە بەشی هەرەزۆری دانیشتوی شانەکەن ، ئەمانەش بالەکانیان بە جۆرێکی ئەوتۆ بەهێزە کە بتوانێ یارمەتی فرینی بداو هەردو پشتی قاچیان سەولیان پیوەیە کە بەشیوەیەکی تایبەتی دروست بون و پێیان ئەلێن سەبەتەی دەنکە تۆو کە دێن دەنکە تۆوی ئەو گولانەی تێدا کۆئەکاتەوە کە سەریان لێ ئەوەن . سکیشیان هەر یەکەی چوار جوت لویان پێوەیە مێو دەرئەدەن بۆ دروست کردنی بازنەی شانەو لە دامێنی سکەوە شتێکی گەزتن هەیە کە بۆ بەرگری لە خۆیان بەکاری ئەهێنن .

**نێرەکان** :

لە مێنە ئیشکەرەکان گەورەترن بەلام کورترن و پاشویان پانەو بە مو داپۆشراوە . بالە کانیان گەورەو پتەون گیز.یان ێیوە دێ ، دوو چاوی زەقیان پێوەیە . نە ئامێرو نە خرتومیان هەیە کە بشێ بۆ ئەوەی شیلەیان پێ کۆبکەنەوە .

هەروەها لاقەکانیشیان کەلکی کۆکردنەوەو دەنکە تۆویان پێوە نیە ، لە هەمو تیرەیەك‌دا چەند سەدە سەرێك نێریتە ، هەن و لە شانەش‌دا دەرناکەون لەو کاتەدا نەبێ کە کاتی گورج و گۆلی هەنگ نەبێ کە مێنەکان لە کۆتایی پایزدا رزگاریان لێی ئەبێ .

ئێستا لەگەل ئەوەی کە لە تیرە تێگەیشتین کەچ چەند پرسیارێك لەبەر دەمما ندا قوت ئەبێتەوە وەکو :

چیە بۆتە هۆی ئەم جیاوازیە لەناو ئەندامانی تیرە یەکداو ئەو کارانە چین کەوا دراوە بە سەرشانی هەر تیپێك لە ئەندامانی تیرەکەو ئەو نەریتانە چین کەوا دەسالاتی بەسەر ئەم کومەلەدا هەیەو ئەو زمانە چی‌یە کەوا ئەندامانی ئەم کۆمەلە پێی ئەدوێن ، ئەم پرسیارانەو پرسیاری زۆر پێویستیان بە وەلام دانەوە هەیەو لاشم وایە کە وەلامدانەوەش شتێکی سەیر لە خۆیەوە بپێچی و وامان لێ بکات کە زیاتر لەم کۆمەلە بچوکە شارەزاتر بین . . لە نوسنێکی تردا بەیارمەتی خوا تەقەللا ئەدەین وەلامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە .

**سەرچاوەکان** :

۱ - کۆمەلی گەزندە نوسینی (برناموریس ل ۱۳ چاپی سێیەم ۱۹٦۹

۲ - هەر ئەو سەرچاوەیە .

۳ - پەروەردەکردنی هەنگ و بەریوبردنی کورە هەنگەکان .

د . احمد لطفی عبدالسلام ل ٥ . ٦

٤ - لە جیهانی ئاژەلدا (مێرولە و هەنگ و مۆرانەو زەردەزێرو د . حسین فرج زین العابدین ل ۸۰

لە گۆڤاری ( التقني) وەرگێردراوە

# طه حسین ی ماموستای پێشه نگ

ژیانی طه حسین بەهەموو ورەیەکی توانستی خۆیی‌و نەخشە ئەنجامدارەکانیەوە جۆرێك بووە لە ژیانی ئەو گەورە پیاوانەی کە بەسەر ئەو کۆسپ‌و گیروگرفتانەدا زاڵ‌بوون کە ئازاو لێهاتوو پەك دەخەن‌و کەڵەمێردترین مرۆڤ رەشبین‌دەکەن . . . ئەم مناڵە بەڵەنگانە نابینایەی کە لە دێ‌ی-الکیلو-ی(صعید)ی میسر لە دایك‌بووە . . . توانی بەهێزی بیروڕای خۆی‌و زانستی زۆری خۆیی‌و لێهاتوویی‌و داناییەکی بێ‌مانەندەوە خۆی لە ناو خەڵك‌دا بچەسپێنێ . . . وەکو هەموو گەورەپیاوە بەهرەدارە لە خۆدڵنیاکان هەژاریی‌و نەداراییی سەرەتای ژیانی خۆی لە یاددا هەر ماوکردنی بەکەرەسەی خاویی چیرۆك‌و داستان‌و ئاوێنەی بەسەرهاتی خۆی . . .

به پێچەوانەی ئەو بەڵای ناگەهانەی کە لەنێوانی ئەوو خەڵك‌دا بوو بە بەربەست . . . بە پێچەوانەی ئەو بەڵای ناگەهانەی کەژیانی ئاسایی لێ‌تێك‌دا ئەو ژیانە ئاساییەی کە خەلکی تر دەیگوزەرێنن . . . ئەم لاوە جل‌و بەرگ شرۆڵەی کە -وەك خۆی لە دواییدا بۆ کچەکەیی گێڕابۆوە- چەند مانگێك هەر بە هەنگوین ژیاوە- توانیویەتی کەم‌و کووری بێ‌توانایی پەککەوتەیی نابینایی خۆی بکا بە هێزێکی ئەوتۆ کە لێهاتویی خۆی بە سەر هەموو بیناو نابیناکاندا بنوێنێ . . . بەڵکو توانی ببێتە ناودارێکی جیهانی‌و لە دەرەوەی خاك‌و وڵاتەکەی خۆیشیدا سەرنجی خەڵك راکێشێ‌و لە هەروڵاتێك‌دا ڕێزی رۆشنبیریی بگیرێت خۆشیان بوێ‌و ڕێزی لێ‌بگرن . . .

ئەوەی سەرنج رادەکیشێ ئەوەیە کە پێشەنگەکانی راپەڕینی زانستی‌و وێژەیی نوێ‌ی عارەبی هەموویان لە دەرچوکانی دانیشگای الازهر-بوون ئەوانەی کە پەیوەندی‌یان بەرۆشنبیریی ئەوروپاوە بووە . . . دانیشگای (ئەلئەزهەر)لەسەرەتادا قازیی شەرع‌و ئاخوندەی مزگەوتی تیاهەڵدەکەوت . بەڵام هەر لە پەیدابوونی – رفاعە رافع الطهطاوی-یەوە کە پێشرەوی ئەم راپەڕینەیە ئیترگەلێ گەورە پیاوی ناوداری وەکو (محمد عبده)و (علي عبدالرزاق)و (طه حسین)و (زكي مبارك)وگەلێ‌کەسی‌تر کە لەم راپەڕینە نوێیەی عارەب‌دا بەشداری‌یان کردووە لە دانشگای- الازهر-دا پێگەیشتوون . . . ئاشکراشە ئەوانەی‌کە لە بواری بیرو وێژەدا کەلتووریی عارەبی سەرچاوەی رۆشنبیرییان‌بوو . . . ئەوانە نووسەری قۆناخێکی تایبەتی بوون‌و ئێستاکە کەم کەس دەبینین ئاوڕیان لێ‌بدەنەوە ئەوانەش زۆربەیان لە لایەنێکی ئەکادیمییەوە کەڵکیان لێ وەردەگرن . . . نموونەی ئەو نووسەرانە- مصطفی لطفی المنفلوطي-و-مصطفی صادق الرافعي-یە . . . گومان لەوەدانیە ئەم دوو نووسەرە ئاوێنەی سەردەمەکەیان بوون‌و توانیویانە بەوردی باری کۆمەڵگاکەیان بخەنە سەر کاغەز . . . بەڵام لەبەر ئەوەی کە پەیوەندیان بە رۆشنبیریی ئەوروپاوە نەبووە نەیانتوانیوە شتێکی نوێ‌و نەمر بنووسن . . . جا ئێمە بۆمان هەیە بپرسین ئایا ئەگەر طە حوسەینیش هەر پەیوەندی بەو رۆشنبیرییەوە ببوایە ' کە دانیشگای-الازهر-پێ‌ی دەبەخشی لەسەر هەمان رێبازی نووسینی ئەو دوو نووسەرەی تر دەروێشت یانا . . .؟ئاشکرایە دانایی ولێهاتویی طه حسین وەکو (رفاعه الطهطاوی)لە پلەی یەکەمدا پەیوەندی هەیە بەو خوێندنەیەوە کە لە ئەوروپا تەواوی کرد بەڵگەیەکیشمان بۆ ئەم قسەیە طه حسین خۆیەتی کە باسی بەراوردکردنی وانەکانی وێژەو رەخنە لە نێوانی ماموستایانی دانیشگای -الازهر-و ماموستایانی ئەو دانیشگا ئەوروپاییانە دەکات کە تیایاندا خوێندوویەتی . . . روونی‌کردۆتەوە کە جیاوازیی ئەمان و ئەوان ئاسمان‌و رێسمانە . . . رەنگە هەر ئەم بەراوردکردنەش هانی‌دابێ کە بەپەرۆشەوە بێن بە رۆشنبیریی ئەوروپاییەوە بنێ . . . چونکە خۆی وتەنی خۆراکی مێشك‌و گیانی‌تیادا دۆزیوەتەوە . . . جا خۆئەگەر ئەم بەراوردکردنە پاڵی‌پێوەنابێ کە هەڵوێستی دژایەتی‌و شۆڕشکردنە دژی هەموو کۆن‌و دێرینەیەك هەبێ کە لەگەڵ ژیانی تازەدا ناگونجێ‌و کەڵکی لێ‌وەرناگیرێ خۆ ئەوە ئەو تەوژمە گشتییەی کە ژیانی-میسر ی ئاراستە دەکردو بەرێوەی دەبرد زۆر یارمەتی داوەو لەوبارەیەوە پاڵپشتی کردووە . . . هەر لە سەرەتای خەباتی نیشتمانی‌یەوە دژی شاڵاوەکەی -ناپلیۆن- بۆسەر-میسر- ساڵی ١٩١٩ ئەوە روون‌و دیاربوو کە رێگای رزگاری

دوو هێڵی هاوشانن و لێك ناترازین ئەو دوو ڕێگایەش : (ڕێکخراوو زانیارین) . . . ڕێکخراو بوونی سەرکردایەتییەکی هوشیار مسوەگەر دەکات و زانیاریش گەشبینی و دووربینی گەل و تێکۆشان لە پێناوی زانیاری‌دا جێگایەکی گرنگی هەبوو لە جوولانەوەی ژیاندنەوەی شارستانی‌دا . . . لەبەرئەوە هیچ سەیر نیە ئەگەر ببینین لە کاتێك‌دا کە شۆڕشی عرابی هەڵگیرسا کە ڕاپەڕینێکی میللی ڕاستەقینە بوو هەوڵ و تەقەلای ئەوەی‌دا کە میسر لە خەوی سڕی سەدەکانی ناوەندراپەڕی و جێگای نوێی خۆی بدۆزێتەوە یەکێك لە پیاوە ناودارەکانی ئەو ڕاپەڕینە – محمود سامي البارودی– بوو کە یەکێك‌بوو لە پێشرەوەکانی جوولانەوەی نوێکردنەوەی شیعر هەروەها– عبدالله النديم– یش کە یەکێك‌بوو لە پێشەنگەکانی جوولانەوەی نوێکردنەوەی پەخشان و وتار لە هەمان کات‌دا یەکێکیش بوو لە پیاوە ناودارەکانی ڕاپەڕینەکەی– عرابی– هەروەها (محمد عبده)ش کە لەسەرەتادا یەکێك‌بوو لە پێشرەوەکانی لە دوایی‌دا یەکێك‌بوو لەوانەی کە هەوڵی بەربلاوکردنەوەی بیری ئاینی دەدا . . . هەروەها– لطفي السيد–یش کە کتێبی– ڕامیاری– ئەرستۆ–ی وەرگێڕاوەو خاوەنی ڕۆژنامەی –الجريدة– بوەو یەکەم سەرۆکی دانیشگای میسر بوە لە ساڵی ۱۹۲۵دا یەکێك بووە لەوانەی کە لەو جوولانەوەی بێداربوونەوە گشتی‌یەدا بەشداری‌یان کرد کە بەسەر ژیانی میسردا گوزەری‌کرد . . . ئەنجا طه حسين قوتابی (لطفي السيد) لە ڕۆژنامەی –الجريدة–ولە دانیشگا – ولە – پارتی ئەمەل–دا پەیدا دەبێ بۆ ئەوەی سەرکردایەتی گیمەکە بکات لە شەڕی زیندووبوونەوەو پێشکەوتن‌دا . . . . !

طه حسين ڕۆڵەی سەردەمەکەی خۆی بووە . . . ئەو سەردەمەی کە گۆڕەپانی چەندین تەوژم و هێڵی ڕامیاری و بیروباوەڕی جۆربەجۆر بووە . . . سەردەمی گەڕانی مرۆڤ بووە بۆ خوودی خۆی و چەسپاندنی ئەو خوودە لە دوای خەوێکی درێژ . . لەبەر ئەوە دەبوو هەر مشت و مڕو ناکۆکی گەرم بوایە دەربارەی (ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا)و (شەبقە)و (فێس)و (نەتەوەی میسری و (نەتەوەی عارەبی)و بیری نەتەوەیی)لە گۆشە نیگای هۆزایەتی و ئاینەوەو (زمانی نووسین)و(زاراوە ناوچەیی‌یەکان)و (نرخ و پایەی شارستانیەتی عارەبی)لە چاو شارستانیەتە مرۆڤایەتی‌یەکانی دیەوەو (پەیوەندی ئەو شارستانی‌یەتە بە ئەورووپاو دەوروبەری دەریای سپی ناوەڕاست و کەلتووری ڕۆمان و ئەغریقی‌یەکانەوەو چۆنیەتی فێرکاری و جۆرەکانی فەرمانڕەوایی و ڕۆڵی «الأزهر»و گرنگی دانشگای میسری و ئەرکی سەرشانی . . .)

ئەو ڕۆژگارە ئاڵۆزە وەکو دەڵێن پێویستی بە طه حوسەینێك هەبوو چونکە ئەو گۆبەنگ و بشێوی‌یە پیاوانێکی گەورەی وەکو طه حوسەینی دەویست . . . ئەوەشی ڕاستی بێت گەورەیی ئەو ئەوەیە کە لەبواری لێهاتوویی و بلیمەتی خۆی‌دا گەلێ خزمەتی گرنگی پێشکەش‌کرد . .

گەورەیی طه حسين لەوەدابوو کە توانایەکی دەگمەنی لە شیکردنەوەو پێکبەستنەوەدا هەبوو کە بابەتێکی شیبکردایەتەوە هەمووی دەگێڕایەوە بۆ ڕەگەزە سەرەتایی‌یەکانی و لە چوار چێوەی بیرێکی پوخت و گەییودا ئامێتەی دەکردن . . .هەروەها لایەنێك لە گەورەیی طه حسين لەوەوە دەستی‌پی‌کرد کە بەشداریی لە لێکۆڵینەوەی زانیاری‌دا کرد . . . ئەوەبوو کتێبی (في الشعر الجاهلي) بە چاپ گەیاند ئەو کتێبە ڕێڕەوی زانیاریانەی طه حسين لە بواری بیرکردنەوەو نووسین و دانان‌دا ڕوونکردەوەو چەسپاندی . . .

ڕێبازی ئەم کتێبەی کە چەند وەچەیەك لە ڕۆشنبیرانی پی‌گۆش و پەروەردە بووە پێشەنگایەتی طه حسين دەچەسپێنێ . . . ئەو ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانیاری‌یە کە لەسەری ڕۆی پێویستی‌یەکی گرنگی نەتەوەیەك‌بوو کە هەڵچوون بەسەر بیری‌دا سەری دەکردو زاڵ بوو . . . کاکڵەو جەوهەری بیری کتێبی (في الشعر الجاهلي) کۆن و دیاری‌یەو هەندێ لە ڕەخنە گرانی کۆن باسیان کردووە لەوانە ابن السلام– هەروەها بەر لە طه حسين هەندێك ڕۆژهەڵاتناسیش لی‌ی دوواون . . . بەڵام نرخ و بەهای کتێبەکە لەو مشت و مڕو شەڕە قەڵەمە ژیرانەیەدایە کە طه حسين دەربارەی شیعری جاهلي و بوون و نەبوونی ئەو شیعرەو گومانکردن لی‌ی خستی‌یە ئاراوە . . . گرنگترین خاڵی ئەو ڕێبازەش ئەو لایەنە زانستی‌یە بوو کە لەسەری دەڕوی . . . ئەوە شتێکی تازە بوو لەو سەردەمەدا کە نووسین و کتێب‌دانان تەنها هەر کۆکردنەوەی بێ وردبینی و سەرەنجام دانانی بێ‌بەڵگە بووە . . پێشەنگایەتی ئەم ڕێبازە ئەوسا زیاتر ڕووندەبێتەوە کە بزانین ئێمە تاوەکو ئێستاش هەڵویستی هەڵچوون و سەرگەرمیان دەربارەی زوربەی ئەو بەرهەم و بیرانە هەیە کە دەمانەوێ ڕەخنەیان لی‌بگرین یا هەڵیان بسەنگێنین . . .

هۆی ئەوەش نەبوونی پەیرەوو بیرێکی

وانستیانەی راستەقینەیە لە بابەتەکەماندا . . تەها حوسەین دەربارەی رێبازی -دیکارت-کە زۆر کاری تێکردووە . . . دەڵێ (خۆشیان بێ‌و ترشیان بێ دەبێ لە لێکۆڵینەوەی زانیاری‌و وێژەیی ماندا ئەم رێبازە کارمان تێ‌بکا وەك چۆن پێش ئێمە کاری لە خەڵکی رۆژئاوا کردوە . . .دەبێ لە رەخنەکاریی‌و مێژوونووسینی وێژەییاندا کەڵکی لێ‌وەرگرین وەك چۆن خەڵکی رۆژئاوا کەڵکیان لێ وەرگرتووە . . . چونکە بیرکردنەوەی ئێمەش دەیان ساڵە کەوتۆتە گۆرانکاریی‌و خەریکە بێ بە رۆژئاوایی یا روونتر بیڵێم لە بیرکردنەوەی رۆژئاوایی نزیکتر خەریکە دەبێتەوە وەك لە بیرکردنەوەی رۆژهەڵاتی-

طه حسین لەو رێبازەدا ونبووی خۆی دۆزییەوە کە نووسەرەکەی دەربارەی دەڵێ (ئەم رێبازە رەخنەگرو خاوەن لێکۆڵینەوە لە هەڵە دەپارێزێ‌و دەیگەیەنێتە رێگای راستی لە هەربابەتێك‌دا لێ‌ی بزانێ . . . بەبێ ئەوەی توانای خۆی لە هەوڵ‌و کۆششی لابەلادا بە فیرۆ بدات- دەشێ ئەو لێکچوونەی بەرێکەوت لە نێوانی طه حسین ودیکارت‌دا هەیە جێ‌ی چەسپاندنی ئەم رێبازو رێرەوەی لە دڵی‌دا کردبێتەوە . . . چونکە وەك چۆن دیکارت لە خوێندنکاری سەردەمەکەی خۆی یاخی‌بوو هەرواش طه حسین لە پێشینەی دانیشگای-الازهر-بەرەخنەبوو لێ‌ی یاخی بوو . . . هەردووکیان نەزانین‌و تاریکایی سەدەکانی ناوەراستیان بەرپەرچ دەدایەوەو بەگژ ئەو وشکە خوێندەوارو کۆڵکەرۆشنبیرە کەم بینانەدا دەچوون کە بەرگرییان لەو شتانە دەکرد . . . ئەبەم جۆرە زیرەکی‌و لێ‌هاتویی‌و دانایی‌یەی کە بەهەردوو کەلتووری رۆشنبیری عارەبی‌و ئەوروپایی گۆش کرابوو ئەم پێشەنگە توانی جێ‌پەنجەی رۆشنبیریی خۆی لە وێژەو مێژووی وێژەو رەخنەی کۆمەڵایەتی‌و پاشە رۆژی رۆشنبیری‌و شانۆی یۆنانی‌دا بەجێبێڵێ . . . بلیمەتێکەشی زیاتر لەو رێبازە زانستی‌یەدا دەردەکەوێ کە بە کاری هێناوەو دیاری کردووە . . . وەك نووسینەکانی . . . خۆ بەراوردکردنێکی ئاسایی لە نێوانی ئەم‌و نووسەرێکی تری بلیمەتی هاوچەرخی خۆی‌دا کە ئەویش- عباس محمود العقاد-ە لایەنەکانی سەرکەوتن‌و تایبەتێتی‌و لێهاتویی طه حسین بە ئاسانی ئاشکرا دەکات . . .

عەباسی عەقاد هەر لە کتێبی-الدیوان -یەوە دەکەوێتە شیکردنەوەی دەق‌و نووسەر وەك رەخنەیەکی وێژەیی لە باسکردنی خوودی کەسایەتی نووسەردا یا ئامێتە کردنی هەردوو لایەنەکە بۆ شیکردنەوەی ناودارانی مێژووی وێژە وەك ئەوکتێبەی کە دەربارەی شاعیری عارەبی-ابن الرومي - بەناونیشانی (ابن الرومي . . . حیاته من شعره) نووسیویەتی. ئەلێرەدا طه حسین ناتوانێ شان لە شانی عەقاد بدات چونکە لێکۆڵینەوە رەخنەیی‌یەکانی (بەشی سێهەم لە کتێبی-حدیث الاربعاء-و بەشی یەکەم لە-حافظ و شوقي-و-من ادبنا المعاصر-)ناتوانن شان‌بەشانی لێکۆڵینەوەکانی عەقاد بێن . . . تاوەکو لێکۆڵینەوەکانی دەربارەی-المتنبي-و-ابي العلاء المعري-کە زۆر باس‌دەکرێن ئەوەندەی کتێبی (ابن الرومي . . . حیاته من شعره)عەقاد بایەخدارو پوخت نیە . . . بەلام لێهاتویی‌و بلیمەتی طه حسین لەو رێبازە زانستی‌یانەیە دایە کە بە هۆیەوە دەگەیشتە ئەودیوی دەقەکان‌و خاوەن دەقەکان . . و لە چوار چێوەیەکی مادی‌یانەدا وەکو خاوەن بیرێك دەقە نووسراوەکان‌و کەسایەتی ئەو خاوەن دەقانەی شیدەکردەوە . . . ئەوەش ئەو لایەنەیە کە لە کتێبەکەی عەقاددا دەربارەی -ابی نواس - نیەو بەدی ناکرێ . . . بەلام طه حسین کە لەبەشی دووەمی کتێبی-حدیث الاربعاء دا- دەربارەی سەردەمەکەی-ابی نەواسی دەدوێ هەست دەورووژێنێ‌و مێشك سەرسام‌و حەیران دەکات . . .

رەخنەی وێژەیی سەربەخۆیی نەزانی‌و سنووری تایبەتی خۆی بۆ دیاریی نەکرا تاوەکو لێنەوەی وێژەیی لە لێکۆڵینەوەی مێژووی وێژە جیا نەبووەوە . . لەم بوارەش‌دا طه حسین بە هانداو جێ‌بەجێ‌کردنی زانیاریانە بەشداری کردوە . . . لەم رووەوە دەڵێ :(وێژە قسەی خۆش‌و کاریگەرەو ئەلێرەدا جیاوازیی نێوانی وێژەو مێژووی وێژە دەردەکەوێ‌و ئەو نووسەرەی کە خزمەت‌و راژەی وێژە دەکات دەتوانێ لە سنووری بەرهەمی جوانی پەخشان‌و هۆنراو دەرنەچێ‌و جگە لەو بوارە خۆی لە قەرەی هیچ شتێکی تر نەدات . . . بەلام مێژوونووسی وێژە ناتوانێ هەر لە سنووری بەرهەمی جوان‌و قسەی خۆش‌دا گیربخوات چونکە ناتوانێ بەو جۆرە کاربکاتە سەرمان‌و قایلمان کات بەڵکو دەبێ پەل بۆ مێژووی زانستی‌یەکان‌و فەلسەفەو هونەرە جوانەکان‌و مێژووی ژیانی کۆمەڵایەتی‌و رامیاریی‌و ئابووریش بهاوێ) دوای ئەوەی جیاوازیی نێوانی وێژەو مێژووی وێژەو شێوازیی چارەسەرکردنی هەریەکێکیان دیاریی دەکات کاریگەریی سەربەستیشیان دەخاتە سەرو لەو بارەیەوە دەڵێ (کەواتە وێژە پێویستی بەم سەربەستی‌یە هەیە . . . پێویستی بەوەهەیە کەوەك زانیاری‌یەکی

ئاینی یا وەك ڕێگایەکی ئاینی تەماشا نەکرێ . . . پێویستی بەوەهەیە کە لەم جۆرە پیرۆزی‌یە ئازاد بکرێو وەکو هەموو زانستی‌یەکانی دی دەستەمۆی ڕەخنەو لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەو گومانو بەرپەرچ‌دانەوەو گیروگاز بێت . . .)

ئەبەم چاوقایمی‌و ورە بەرزی‌یەوە طه حسین ڕووبەڕووی کۆمەڵگای خۆی‌بوو . . . طه حسین لە شیعری سەردەمی–جاهلی–عارەب گومانی هەیەو دەڵێ دروستکراوەو پەیوەندی بەو سەردەمەوە نیەو قورئانی پیرۆز بەتەواوەتی لەو سەردەمە دوواوەو خستویەتی‌یە ڕوو بەڵام ئەو شیعرە نەیتوانیوە بەوشێوەیە دەری‌برێ . . . لەبەرئەوە گومان لە شیعرەکان دەکاتو ڕای وایە کە دوای ئەو سەردەمە بەمەبەستی ڕامیاری‌و تیرەبازی‌و ئاینی‌و کۆمەلایەتی نووسراونو دراونەتە پاڵ ئەو سەردەمە . . . دەڵی :

(بۆچی ئەگەر ژیانی ئابووری عارەب لەو سەردەمەدا بەتەواوەتی نالەبارو پڕ لە ئاژاوەو گێچەڵ نەبوایە قورئان ئەوەندە باسی حەرامکردنی سوو هاندانی خەڵکی دەکرد بۆ جی‌بەجی‌کردنی زەکاتو خێروبەرات) ئەنجا دەڵێ (دەباشە شتێکی لەو جۆرە بابەتەم لە وێژەی –جاهلی–دا بۆ بدۆزەرەوەو تێم‌بگەیەنە لە کوێ دا پەخشانو هۆنراوێکی ئەو سەردەمە چنگ‌دەکەوێ کە باسی خەباتی دژایەتی نێوانی هەژارانو دەوڵەمەندان بکات . . . باشە ئیتر ئەمە چ وێژەیەکە ئەگەر نەبوونی هەژار دەرنەبڕێو ڕەنگدانەوەی باری دۆخی ژیانی خاوەنەکەی‌و ئەو خۆشی‌و سزایانەی کە چەشتوونی تیانەبێو باسی ستەمکاری‌و ناهەمواری‌و خوێنمژینی دەوڵەمەندان دژی هەژاران نەکات . . . ئایە لەو هەموو عارەبە چەوساوانە دا یەکێك نەبووە جارێ لە جاران زمانی بپژێو سکاڵاو بێزاری خۆی لەو ژیانە پڕ لە کوێرەوەری‌یە دەربڕێ . . .؟ئەی لەو هەموو عارەبە دەسرۆییو خواپێداوو خاوەن زەبروزەنگانەدا یەکێك نەبوو جارێ لە جاران زمانی بەربێو باسی گەورەیی‌و شانوشکۆی خۆشبەختی خۆیی ودەسەلاتی بەسەر ئەو کلۆڵانە دا دەربڕێ . . .؟)

ئابەو جۆرە طه حسین لە کاتێ خۆي‌دا پەلی بۆ دیاری کردنی ئەو هەموو هۆ کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌یانە هاویشتووە کە لە دروستکردنو هاتنەکایەی وێژەی هەموو سەردەمێکی هەر نەتەوەیەك‌دا ڕۆڵی خۆی دەبینێ . . .ئەنجامی ئەم بیروڕایانەی طه حسین تا چەندێك ڕاستە یا هەڵەیە ئەوە گرنگ نیەو ئێمە ناماوێ مشت‌ومڕو دەمەقاڵێ‌ی لەسەر بکەین . . . بەڵام ئەو شانازی‌یەی بۆ دەمێنێتەوە کە پێشەنگایەتی هەیە لە دامەزراندنی لێکۆڵینەوەی زانستی لە وێژەی عارەبیداو هەر لە یەکەم کتێبي‌دا کە بەناونیشانی (ذكرى ابي العلاء المعري) یادی (ابوغەلانی مەعەری) چاپی کردووە تۆوی ئەو بیروڕایانەی خۆی چاندووەو هەر لە سەرەتای ئەو کتێبەدا ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە بە ئاسانی باوەڕ بەهەموو ئەو شتانە ناکات کە پێشینان لە مێژووی ئەدەب‌دا باسیان کردووە . . . و زۆربەی ئەو ڕووداوانەش دەخاتە پشتگوێو بەرپەرچیان دەداتەوە کە بەبێ لێکۆڵینەوەیەکی ڕاستەقینەو دروست خستوویانەتە ڕوو . . .

ئەلەم ڕووەوە پەیڕەوی ڕێبازو ڕێڕەوی – سنت بیف– دەکات لە بواریی ڕەخنەکاري‌دا . . ئەو ڕێڕەوەی کە بەرهەمی هەر نووسەرێك شیکاتەوەو لێیکۆڵێتەوە دەیبەستێتەوە بەجێگاو زێدی گشتی ئەو نووسەرەو ژیانی تایبەتی ئەو نووسەرەوە . . . چونکە وێژە دیاردەیەکی کۆمەلایەتی‌یەو پەیوەندی هەیە بە هاوجووتی‌و تێکەڵاوی جێو شوێنی تایبەتی‌و گشتی ئەو نووسەرەو ڕادەی هەڵچوونیي خودو دەروونی هەستیاریی ئەوکەسەوە . . . طه حسین بەجۆرێك سەرمەستی ئەو ڕێبازە ڕەخنەیی‌یەی –سنت بیف– بوو بوو کەوای لی‌هات ناونیشانی وتارە ڕەخنەیی‌یەکانی خۆی– حدیث الأربعاء–لە ناونیشانی ئەو وتارانەی – سنت بیف–ەوە وەربگرێ کە هەموو ڕۆژێکی دووشەمان بەناونیشانی–احادیث الاثنین– وتارەکانی دووشەمە–وە بلاوی دەکردنەوە . . .

طه حسین ڕێبازیی ڕەخنەیی خۆی دەربارەی دیارەی و ێژەیی لەسەر بنەمایەکی کۆمەلایەتی دیاریی دەکات . . . بۆ نموونە لە بواری شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەی شیعری سەردەمی–ئەمەوی‌و عەباسی–دا ئەو گۆڕانکاری‌یە ئاشکرا دەکات کە دوای پەیوەندی پەیا کردنی عارەب لەگەڵ فارسەکان‌دا لە شیعری ئەو دوو سەردەمەدا ڕووی دا . . .و دەڵێ :(هەر لەگەڵ دەسپێکردنی غەزای ئیسلامی‌و چەسپاندنی دەسەلاتی خۆي‌دا بەسەر خاکی فارس‌و ڕۆم دا هەموو شتێکی ژیانی چینە دەسرۆشتۆکانی نەتەوەی عارەب کەوتە گۆڕان . . . سەرچاوەی گۆڕانەکەشی دوو شت بوو . . . یەکەمیان سەرچاوەیەکی مادی بوو ئەوەش لەو سامانو دارایی‌و دەسکەوتانەوە هات کە لە شەڕدا خوا بەسەر موسڵمانان‌دا دەیباراند . . . ئەو شتانە کە لە شەڕی سەرکەوتنی سوپای موسڵمانادا دەسدەکەوتن ژیانی ئەو خەڵکەی گۆڕی‌و ناخۆشی‌یانی کرد بە شادی‌و کۆسپیانی کرد بە تەختی‌و لە تەنگانەو ژیانی سەخت ڕزگاری کردن . . .

(مانەوی)

شتێکی کەشیان-معنوی-بوو ئەویش ئەوەبوو کە عارەب لەو وڵاتانە دا بەجۆرە ڕژێمێکی رامیاریی‌و فەرمانڕەوایی شارەزابوون لەوەو پێش لەگەڵی‌دا ڕانەهاتبوون‌و جۆرە ڕێگایەکیان بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری‌و وڵات‌و جێ‌بەجێ کردنی ئیش‌وکار بەرچاوکەوت کە لەوەو پێش هیچیان دەربارەی نەدەزانی . . . ئەم دوو شتە هەردەبوو کاری ئاشکراو بەهێز لەهەست‌و هۆش‌و ژیانیان بکەن . . . لەبەر ئەوە ئەلەو کاتەدا تازەکردنەوەی شیعر بە تەواوەتی‌و پڕ بەپێستی خۆی لەگەڵ گۆڕانکاری‌و تازەکردنەوەی ژیانی ئەودەمەدا گونجاوەو کارێکی دروست بووە . . .

لەسەردەمی ئەمەوی‌یەکان‌دا دوو جۆرە شیعر هاتە کایەوە کە لەسەردەمی جاهیلی‌دا نەبوون یا ئەگەر هەشبووبێتن لەو سەردەمەدا کەس بە وردی تێیان نەگەیشتوەو بایەخیان نەداونەتێ . . . یەکەمیان لە ئەنجامی پەرەسەندنی رادەی دارایی‌و پەیدابوونی ژیانی پڕ لە رابواردن‌و سەماو سوورەوە سەری هەڵداوەو ئەوەش شیعری -غەزەل-بووە . . . جۆری دووەمیان- شیعری سیاسی- بووە ئەویش لە ئەنجامی ئەوەوە پەیدابووە کە رژێمی -خلافة-کراوە بە رژێمی-پاشبەیەتی-و شەڕو ناکۆکی تیرایەتی‌و ئاینیش کەوتۆتە نێوانی خەڵك‌و کۆمەڵەوە . . . طە حسین دوای باسکردنی ڕێبازی هەوەسبازی باسی هۆکانی پەیدابوونی غەزەلی پاك‌و لەعەشقی خاوێنەوە هەڵقوڵاو دەکاو دەڵێ :

(ئەوانەی لەم هونەرە دا سەربەرێبازی هەوەسبازی بوون لە خەڵکی تێروتەسەلی ناوچەی حیجازو نەوەی -مهاجر-و-انصار-ەکان بوون کە لە باوکیانەوە سامانێکی زۆریان بۆ بەجێ مابوو لەبەر چەند هۆیەك لە کاروباری رامیاری دوورکەوتبونەوەو . خوویان‌دابۆ رابواردن‌و هەوەسبازی‌و خواردنەوەو گۆرانی‌و غەزەل) بەڵام ئەو کەسانەی کە ڕێبازی دڵداریی خاوێن‌و دوور لە هەوەسبازیان گرت‌و بەگەرمەوە بەرگری‌یان لێ‌دەکرد . . . خەڵکی بیابان بوون . . ئەوکەسانە بوون کە لەسایەی رژێمی زەبروزەنگی ئەمەوی‌یەکان‌دا لەپلەی رامیاری دووربوون هەژاریی‌و نائومێدییان تێکەڵ بووبوو . . لەبەر ئەوە لە ژیانی مادی‌و هەوەسبازیی‌و رابواردن دوورکەوتنەوەو بەرەو ناخی دەروونی خۆیان وەرگەڕانەوەو ئەو شیعرە خەماوی‌یانەیان نووسی‌و بۆیان بەجێهێشتین . . .)

طە حسین لە توێژینەوەی وێژەیی‌دا ڕێبازو ڕێڕەوە ئەورووپایی‌یەکانی گرتووە بەپێی بۆچوونی ڕێبازیی -سنت بیف- دیاردەی وێژەیی بە شوێن‌و جێ‌و کۆمەڵگاوە دەبەستێتەوە . . . ئەمەش جۆرە توێژینەوەیەکی نوێ بوو بەر لەم لە توێژینەوەی نوێ دا بەم قووڵی‌و وردبینی یەوە کەسی دی پەی پێ‌نەبردبوو خۆی لەقەرەی نەدابوو . . .

دوو وەچە لە وێژە دۆستان‌و ئەدەب پەروەران چ لەو قوتابی‌یانەی کە مامۆستا طە حسین لە دانیشگاکان‌دا پەروەردەی کردوون یا لە دوورەوە بەرهەمەکانیان قۆزتوتەوەو خوێندوویانەتەوە لەسەر ئەم ڕێبازە گۆش کراون‌و پەروەردە بوون . . . ئەلێرە دا نرخ‌و بەهای طە حسین دەردەکەوێ لە ئاراستەکردن‌و ڕێنمایی کردنی سەردەمی خۆی‌دا بەجۆرێك کە ناشارێتەوەو دەیچەسپێنێ کە بلیمەترین‌و داناترین نووسەری ئەو سەردەمەبووەو تاقانەی ناو هەموو نووسەرە بلیمەت‌و داناکانی دەوروبەری خۆی بووە . . .

بەڵام بایەخدانی بە مێژووی ئیسلامی‌و لێکۆڵینەوە لێ‌ی لەوساوە دەستی پێکرد کە دوای لە- احمد امین‌و عبدالحمید العبادی-کرد (کە دوو هاوڕێ‌ی خۆی بوون) ژیانی سەرەتای ئیسلامەتی بنووسنەوەو هەریەکێکیان لە لایەن خۆیەوە چمکێکی لێ‌بگرن‌و روونی‌کەنەوە . . . جگە لەوەش طە حسین توانی خۆی لەقەرەی ژیاننامەی پێغەمبەر بدات‌و کتێبی-علی هامش السیرة- بنوسێت‌و باسی ژیانی هەر چوار خەلیفە گەورەکەی ئیسلام (ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان‌و عەلی بەوردی تۆمار کات‌و لە کۆمەڵگای ئیسلامیی دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر بکۆڵێتەوەو لەو بارەیەوە کتێبی (مراة الاسلام)و (الوعد الحق) بنووسێ . . .

طە حسین دوای ئەوەی کە بنەمای رەخنەی وێژەیی چەسپاند بواری مێژووی ئیسلامی سمی‌و چوە ناویەوەو باسی ژیانی کۆمەڵگای ئاینی ئیسلامی شیکردەوەو باسی کرد . . . لە سەرەتا دا بەرەنگاری پرسیارێك بوو کەدەبوو وەڵامی بداتەوە پرسیارەکەش ئەمە بوو : (سنووریی پەیوەندیی نێوانی توێژینەوەی زانستی دەربارەی مێژووی کۆمەلایەتی‌و نێوانی بە پیرۆزیی ڕاگرتنی ڕواڵەتی ئاینی پاڵەوان‌و کەسەکان تا چ رادەیەکە)وەڵامی ئەو پرسیارەش هەر لە ساڵی (١٩٢٣)دا لە وتاری-رد علی نقد-دا درابۆوە کە لە -٢٢-ی شباتی ساڵی ناوبراودا بلاوکرابۆوە هەروەها دوای ئەوەش لە بەشی دووەمی کتێبی-حدیث الاربعاء-دا دووبارەی کردۆتەوە ئەویش لە پەنای وەڵامدانەوەی -رفیق العظم-دا دەربارەی ئەو نەخشە باسەی کە بۆ هەردوو سەردەمی ئەمەوی‌و عەباسی‌و

خەلیفەکانیان کێشابووی . . . کە دەڵێ (تا ئێستاش زانای بەرێز «رفیق بك العظم» وگەلێکی تر لە زانا ناودارو ناسراوەکانی رۆژهەڵات مێژووی ئیسلامی بە جۆرە پیرۆزیی و نەوازشێکی ئەوتۆی ئاینی یا نیوچە ئاینی زەرکەفت دەکەن کە بیێتە کۆسپێك لە نێوانی هۆش و لێکۆڵینەوەیەکی رەخنەیی زانستی‌یانەی راستەقینە لی‌ی . . . ئەوان باوەریان بەشکۆی پێشینانی عارەب و بزورگی‌یان هەیەو رێزی پلەو پایەیان دەگرن‌و هەموو ناووناونیشانێکی زل‌و هەموو خێرو بێرێکیان دەدەنە پاڵ‌و لە هەموو ناتەواوی‌و کەم‌وکووری‌یەك یاکانەیان بۆ دەکەن‌و کارە مەزنەکانیان دەخەنە رووکارە نابەجێکانیان سەرنگون دەکەن ئەنجا لەو بۆچوون‌و تێگەیشتنەوە پلەو پایەی رەخنەو لێکۆڵینەوەکانیان دادەرێژن . . .)دوایی دەڵێ :

(بەلام کەم زاناو لێکۆڵەوەر سەیری رەخنەی مێژوویان وەکو رەخنەی مێژوویی کردوەو سەرنجیان لە خەڵك وەکو خەڵك داوەو وەکو خەڵك لێیان‌دواون‌و خورەوشت‌و نەریتیانیان شیکردۆتەوەو لایەنە جوان‌و بەزرەکانیان لە لایەنە پووچ‌و لابەلاکانیان جیاکردۆتەوە . . . ئەم جۆرە رێزلێنانەی رابوردوو داپۆشینی کەم‌وکووری‌یەکانی‌و زەرکەفت کردنی مێژوو بە ئاین قۆناخێکە دەبێ مێژوو هەر پیابروات . . . بەڵکو قۆناخێکە لە ژیانی رامیاریی خەڵك‌و هەردەبێ پیابرۆن . . . گەلی نەتەوەی تریش عارەب بەم بارودۆخە دا تێپەریون . .)ئەبەم بیر فراوانی‌و گیانی زانستی‌و ورە بەرزی‌یەوە طە حسین مامۆستاو پێشەنگی بواری بیرو مێژوو رەخنەو نووسینی هونەریی بەرهەمەکانی بەرێزێکی تایبەتی‌و دیارنووسیوەو لەنگەری گیانی خۆی تیاتوانۆتەوە . . هەر لە بیرمە قوتابی بووم لە کۆلێژی ئەدەبیات کۆمەڵێکی زۆر لە قوتابیانی -ئەسکەندەریە-و مامۆستایانی زانکۆ گەمارۆمان دابوو بەنەوازشەوە گوێمان لی‌گرتبوو . . ئەوە یەکەم جار بوو بەچاوی چاوانم بیبینم‌و بە گوێی گوێیانم دەنگە کاریگەرەکەی بژنەفم . . . پیاو لە دەنگە بەسۆزەکەی‌و گونجاندنی چینەکانی دەنگی لەگەڵ جۆری واتای قسەکانی‌دا مەست‌و حەیران دەبوو . . .(سهیل القلماوی) دەڵێ :-

(رێبازی طه حسین ئالوودەو ئامێتەی گیانی عارەبیی‌و فەرەنسایی‌و یۆنانی‌یەکانە بۆ نموونە کتێبی -الذعر الضریر-ی رێبازیی رەمزیی فەرەنسایی کاری لی‌کردوەو جێ پەنجەو مۆرکی ئەو رێبازەی پێوە دیارە . . . بەلام کتێبی -الصبح اذا تنفس- کاریگەریی‌و مۆرکی قورئانی پێوە دیارە) . . . بە درێژایی رێبازە زانستی‌یەکەی هەڵویستی مەردانەو بتەوی هەبووە . . . خاوەنی رێرەوی راست‌دان بە زەبروزەنگ‌دا نانی‌و دوای ئارەزووی خۆی ناکەوی‌و لە بایەخ‌و نرخی کەسانی دی کەم ناکاتەوە . .

هەروەها خاوەن ورە دەبی‌و تارادەیەك «کە لە وزەی توانای مرۆڤانەدا بی» سەنگین‌و شکۆدار دەبێ هەر لەبەر ئەوەش بوو کە قایل نەبوو بروانامەی دکتۆرای شانازیی بە هەندێ پیاوانی رامیاریی ببەخشی‌و بەرووی-حلمي عیسا پاشا-دا کە وەزیری پەروەردەی ئەو وەختە بوو هەڵشاخاو پی‌ی وت : (ئەی پاشا عەمیدی کۆلێجی ئەدەبیات ئاخوندو مەلانیە تاوەکو وەزیر بتوانێ فەرمانیان بەسەردابکا . . . من هەرگیز قایل نیم بروانامەی دکتۆرای شانازیی بە یەکێك ببەخشم لەبەر ئەوەی گوایە پیاوێکی ناودارو ناسراوە) هەروەها لە بواری بلاوبوونەوەی زانستی‌و زانیاریش‌دا هەمان هەڵویستی ئازایانەی هەبوو داوای ئەوەی دەکرد کە زانین وەکو ئاوو با بۆ هەموو کەسێك بێت‌و لە کتێبی- نظام الاثينين-دا کە کتێبێکی ئەرستۆیەو کردوویەتی بە عارەبی دەڵێ (من بۆ ئەوە فێر نەبووم کە تەنیا خۆم سوود لە فێربوونەکەم وەرگرم) هەروەها کتێبی (مستقبل الثقافة في مصر)ی کە داوای ئەوەی تیاکردبوو زانین بۆ هەموو کەسێك بێ چونکە زانین رێگای رزگاری‌یە گۆبەنگێکی گەورەی لە بواری خۆی‌دا نایەوە . . . لەو کتێبەی دا دەڵێ :

(ئەگەر دیموکراتیەت مسوگەر کردنی سەربەستی‌و ژیانی تاکە کەسی لە سەر بێ . . . ئەوا باشترین‌و بەتوترین کۆڵەکەی ئەو سەربەستی‌یە ئەو فێکردنەوەیە کە هەریەکێك لە ئێمە بتوانی کاروباری خۆی پی‌بەرێوە ببات‌و بەرگریی پی‌ بکات لە مافەکانی چونکە سەربەستی لە سەر نەزانین بنیات نانری‌و خۆی راناگری . . .) هیچ مەیریش نیە طە حسین باوەری وابێ کە زانیاری رێگایەکە بۆ جێ‌بەجێکردنی مرۆڤایەتی مرۆڤ‌و چەسپاندنی بزرگی مرۆڤ‌و شادیی‌و سەربەستی مرۆڤ . . طه حسین ئەو منالە هەژارە نابینایەی کە لە گوندێکی میسر دا لە دایك بووە کە لە سەر نەخشەی میسر دا جێگای نیە ئا ئەو منالە لە رێگای زانیاریی‌یەوە گەیشت بەو پلەو پایە زانستی‌یەی کە هەیەتی . . .

ئەو رۆڵەی کە ئەم مامۆستا پێشەنگە لە بواریی ژیانی بیرو رۆشنبیریی هاوچەرخی عارەبی‌دا گێراویەتی بەسە بۆ ئەوەی کە بیێتە لووتکەیەکی بڵند لە لووتکە رۆشنبیریی‌یەکانی سەدەی بیستەم . .

لە گۆڤاری (اداب المستنصریة) وەرگێراوە

# ئەرشیف

## فەسڵی دووەم

## بنج بنەڕەتەکانی بەڕێوەبردنی ئەرشیف

ڕۆشنبیری نوێ وەری گێڕاوە

### پێشەکی :

پێش ئەوەی باسی بنجو بنەڕەتە تایبەتی یەکانی بەڕێوەبردنی ئەرشیف بکەین ، پێویستە بەکورتی لایەنی وشەو مانا ، وە باسی ئەو پێناساندانە بکەین کە دەربارەی ئەرشیف کراون . وشەی ئەرشیف یۆنانی یەو چاوگەکەی ئەرشیۆن ، ئەرخیۆنەو Archeion بە هەندێ دەستکاری کردنی کەمەوە لە وشەو دەنگدا لە زمانەکانی تردا بڵاوبووەتەوەو بەکارهێنراوە ، لە زمانی لاتینی دا ئەرکیفۆمو Archivum لە ئینگلیزیو لە فەرەنسی دا Archived و لە ئەڵمانیدا (ئەرشیف Archiv) و لە ئیتالیدا Archivo و لە زمانی هۆڵەندیدا Archief بەکاردەهێنرێت . ئەوەی سەیریشە ئەوەیە کە ئیدیۆمەیەکی عەرەبی بۆ ئەم وشەیە لە ئارادانی یە ، هەرچەندە زمانی عەرەبی لە خاکی شارستانیەتەکاندا پەیدا بووە . لە عیراقی کۆندا یەکەم کۆی کۆنینەی دۆستیو بەڵگەنامەی سەر بە شارستانێتی سۆمەر دەرکەوتووە کە لە پەرستگاکانیدا دەپارێزران . لەسەردەمی ئاشوریدا ژمارەی قور بڵاوبووەوەو کتێبخانەی (ئاشورْ بانیپال) کۆمەڵێك دۆستیو بەڵگەنامەو زانیاری لەسەر دەوڵەتی ئاشوری تێدا بووە .

لە میسری کۆندا ، کۆمەڵێکی ڕێکوپێکی بەڵگەنامە دۆزراونەتەوە کە لە پەرستگا کۆنەکانیدا هەڵگیراونو(1) هەرچەندە عەرەب ڕژێمی فەرمانڕەواییان زانیوەو دیوانیان داناوە ، بەڵام

بەداخەوە ، بەڵگەنامەی ئەسڵی‌و زانیاری تایبەتی‌مان لەبارەی ئەم دیوانانەوە دەست‌نەکەوتووە ، چەند تێکستی هەندێکیان لەدەست‌نووسەکاندا هەیە وەك (صبح الأعشى)ی قلقشندی . عەرەبی ئەم سەردەمەش لە مەسەلەی ئەرشیڤدا کەمتەرخەمن وەك عەرەبەکانی پێشوو . لە کاتێکدا کە لێکۆڵینەوە ئەرشیڤی‌یەکان لە دەوڵەتە پێشکەوتووەکان‌دا گەیشتوونەتە ئاست‌و پلەیەکی بەرز ، لە وڵاتە عەرەبیەکاندا بایەخێکی ئەوتۆیان پێ‌نادرێ .

پەیدابوونی بنەرەتی ئەرشیف لە ئەوروپا لەسەدەی چوارەم‌و پێنجەمی پێش زایینی بوو . وا زانراوە کە خەڵکی ئەسینا قەواڵە گرنگەکانیان لە پەرستگای میژوون‌دا کە بەدەستخەتی خۆی بووە . هەر لەم پەرستگایەدا هەڵگیراوە . هەروەها دەستنووسی رۆمان نووسەرە بەناوبانگەکانی یۆنان‌و لیستەی خەڵات‌و میدالیاکانی یاریەکانی ئۆلۆمپی[2] لەم پەرستگایەدا پارێزراون .

لە سەدەکانی ناوەراست‌دا ، دەوری ئەرشیف لە ئەوروپادا تەنیا ئەوە بوو کە قەباڵەو ئەو بەڵگەنامانە بپارێزێ کە ماف‌و ئیمتیازی خێزانە دەربەگ‌و پاشاکانیان دەپاراست . بەڵگەنامەکانیش موڵکی دەوڵەت نەبوون ، بەڵکو هی وەزیرو بالیۆزو شابەندەرەکان بوو ، دوای ئەوەی لەسەر کارەکانیان لادەبران[3] .

سەدەی نۆزدەهەم — دوای شۆرشی فەرەنسا — دامەزراندنی خانەی ئەرشیف راپەراندنێکی گەورەی بەخۆیەوە بینی و بەسایەی ئەم شۆرشەوە یەکەم خانەی ئەرشیڤی نەتەوەیی (نیشتمانی) لە سەدەی نوێ‌دا دامەزراو ئۆباڵی ئەستۆی دەوڵەت بەرامبەر بە پاراستنی بەڵگەنامەکان جێگیرو ساغ‌کرایەوە ، بەو شێوەیەی کە کەلەپورێکی نەتەوەییەو کۆکردنەوەی ئەبێ لە جێگایەکدا بێت[4] . شۆرشی فەرەنسا دەرەبەگی لەناوبردو ئەرشێڤەکانی فەرەنسای کرد بە یەك کە ئەوکاتە کە تەنیا لەپاریس‌دا نزیکەی «٤٠٥» مەڵبەند هەبوو ، ساڵی ١٧٩٠ ئەرشیڤی نەتەوەیی دامەزراو بەم پێیە خانەی بەڵگەنامەکان نەك تەنیا ئەماری بەڵگەنامە داوەری‌یەکان بوون ، کە جاران وابوو ، بگرە بوون بە مەڵبەندی لێکۆڵینەوە میژوویەکان‌و سەرچاوەیەکی گرنگی باسە زانستی‌یەکان[5] .

وە لە فەرەنسادا لە ساڵی ١٧٩٤ مەرسومێك دەرچوو کە بەگوێرەیەوە ماف بە گشت هاوڵاتیێك درا کە دەکەوێتە سەر گشت بەڵگەنامەیێکەوە ، بەو پێیەی کەلەلتووری نەتەوایەتیەو هی گەلەو ئەبێ لەرێگای دەوڵەتیشەوە هەڵبگیرێت‌و بپارێزرێت[5] . وە لەساڵی ١٨٣٨ دا لە ئینگلتەرەدا ، یاسایی رێکخستنی بەڵگەنامە دەرکراو کۆکردنەوەی خرایە ژێر چاودێری یەکێك لە قازیەکان (Master of the Rolls) . وە لەساڵی ١٨٥٨ی زایینیەوە بەردی بناغەی دەزگای گشتی بەڵگەنامە لە لەندەن‌دا دانرا . وە لە ئیتالیادا دەزگای بەڵگەنامە «ئەرشیڤی نەتەوەیی» لە ساڵی (١٨٦١)ەوە دامەزراو ، دوای یەکبوونی ئیتالیاوە ، شاری رۆما بوو بە بارەگای ئەرشیڤی نەتەوەییەوە .

هەر لە جەنگی دووەمی جیهانیەوە ، لێکۆڵینەوەی زانستی هەنگاوی بەرفرەی هاویشت‌و وای لێ‌هات پێشخستنی پشت بە بەڵگەنامەکانەوە ببەستێت . سەرەنجام بایەخێکی زۆر بە لێکۆڵینەوەی بەڵگەنامەکان دراو دەوڵەتیش لەبەر نرخە مەزنەکەیدا بۆ دەوڵەمەندکردنی کەلتووری بیرو سەرچاوەکانی میژوو بە موڵکی خۆی دانا[7] زۆر دەوڵەت لە سەدەی بیستەمدا بایەخیان بە دەوری ئەرشیڤی نەتەوەیی‌دا ، وەك رەگەزو بنچینەیێکی گرنگ لە رەگەزەکانی رۆشنبیری نەتەوایەتی‌داو وەك یەکەمین ئەمباری کەرەستەی لێکۆڵینەوە لە میژووی نەتەوەیی‌و زانیاری مرۆڤایەتی‌و کارەکانی بەرێوەبردن لە دیوانەکانی میرییەوە ، بگرە هەندێ دەوڵەت پەیرەوی زۆر ووردیان بۆ بەسەرکردنەوەی بەڵگەنامە دانا هەر لە پەیدابوونی یان گەیشتنی بە کارگێری‌ی گشتی تا دەگاتە قۆناخی هەڵگرتنی هەمیشەیی لە دەزگای ئەرشیڤی نەتەوەی یان فەوتاندنی پاش ئەوەی کە لەئاکامی هەڵسەنگاندنی بەڵگەنامەکانەوە ، بێ‌نرخ دادەندرێت .

### پێناساندنی ئەرشیف

فەرهەنگی ئۆکسفۆرد وا ئەرشیف دەناسێنێت کەوا ئەو شوێنەیە کەوا بەڵگەی گشتی‌ی‌و باوەرپێکراوە میژووییەکانی تیا هەڵدەگیریّ‌و دەپارێزرێت . وە هەمان وشەش بە کەرستەی بەڵگەنامەیی دەوترێت . هەروەهاش بەو دەستەیە یا ئەو بەرێوەبردنە کە بەکارەکانی سەرپەرشتکردنی ئەرشیڤەوە هەڵدەستێت . سەرەرای ئەوەی ئەم ناساندنە چەند سیماتێکی تایبەت بە ئەرشیڤەوە دەگرێتە خۆیەوە . وەك نرخی بەڵگەنامەکان لەرووی میژوویی‌و سەرچاوە گشتییەکەی لەهەندێ حاڵەت‌داو ، هەڵگرتن‌و پاراستنیان . بەڵام مەبەستەکانی پسپۆرە ئەرشیڤیەکان ناهێنێتەویەوە . وە ژمارەیێ لە شارەزاو کارزانە ئەرشیڤیەکاندا ، لەبواری ئەرشیڤەوە هەوڵی دۆزینەوەی

پێناساندنی وایان داوه که له شارەزاییەکانیانەوە هەڵقوڵابێت‌و چەند پێناساندنیان داناوه . که بەگوێرەی شارەزایی هەر یەکێك لەوانەوه . زۆر لەیەکتردا جیاوازن .

سیر هیلری جنکنسون Sir Higlary Jenkinson کۆمەڵەی ئەرشیڤ وا دەناسێنێت کەوا ئەو ئەرشیڤانە یان بەڵگەنامە ئەرشیڤیانەن کە لەکاتی بەجێگەیاندنی هەر کارێکەوه پەیدابووەو بەشێك بووه لەکارەکه خۆی جا لەبەر ئەوەوە لەلایەن بەرپرسیارانی هەمان کارەکانەوە . بۆ گەڕانەوه بۆیان . هەڵگیراوەو پارێزراوه . وه ئەمەش تەنیا له کارەکانی میرییەوە نیه . بەڵکو ئەبێ کۆمەڵەکانو کەس‌و دەستە نامیرییەکانیشەوه بەڵگەنامە بن .

بەگوێرەی ئەم پێناساندنەوە . جنکنسون وادەبینێ کەوا بەڵگەنامەکان بەشێوەیێکی ئاسایی‌یەوە لە ئاکامی کاروبار هەڵسوڕاندن‌دا کۆدەبنەوە . ئەمەش بەڵگەی کارەکە خۆیەتی‌و بەشێکە له کارەکاندا[١٠]

لەم پێناساندنەدا کە جنکنسون دایناوه (هدسون Hodson) گەیشتە چوار سیماتی کەوا کۆمەڵە بەڵگەنامە ئەرشیڤییەکان‌و بەڵگەنامە عادی‌یەکان لەیەکترەوە جیا دەکاتەوە :

یەکەم : کۆمەڵە ئەرشیڤییەکان بەشێکن لەو بەرێوەبردنەی که بەرهەمی کردووەو بریتین لە راستی‌ی چالاکیەکانی دەزگاکەو بەم جۆرە سیمەتی بێ‌لایەنی‌ی (Impartality) دێتە کایەوه .

دووەم : کۆمەڵە ئەرشیڤییەکان بایەخ لە کارەکانی هەڵگرتن‌دا وەردەگرێت . ئەمەش کۆمەڵەی ئەرشیڤی‌ی له کۆمەڵەی ئەو بەڵگەنامانە کەوا بەرێگای دەستکرد یان نائاسایی‌یەوە کۆ دەکرێتەوە . جیا دەکاتەوه . وەکارەکانی هەڵگرتن‌و پاراستن سیمەتی یاسایی بە کۆمەڵەی ئەرشیڤی‌ی دەدات‌و بە ولایەتی یاسایی (Legal Custody) دەست‌نیشان دەکرێت . رەگەزی پاراستنیش بۆ دیارکردنی بەڵگەنامە ئەرشیڤی‌یەکانەوە پێنزەیێکی گرنگە . بەڵگەنامەی ئەرشیڤی‌ی Archievl document) ئەبێ لەو شوێنەی کە یاسا بۆی دیاری دەکات هەڵبگیرێت‌و بپارێزرێت . ئەگینا لایەنێکی گرنگ له نرخەکەیدا گوم دەبێت . لێکۆلەرەکان بایەخ بە مەسەلەی ولایەتی یاسایی دەدەن . وه ئەمەش ئەبێ بەردەوام بێت‌و بەڵگەنامە ئەرشیڤی‌یەکانیش دوور لە چنگی دەست‌پیسەکانەوه بن . جنکنسون دەڵێ . ئەم یاساداری‌ولایەتی یاسایی - یە رەگەزو لایەنێکی بنجی‌یەو بەڵگەنامەی عادی لە بەڵگەنامە ئەرشیڤی‌یەکانەوه جیا دەکاتەوە .

سێیەم : بەڵگەنامە ئەرشیڤی‌یەکان بەشێوەیێکی سروشتی‌یەوە کۆدەکردێنەوە . واتە کۆمەڵەی ئەرشیڤی‌ی بریتی‌یە لەو بەڵگەنامانەی کە لە ئاکامی هەڵسوڕاندنی کارێکەوە دێنەکایەوه . ئەرشیف کۆمەڵی (مستندات) نیه . وەکو کەرەسەی مۆزەخانەو کتێبی کتێبخانەکانەوه به رێگاییێکی دەستکرد کۆکرابنەوە . بەڵکو بەرێگاییکی سروشتییەوە لە دیوانەکانی میرییەو . بۆ ئەوەی مەبەستی بەرێوەبردن بگەیەنێ . کۆدەکرێنەوە .

ئەم کۆکردنەوە سروشتیەش پەیوەندی سروشتی لە نێوان بەشەکانی کۆمەڵەکە هێنایەکایەوه . ئەو پەیوەندیەش بنجی گرنگیەکەیەتی‌و بەها زانستی‌یەکەی دەسەنگێنێت . نابێ ئەوەشمان لەیاددا بچێت کەوا لێکۆڵەرەوەکان باسی وا . که بەر بیری دامەزرێنەرانی‌یەوە ناکەوێت . لەم بەڵگەنامانەدا دەهێنە گۆڕی[١٥] .

چوارەم : هێنانەکایەوەی بەڵگەنامە بەرێگای سروشتی‌یەوە جۆرە یەکگرتن‌و یەکبەشنەوەو زنجیرەداری لەناوەوەو دەرەوەی کۆمەڵەی ئەرشیڤی دا دەبەخشێت . نرخی بەڵگەنامەکەش بەم پەیوەندیەوە بەندە . وه بەڵگەنامە بە تەنیا بەرامبەر بە لێکۆڵەرەوەکان رەنگە هیچ نەبێت .

ئەم چوار سیمەتە لەمەڕ رێگاکانی بەرێوەبردنی بەڵگەنامە ئەرشیڤی‌یەکانە پاشماوەو کاری راستەوخۆ دەبینن . هەر لەپەیدابوونە سروشتی‌یەکەیەوە رێچکەی بنجی لە رێکخستن بەڵگەنامەدا هاتە کۆڕێ . زانایانی ئەرشیڤیش تا رادەی پەرستنەوه بایەخیان بە مەسەلەی پاراستنی رێگا کۆنەکاندا دەدا . واتە بەڵگەنامە ئەرشیڤی‌یەکان نابێ بە رێگاییێك کە پێچەوانەی رێگا کۆنەکە بێت . نە رێك بخرێ‌و نەرێزیش بکرێت . هەندێکیان لەو کاتەی کە ویستیان بەگوێرەی پەیرەوی کتێبخانەکانەوە رێك بخەن . دەرحاڵ هەڵەی ئەم بیرەیان بۆ روون‌بووەوەو . جێ‌بەجێ‌بوونیشی لەرووی زانستییەوه مەحاڵە . سەرەڕای ئەوەی بینیان کە بەڵگەنامەکان سیمەتی یەکگرتن‌و بەیەك‌بەستنەوە گوم دەکەن‌و کەڵکی ئەوە نادات بیرێکی تەواو لەمەڕ ئەو باسەی کە مەبەست لێکۆڵینەوەیەتی پێك‌بهێنرێت .

بۆ رێکخستنی کۆمەڵەی ئەرشیڤی‌ی بۆ ئاسان‌بوون خستنەشوێن‌خۆی‌و دەرکردنەوەی لەکاتی پێویستدا پێویستی بە پەیرەوێکی راست‌و دروست هەیە . وه کارەکانی هەڵگرتن‌و پاراستنیش پێویست بە ئەمارو شوێنی وا چاك دەکات . بەڵگەنامە لە ئاوی باران‌و جرۆجانەوەرو

شتی ترەوە دوربخاتەوە . سەرەرای زانین و بەهەند هەڵگرتنی پلەی گەرماو شێداری و تیشك لەناوەوەی ئەمارە . وە هەر لە پاراستن و هەڵگرتن دا . بەڵگەنامەی دراوو تێکچووو زێرەگەچراو . بەهۆی نوساندنەوەی بەکاغەزێکی تایبەتەوە یان بەکارهێنانی قوماشی ئاوریشم . گەر هاتوو هەردوو دیوی بەڵگەنامەکە نووسرابوو . پاك بکرێتەوە . وێنەگرتنەوەش جۆرێکە لە پاراستنی بەڵگەنامەو هێنانەکایەوەی یەکێکی تر لەکاتی بزربوونیدا یان نەمانی بەڵگەنامە ئەسڵی یەکەدا . هەروەها ئەبێ بەڵگەنامە وێنەگیراوەکان لەجیاتی بەڵگەنامە ئەسڵی یەکانیدا بەکار بهێنرێن بۆ ئەوەی لەکاتی بەکارهێنانی لەلایەنی خوێنەرەوە بەر گەچران و دران نەکەوێت .

زانایانی ئەرشیف لەمەر رادەی بایەخدان بەم سیمەتانەوە جیاوازن . هەندێکیان وادەبینن کەوا هەر سیمەی بێ لایەنی یە بەڵگەنامە ئەرشیڤی یەکان لە نووسراوەکانی تردا جیا دەکاتەوە . ئەوش بەو بیانۆیەی کەوا بەڵگەنامە ئەرشیڤی یەکان و نووسراوەکان سیمەتی رەسەنی ی هەڵدەگرن . وە ئەبێتە هۆی تێکەلاوبوون . بە تایبەتی لە نێوان ئەمیندارانی کتێبخانەکان و ئەرشیفیستەکانە . جیاوازی نێوان بەڵگەنامەکان و نووسراوەکانیش روونە . کۆمەڵە ئەرشیڤی یەکان خۆیان لەخۆیاندا نەهاتوونەتە کایەوە . بەلکو بریتین لە هەنگاوو کارو ئەو کردەوانەی کە بەهۆیانەوە دەستکەوتوونەو جێبەجێ کراون . کۆمەڵی ئەرشیڤی ی بەرهەمی کارێکە . جا بەم جۆرە بەڵگەنامە بەڵگەی کارەکە خۆیەتی (١١) . وە بەشێکە لەو دەزگایەی بەرهەمی کردووەو مەرجە لێکۆلەریش نرخە کارگێرییەکەی بزانێ و جگە لە راستی دا هیچ لەم بەڵگەنامانە لێك نەداتەوە . بەڵگەنامە دەسکەوتی هەوڵ و تەقەلای جۆرەها کەسە . جا لەبەر ئەمەوە وەك کەرەسەی خاوە بۆ راستی ی و زانیاری یەوە . وە بە رێگای سروشتێیەوە . بەدرێژایی تێپەربوونی کاتەوە کۆدەکرێتەوە . نەك وەك ئەو راستی ی و زانیارییانەی کە لە کتێب دا هەن کە بە رێگای ئیرادەو ویستی ی مەبەستداری تاکەکەسییەوە کۆدەکرێنەوەو بەر گۆرین و لەراستی لادان و دەستکاری کردن دا دەکەون . هەندێکی تر وا دەبینن کەوا بەڵگەنامەکان خۆیان دەستکردی مرۆڤن و نابێ تاکە سیمەتی راستبوونیان بدرێتی (١٢) .

هەندێکی تریشیان وا دەبینن . کارەکانی پاراستن رەگەزی بنچی یەو بەڵگەنامە عادیش لە بەڵگەنامەی ئەرشیڤی یەوە جیا دەکاتەوە . وە هەندێکیان وا مەرج دادەنێن کەوا ئەم بەڵگەنامە پارێزراوانە ئەبێ دروست و رێکخراو بن بۆ ئەوەی کاتی پێویست بەئاسانیەوە بۆ بگەرێنەوە (١٣) .

لەمەوە ئەتوانین بەکورتی ئەوە بڵێین کەوا کۆمەڵە ئەرشیڤی یەکان بە چەند سیماتی چاك و باش کە لەئاکامی پەیدابوونە سروشتی یەکەیەوە وەك بێ لایەنی (Impartiality) و راستی ی (Authenticity) پەیوەندی نێوان بەڵگەنامەکان Interreletionship . لە بەڵگەنامەکانی ترەوە جیا دەکرێنەوە .

سەرەنجام ئەم سیماتانە ئەو رێگایەی کە بەڵگەنامەکانی پێ رێك دەخرێن و ئە کارە رەسمی و بەسە ئەکادیمیەکانەوە کەڵکی لێوەردەگیرێت دیاردەکات .

*** لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی هەیە لەژێر ناوی «ئایا وشەی ئەرشیف عەرەبی یە ؟» لەژمارەی چواری گۆڤاری «الوثائق العربية» دا کە لقی هەرێمی بەڵگەنامەکانی عەرەب دەری دەکات . بلاوکراوەتەوە .**

**(١) عامر ابراهيم القنديلچي وآخرون . المعلومات الصحفية وتنظيمها الأرشيف الصحفي . بغداد . ١٩٧٨ ص ١٢ ١٤ .**

2 – Schellenberg (T.R) . Modern Archives, P.4.

٣ محمد أحمد حسين . الوثائق التأريخية – القاهرة – ١٩٥٤ ص ٢

٤ الدكتور عبد اللطيف ابراهيم/دار الوثائق التأريخية واهميتها : البرنامج التدريبي الحادي عشر للمشرفين على اعمال المخطوطات في الجهاز الحكومي طرابلس ١٩٧٣ ص ٣ .

٥ محمد احمد حسين . الوثائق التأريخية . ص ١٧ .

6 – Schellenberg. (T.R.) Modern Archieves P.11

٧ د. عبد اللطيف ابراهيم . دورة طرابلس (١٩٧٣) ص ٥ .

٨ محمد احمد حسين . الوثائق التأريخية . ص ١١ .

٩ المصدر السابق . ص ١٢ .

١٠ المصدر السابق . ص ١٣ .

11 - Hodson,(T.H.) The Administration of Archives.P.4

12 - Frank B.Evans.The Administration of Archieves Areview. The American Archivist. October. 1973.P.541

١٣ د. سلوى علي ميلاد . الارشيف . ماهية اداريته . ص ٤




### بۆ پیرەمێردو لێکەوتووان

دوا ئامێرێك لەم پێناوەدا داهێنراوە وبریتی‌یە لە دوو ئامێر یەکێك بۆ ناردن ئەوی تر بۆ وەرگرتن ، دەشتوانرێت وەرگرتن بکرێت بە ناردن و بەپێچەوانەشەوە ، ئەویش بەدەست‌نان بە دوگمەیەکدا لەو سێ دوگمەیەی بە ئامێرەکەوەیە .

بەم چەشنە دەتوانرێت ئەم ئامێرە بە پیرەمێردیان پەککەوتە یان منداڵ بدرێت ، کە کەس‌و کاریان چوونەتە کارکردن یان دەرچوون‌و سەیران ، ئەگەر ویستی بانگی کەس‌وکاری بکات ئەوا دەست بە دوگمەیەکدا دەنێت‌و قسەیان لەگەڵ دەکات ، بەڵام تەنیا کۆسپێك هەبێت ئەوەیە کە توانای ئەم ئامێرە لە دوو کیلۆمەتر تێ‌ناپەڕێت .



### چەتری گوللەبەند !

لەم سەردەمەدا لەزۆر وولاّتانی دەرەوەدا زۆر لە تیرۆر دەترسن واتە لەکوشتن‌و لەناوبردن ، بۆیە کۆمپانیا شارەزاکان خەریکی پەرەپێدانی بەرهەمەکانی خۆیانن بەچەشنێك لەدەرەوە رواڵەتیان جوان بێت‌و بۆبەکارهێنانیش سوود بەخش بن‌و کاریگەریش بن .

ئەم بەرهەمانەیش زۆرو جۆراوجۆرن ، هەر لەکراسی گوللەبەندەوە بگرەتا دەگاتە پاندانێك گوللە دەتەقێنێت‌و ، نارنجۆکی فرمێسك هێنەرو چەترێکی ئەوتۆی پتەو بۆ باران‌و بۆ خۆپاراستن لە گوللە بەکاردێت ، بەچەشنێك دەتوانین ناوی چەتری گوللەبەندی لێ‌بنەین !

لەوانەیشە زۆر کەس هەبن ئاواتە ئەوە بخوازن کۆمپانیا شارەزاکان چەتری گوللەبەندی‌وا دروست‌بکەن مرۆڤ لە تۆپ‌و مووشەك‌و نارنجۆك بپارێزێت .

## تەلەفزیۆنی هاوڕێ

خەڵکی ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر پەیوەستییان بە تەلەفزیۆنیەوە پتەو تردەبێت ئەمەیش وای لە یەکێك لە کۆمپانیای دروستکردنی تەلەفزیۆن کرد لەژاپۆن بیر لەوەبکاتەوە هەمووشتێك بخاتە نێو ئەو ئامێرانەی دروستیان دەکات کە ببنە هۆی ئەوەی خزمەتگوزاریی گشتی پێشکەش بە بینەران بکەنو لە ماندوێتییان کەم بکەنەوە .

دوا داهێنانی ئەم کۆمپانیایە کاتژمێرێکە بەقەد تەلەفزیۆنەکەوەیەو بەشارراوەیی دەمێنێتەوە تاکوو ئەوکاتەی دەتەوێت بزانیت کات چەندە .

ئەنجا دەست بەدوگمەیەکدا دەنێیت بەو قوتووە ئەلکترۆنیەوەیە کە بەدەستیەوە دەگریت ، گورج دەنگێکی نەرم کاتت پێ دەڵێت بە سەعاتو دەقیقەو چرکەو یەك لەدەی چرکە .





## بەفری دروست کەر

بەماوەی نیو سەعات ئەم مەکینە بچووکە کە بەناوی (بەفر دروستکەری نێومال) دەناسرێت دەتوانێت چەندین کلۆ بەفری چوار گۆشەییت پێ ببەخشێت تا دەگاتە دە کیلۆگرام لە ڕۆژێك‌دا ، کە بەشی بەکارهێنانی پێنج سەد پەرداخ ئاو بکات یان هەر شتێکی تر کەبتەوێت ساردی بکەیت .

ئەم مەکینە یان کارەکەرەیکە بەقسەت دەکات لەهەر شوێنێك بتەوێت بەفرت پێ دەبەخشێت ، لە ماڵدا ، یان لە ئوتێل ، یان لە نەخۆشخانە ، بگرە لە سەیرانو گەشتیش‌دا ، ئەویش لەبەر ئەوەی بەکارهێنانی زۆر ئاسانەو بچووکەو نرخیشی هەرزانە .

# یانەی رۆشنبیران

**خوێنەری بەرێز :**

بەپێویستی ئەزانین کە جارێکی تریش دوپاتی بکەینەوە کە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ بە پشت‌و یارمەتی‌و هاوکاری تێکرا رۆشنبیرانی کورد بەرێوە ئەچێ . گەشە ئەکا . پەرەئەسێنێ‌و بنج دائەکوتێ . بۆیە نیازو مەبەستی ئێمە لەکردنەوەی ئەم گۆشەیەدا «یانەی رۆشنبیران» تەنها ئەوە نیە کە وەرامی هەندێ نامەی خوێنەران بدەینەوەو بەس ، بەڵکو ئامانجمان ئەوەیە کە ئەم یانەیە ببێتە گۆشەیەکی بەپێزی زیندوویی گەرموگور ، رۆشنبیران تیایا بیروراو . لێکۆڵینەوە ، رەخنە . . بۆچوونی خۆیان ، لە هەموو روویێکەوە دەربخەن‌و بلاوبکەنەوە . . جا بۆ خۆشکردن‌و گەرمکردنی ئەم بەشە . . داوا لە رۆشنبیران ئەکەین کە بەشداری‌و هاوکاری خۆیان لەم بابەتەوە پیشان دەن . . چاوەنواری قەڵەمی رەنگین . . بیری بە پێزو ، نووسینی هەمەجۆرتان لەم رووەوە ئەکەین .

هەروەها داوا لە نوسەران‌و خوێندەوارانی بەرێز ئەکەین کە بەردەوام‌بن لە دەربرینی بیرورایان بەرامبەر تێکرا ناوەرۆك . . وێنەو روخسارو زمانەوانی‌و بابەتە جۆراوجۆرەکانی گۆڤارەکەیان . . تا ئێمەش بەهۆی بیروراو رەخنەکانیانەوە بتوانین بەسەر هەڵەو چەوت‌و نارێکی گۆڤارەکەدا زاڵ‌بین‌و بەپشت‌و هاریکاری هەموو لایەك بەرەو پێش‌چوون‌و سەرکەوتن برۆین . .

لەدواییدا داوا لە نوسەران ئەکەین لە نوسینەکانیاندا ناوی خۆیان‌و جێگاو مەڵبەندیان بەروونی بنوسن بەتایبەتی نوسەرانی لاو . . ئەوانەی کە تازە دەستیان داوەتە قەڵەم‌و هێشتا ئەستێرەیان لە جووڵانەوەی رۆشنبیری کوردیدا بەتەواوی نەدرەوشاوەتەوە .

● **بۆ بەرێز ماموستا حامید فەرەج لە بەغدا**

نامەکەت بەناوی (نامەیەك لە دەریاوە) کە وەرگێراوە لە عەرەبیەوە پێمان گەیشت ، بەلام لەبەر ئەوەی چیرۆکەو لە بابەتی گۆڤاری «بەیان»ی بۆیە ئێمەش ناردمان بۆ بەیان بە سوپاسەوە . هەروەها داواکارین لە ماموستا کە رۆشنبیرێکی کۆنی کوردە کە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ لە بەرهەمە بەنرخەکانی بێ‌بەش نەکا بەتایبەتی ماموستای ناوبراو ئەتوانێ هەموو جارێ یا وەرگێراوێکی زانیاری‌و زانستی ، یا بەرهەمێکی خۆی ، یا سەرگوزەشتەیەك لە تاقی‌کردنەوەی ژیانی رۆشنبیری خۆی بۆمان بنوسێ . . تانەوەی ئەمرۆی رۆشنبیری لە تاقی‌کردنەوەکانی کۆن کەڵك وەربگرێ .

● **بۆ بەرێز کاك جمال أحمد حسن لە سلێمانی :**

پارچە هەڵبەستەکەت بەناوی (سکالای قارەمانێکی کورد لە کوردوستانی ئێران) پێمان گەیشت بەسوپاسەوە . جا لەبەر ئەوەی گۆڤاری رۆشنبیری نوێ بۆ بابەتی زانیاری‌و زانست‌و مێژوو و فەلسفە . . هتد تەرخان کراوە بۆیە نامەکەمان بۆ بەیان . رەوانەکرد . . ئومێدەوارین کە لەمەودوا لەگەڵ خۆخەریك‌کردن بە هەڵبەستەوە کەمێکیش بۆ بەشەکانی تری رۆشنبیری خۆت خەریك کەیت تا گۆڤارەکەمان بە بەرهەمە وەرگێراوەکانت برازێتەوەو رۆڵەی رۆشنبیری ئەمرۆ کەڵك وەرگرن .

● **بەرێز کاك بهاء الدین جلال لە بەغدا**

باسەکەت بەناوی (بارنتسکی‌و رۆمانی مێژوویی) بە کەڵك‌و سوودبەخشە . . بەلام نازانین بۆچی باسی سەرچاوەی وەرگرتنەکەت نەکردووە . هیوادارین لەمەودوا بابەتی باشترمان بۆ بنوسی . . لەگەڵ دەست‌درێژکردن بۆ ئەو سەرچاوانەی لێیان وەردەگریت . . داوای سەرکەوتن‌و بەرهەمی بەپیزو سوودبەخش‌ترت لێ‌ئەکەین .

● **بەرێز کاك ئاراس عزیز عبد اللە .**

نوسینەکەت بەناوی (ئانیشتاین‌و لادانی کانی) خراپ نیە . . بەلام لەبەر ئەوەی لەم زوو[illegible] [illegible]ۆکراوەتەوە بۆیە داوا لە نووسەر ئەکەین کە بازنەی نوسینی فراوان‌تر بکا . . وە بە بەرهەمەکانت بێ‌بەشمان نەکەیت . داوای سەرکەوتن‌و پێشکەوتنت دەکەین .

● **بەرێز کاك نجم الدین رشید .**

وەرگێرانەکەت بەناوی (تەنگوچەڵەمەی پەرەنەستاندن لە ولاتە پەرەنەساندەکاندا) پێمان گەیشت . بەلای ئێمەوە ئەگەر ئامادەت بکردایە بۆ خوێنەر بەکەڵك‌ترو سوودبەخش‌تر ئەبوو . . بەراستی وەرگێران ئەگەر بخرێتە شێوازێکی دەقاودەقیەوە وشك‌و

برن دەرئەچێ . گرنگ ئەوەیە خوێنەری کورد لە بابەتەکە بگا . . ئومێدەوارین کە لەمەودوا لە بەرهەمەکانت بێبەشمان نەکەیت . . چەندت لە تواناداهەیە بۆ خزمەتکردنی جوولانەوەی رۆشنبیری کورد پێشکەش بکەیت .

لە دوایی‌دا حەز بە پەیوەندی بەستن لەگەڵت ئەکەین تا نووسراوەکەت بۆ رەوانە بکەینەوەو چاوەکی پێدا بخشێنیتەوە بۆ ئەمە زیاتر بشێ بو بلاوکردنەوەی داوای سەرکەوتن‌و بەرزیتان ئەکەین .

● **بەرێز کاک خالد حسین**

باسەکەت فۆلکلۆری یە بەناوی (ئەرزانە یان گران) خراپ نیە . بەلام ئەوەی پێویستە بوترێ لە رووی زمانەوانیەوە کزو لاوازە . . هەروەکو دارشتنەکەشی پتەوو بەهێز نیە . داواکارین کە لەمەودوا قەلەمت باشترو کاریگەرتر بخەیتە کار . . وە بەرهەمەکانت . قەشەنگ‌تر . . دلگیرکر بێ ، تا لای خوێنەری کوردو پەسندبو نرخ‌دار بێ‌و جێگای تایبەتی لە دڵ‌ودەروونی خوێنەردا بکاتەوە . ئیتر داوای کۆڵ‌نەدان‌و سەرکەوتنت ئەکەین .

● بەرێز کاک بەیاد عبد القادر أحمد لە سلێمانی :

نووسینەکەت بەناوی (فەلسەفەی دلداری لە گۆرانی‌یە فۆلکلۆریەکان‌دا) خراپ نیە . بەلام حەزمان ئەکرد باشتر بە ناخی فۆلکلۆری کوردی‌دا بچیتە خوارەوەو نوسینەکانت لە رووی زمانەوانی کوردیەوە قەشەنگ‌ترو پوختەتر بێ . . تا خوێنەی کورد کەڵک‌و سوودی لێ‌وەرگرێ .

● **بەرێز کاک ابو بکر علی محمد أمین لە سلێمانی – سەرچنار–**

نامەکەتمان پێ‌گەیشت . داوای چەند ژمارەیێکی گۆڤاری رۆشنبیری نوێت کردبوو . . وا بۆمان رەوانەکردی بە سوپاسەوە . داوای سەرکەوتنت ئەکەین لە ژیان‌دا . ئومێدەوارین کە لە خوێندەواری‌دا دوا نەکەویت‌و بۆ دوارۆژ ببیتە رۆشنبیرێکی بە توانای سوودبەخش بۆ گەلی کورد .

● **بۆ بەرێز کاک کامەران مجید أمین لە سلێمانی :**

پارچە هەڵبەستەکەت بەناوی «گولی بەدفا» پێمان گەیشت . . لەبەر ئەوەی بابەتی هاوکاری‌یە ناردمان بۆ هاوکاری . برای بەرێز داواکارین کە بەرهەمی رۆشنبیری فۆلکلۆری‌و لێکۆلینەوەو شتی‌تر لەم بابەتەوە بۆمان بنووسی . . چونکە گۆڤاری ئیمە لەسەر ئەو پەیرەوە ئەروا کە بابەتی رۆشنبیری گشتی بلاوبکاتەوە . . ئیتر چاوەنواری بەرهەمی بەسوودو بەنرخت ئەکەین .

● **بۆ بەرێز کاک پەیوەند خۆشناو – کۆلێجی پەروەردە – بەغدا**

چیرۆکە وەرگێراوەکەت بەناوی (دەنك) گەیشت . . ئیمەش لەبەر ئەوەی بابەتی بەیان بوو ناردمان بۆیان . . ئومێدەوارین کە بێبەشمان نەکەیت لە بەرهەمی سوودبەخشتان . . بەسوپاسەوە .

● **بەرێز کاک کمال صابر عزیز :**

وەرگێراوەکەت بەناوی «لەناوداران بانیس ریتسوس» کە لە عەرەبیەوە وەرت‌گێراوە پێمان گەیشت زۆر پێخۆشحال ئەبووین کە ناوداری گەورەو بەناوبانگی وامان بۆ هەڵبژێری کە خوێنەری کورد کەڵکی لێ‌وەربگرێ . . وە ئەگەر لە ناودارانی کوردەوە دەست پێ‌بکەیت ئەوە باشترە . . ئومێدەوارین لەمەو دوواکەڵە پیاوی مەزنمان بخەیتە بەرچاوو ، نوسینەکەت دلگیرو سوودبەخش‌تر ئەبێ ئەگەر بێتو کوردیەکەت پوخت‌ترو دارشتنەکەی پتەوتر کەیت

# رەهەی نوێی کتێبخانەی کوردی



● سەرچاوەی ژانێکی خامۆش ●

● لە بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی لە زنجیرەی شانۆگەری چەند شانۆگەرییەکی کاك ئەمین میرزا کەریم لەژێر ناونیشانی (سەرچاوەی ژانێکی خامۆش دا) کەوتە بازارەوە .

ئەم کتێبە بریتییە لە دوو شانۆگەریی (سەرچاوەی ژانێکی خامۆش)و (بۆیاخچی) و تەمسیلی (گریێ) بۆ تەلەفزیۆن . کتێبەکە کەوتووەتە نێوان سەد لاپەرەی قەوارەی ناوەندییەوەو لە دەزگای (الحریە)لەچاپ دراوە .

● دیسان لە بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردیو لە کۆکردنەوەو ئامادەکردنی کاك عبدالرحمن نەقشبەندی کۆمەڵە چیرۆکی فۆلکلۆری (هەبوو . . نەبوو) کەوتە بازارەوە کەبە شێوەی کرمانجیی ژووروووەو ئاراستەی منداڵان کراوە .

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە بریتییە لە حەڤدە چیرۆکی فۆلکلۆریی هەمە جۆرو پێشەکییەك و فەرهەنگۆکێك لەنێوان ١٩٨ لاپەرەی مامناوەندیدا . . چەندین مۆنیفێتی تێدایە بۆ روونکردنەوەی چیرۆکەکان . . کتێبەکە لە چاپخانەی شەفیق چاپ کراوەو بەرگەکەی لە دەزگای (الحریە) .




● دیوانی جەفایی ●

● لە بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردیو لە کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی (دیوانی جەفایی) شیخ عبداللە شیخ محمد أمین عەبابەیلی کەوتە بازارەوە .

ئەم دیوانە بەشێکە لە کەلەپووری نەتەوەکەمانو ساغکردنەوەی بەرهەمی یەکێکە لە شاعیرە نەناسراوەکانمان ، دیوانەکە کەوتووەتە نێوان ١٩٦ لاپەرەی مامناوەندیو ناواخنەکەی لە چاپخانەی شەفیق چاپکراوەو بەرگەکەی لە دەزگیی (الحریە) .



● چیرۆك بۆ منداڵان ●

● دیسان لە زنجیرەی کتێبی منداڵانو ، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی کتێبی (چیرۆك بۆ منداڵان)کەوتە بازارەوە .

ئەم کتێبە بریتییە لە بیستو سێ چیرۆکی منداڵان کە لە زمانی ئەڵمانییەوە کراون بە عەرەبیو کاك کەمال غەمبار لە عەرەبییەوە کردوونی بە کوردیو کەوتوونەتە نێوان ١٦٨ لاپەرەی مامناوەندیو لە چاپخانەی (الحضارة) لەچاپدراوە .



● لە چاوەڕوانی گۆرۆدا ●

● دیسان له بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی لەم دوایی‌یەدا شانۆگەری‌ی (لەچاوەروانی گۆردۆدا) نووسینی صامۆیل بیکێت و وەرگێرانی له عەرەبی‌یەوە أحمد محمد ئابلاخی کەوتە بەردەستی خوێنەرانی کورد .

کاکی وەرگێر پێشەکی‌یەکی کورتی بۆ نووسیوەو وەرگێرانەکە کتوتووەتە نێوان (١٥٥) لاپەرەی قەوارەی بەتاڵەوەو له چاپخانەی دەزگای (الحرية) لەچاپ دراوە .

(لەعلیخانا گوفەلی) به شێوەی کرمانجی‌ی ژووروو کەوتە بەردەستی خوێنەرانی کورد زمان .

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە له دوو چیرۆکی درێژ پێك هاتوون و چیرۆکەکان له ناوچەی کوردەواری‌ی ناوچەی کرمانجی‌ی ژووروودا روویان‌داوە .

کتێبەکە کەوتووەتە نێوان (٩٥) لاپەرەی قەوارە ناوەندی‌یەوەو له چاپخانەی دەزگای (الحرية) لەچاپ دراوە .

منداڵان و منداڵانی کوردستان .

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە بریتی‌یە له سیازدە چیرۆکی جۆراوجۆر بۆ منداڵان له بەرگێکی قەشەنگ و جوانی رەنگاورەنگ و ناواخنی رەنگاورەنگدایانە کە وێنەکانی هونەرمەند عەلی مەندەلاوی کێشاونی و له چاپخانەی (المؤسسة العراقية) له بەغدا ساڵی ١٩٨١ لەچاپ دراوە .





## ● لەعلیخانا گوفەلی ●

● دیسان له بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی و له ئامادەکردن و کۆکردنەوەی کاك مستەفا نوری بامەرنی کۆمەڵە چیرۆکی فۆلکلۆری

## ● پەپوولە ●

● دیسان له ججیرەی چیرۆکی منداڵان و له بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی کۆمەڵە چیرۆکی کاك جەزا عەلی ئەمین به ناونیشانی (پەپوولە)کەوتە بەر دەستی دۆستانی ئەدەبی

کۆڕی دووه‌می ده‌زگای
ڕۆشنبیری و
بڵاوکردنه‌وه‌ی کوردی له‌ هه‌ولێر بۆ
لێدوان و کۆڵینه‌وه‌ له‌ نه‌خشه‌ی ساڵی

١٩٨١ دا



## کۆڕی دووەمی دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی لە هەولێر بۆ لێدوانو کۆڵینەوە لە نەخشەی ساڵی ١٩٨١

لە چوارچێوەی ئەو نەخشەیەدا کە دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی بۆ ساڵی ١٩٨١ دایناوە کە یەکێك لە ئەرکەکانی راپەراندنی ئەم نەخشەیە پتەوکردنی پەیوەندی نێوان ئەم دەزگایەو رۆشنبیرانو نووسەرانی کوردە ، رۆژی ١٩٨١/٣/١٤ بەرێز بەرێوەبەری گشتی مامۆستا اسماعیل رسول لەگەڵ نووسەرو رۆسنبیرانی شاری هەولێر کۆڕێکی بەست لەو کۆڕەدا بە ووردی باسی نەخشەی ساڵی ١٩٨١ی دەزگاکە کراو لەپاڵ ئەمەدا باری سەرنجی نووسەران وەرگیراو بە دوورو درێژی باسی کێشەکانی چاپەمەنی ی کوردیو چارەسەرکردنی کرا .

کۆڕەکە لە هۆڵی ژووری بازرگانیی هەولیر ماوەی سێ سەعاتو نیوی خایاندو خەڵکێکی زۆری بۆ هاتبوون . دوای ئەوەی بەرێز بەرێوەبەری گشتی لە باسەکەی بوەوە ، نووسەرانو رۆشنبیران لە نەخشەکە دووانو تووێژێکی برایانە دەستیپی‌کرد .

لە پێشەوە مامۆستا کەریم شارەزا- سەرۆکی یەکێتیی نووسەرانی کورد- لکی هەولێر چەند پێشنیارو تێبینی‌یەکی نووسراوی خوێندەوە . پاشان مامۆستایان حسین رەشوانی ، عزالدین فیضی . ممتاز حیدری ، حسین عارف ، نزار جرجیس ، ئازاد جندیانیو ،چەندبرایەکی‌تر بەشداری ووتووێژەکەیان کرد .

وا لەم چەند لاپەڕەدا پوختەیەکی ئاخاوتنو ووتووێژی ئەم کۆڕەتان پێش‌کەش دەکەین :

لەپێشەوە **عبدالله طالەبانی** بەخێرهاتنی میوانەکانی کردو مامۆستا **ئیسماعیل رەسوولی** بەڕیوەبەری گشتی دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی پێش‌کەش کرد .

**مامۆستا اسماعیل رسول- بەرێوەبەری گشتی :**

پێشەکی بەخێرهاتنی هەموو لایەك دەکەین . . ئەوەی راستی بێت ئەمە موحازەرە نی‌یە بەڵکو ووتووێژێکە لەگەڵ ئێوەی دەکەم بە ئومێدی ئەوەم گوێم لە بیرورای ئێوە بێت کە ئەدیبو نووسەری کوردی شاری هەولێرن . . وە بە پێویستمان زانی نەخشەی ساڵی ١٩٨١ ی دەزگاکەمان بۆ ئێوەی بەرێز روونبکەینەوەو گوێشمان لە پێشنیارو سەرنجو تێروانینی ئێوە بێت دەربارەی چاپەمەنی ی کوردی و ئەو رۆژنامانەو گۆڤارانەی ئێمە دەریان‌دەکەین لەگەڵ ئەو کتێبانەی بلاویان دەکەینەوە ، لە راستیدا کۆڕێکی واشمان لە بەغدا بۆ زوربەی ئەدیبو رۆشنبیران بەست بە تایبەتی دکتۆرەکانی زانکۆو پسپۆران بەشداری‌یان تێدا کردو کەڵکێکی زۆرمان لەو کۆبوونەوەیە وەرگرت .

بۆیە وامان بەباش زانی ئەم تاقی‌کردنەوەیە لە شارەکانی تریش‌دا دووبارە بکەینەوە ، ئەوا ئێستاکە لە هەولێر ئەم کۆڕە دەبەستین ، لەوانەشە بتوانین پاش هەولێر لەگەڵ رۆشنبیرانو ئەدیبانی سلێمانیو دهوك‌دا کۆببینەوە .

ئەوەی بۆ ئەم مەبەستە پاڵی پێوە ناین ئەو نامەو پێشنیارو رەخنەی نووسەرو ئەدیبانەن کە یان بە نووسین یان بە دەم پێمان رادەگەیەنن دەربارەی ئاستی رۆژنامەی هاوکاریو گۆڤاری بەیانو رۆشنبری نوێو ئەو کتێبانەی ئێمە بلاویان دەکەینەوە . سەرەرای باسی جۆری رێنووسو هەڵەی چاپو گیروگرفتی چاپەمەنی ی کوردی بەگشتی .

دەمەوێ روونی بکەمەوە کە دەزگاکەمان . دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی پێش ئەوەی ئەرکی بەرپرسیاری لە ئەستۆ بگرم نەخشەی سالآنەی نەبوو . بەلآم ئێمە ساڵی رابردوو کۆڕێکی فراوانمان بۆ هەموو فەرمانبەرانی دەزگەکەمان لە شاری بەغدا بەست . وەزیری راگەیاندنی بەرێزیش هاتبوو و لە کۆڕەکەدا ئە نەخشە کۆڵرایەوە . ئەوەبوو توانیمان نەخشەیەکی وورد بۆ ساڵی ١٩٨٠ دابنێین . ئەگەرچی لەچاو ئێمەدا ساڵی ١٩٨٠ ساڵی تاقی‌کردنەوە بوو . بەلآم سوودمان زۆر لێ وەرگرتو وای کرد بتوانین نەخشەیەکی چاکتر بۆ ساڵی ١٩٨١ دابنێین .

وەك زانراوە دەزگاکەمان لە چەند بەشێك پێك‌هاتووە . لەمانە دوو بەشی بنەرەتی کە یەکێکیان رۆژنامەنووسیو ئەوی تریان کاروباری رۆشنبیری‌یە . لە بواری رۆژنامەنووسی‌دا رۆژنامەی هاوکاری‌ی هەفتانەو گۆڤاری بەیانی مانگانە کە گۆڤارێکی ئەدەبی‌یەو . گۆڤاری رۆشنبیری نوێ کە گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتی‌یە دەردەکەین . لە کاتی خۆی‌دا ریبازی تایبەتی بۆ ئەم گۆڤارانە نەبوو ، ئەگەر بەرگی (بەیان) ت هەڵگرتبایەو بتخستایەتە سەر رۆشنبیری نوێ هیچ جیاوازی‌یەکت نەدەدی ، ناوەرۆکیان شیعرو چیرۆكو کەلەپوورو ووتارو لێکۆڵینەوەو شتی لەو چەشنە بوو ، هەردوو وەك یەك وا بوون .

ئەوەی پار کردمان ویستمان رێبازێکی تایبەت بۆ رۆژنامەنووسی‌ی کوردی لە دەزگاکەمان‌دا دابنرێت . بۆیە (بەیان)کرا بە گۆڤارێکی ئەدەبی واتە بۆ ئەدەب تەرخان کراوە . لە بەر ئەوەیە هەر ووتارێك دەربارەی ، ئەدەب بێتو بچێت بۆ گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ئ سی‌و دوو بۆ (بەیان) ی دەنێرن .

ئەنجا بۆ ئەوەی ئەو برادەرە نووسەرانەی شتمان بۆ دەنێرن . ئەوەیان لا ئاشکرا بێت . نابێت دەزگایەك سێ جۆرە چاپەمەنی دەربکات کە هەرسێکیان کتومت وەکو یەك وابن . بۆیە گۆڤاری (بەیان)بوو بە گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی‌ی رووتو هەوڵ دەدەین لە رادەیەکی وادا بێت هەموو پسپۆرانی کورد سوودی لێ ببینێو بۆ هەموو رۆشنبیرانی کورد دەست بدات . .

سەیرمانکرد . جگە لە ئەدەب دۆستان . چەند کەرتێکی تری کۆمەڵەکەمان پێویستیان بە گۆڤارێکی تایبەتی وا هەیە کە بایەخ بە رۆشنبیری گشتیو لێکۆڵینەوەی زانستی بدات لە بابەتی سایکۆلۆجیو پەروەردەو زمانەوانیو ئابووریو پزیشکیو تەکنولوجیاو . . . هەموو ئەو بابەتە زانستیانەی کە لە چوارچێوەی رۆشنبیری گشتی‌دا دەگونجێن .

بۆیە گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ) مان بۆ ئەم لایەنە تەرخانکرد . بەلآم چۆن ئەم جۆرە باسانەی بۆ ئامادە بکەین؟ لە کاتێك‌دا رۆشنبیرانی کورد هەیانە دکتۆرنو هەیانە شارەزاییان لە فیزیاو کیمیاو مێژوو و شوێنەوارو

پەروەردە و هی تردا هەیە لە وانەیە نەزانن بە کوردی بنووسن ، ئەوانەی کە نووسەری کوردن زۆربەیان لێکۆڵینەوەی ئەدەبی ، کەلەپوور ، چیرۆك ، شیعر دەنووسن ، ئەنجا لەبەر ئەوە ناچار بووین بایەخ بە وەرگێڕان بدەین ، وەرگێڕان لە زمانی عەرەبی‌و ئنگلیزی‌و رووسی‌یەوە ، ئەویش بەپێ‌ی توانای ئەو هەلانەی بۆمان رەخساوە ، بێ گومان سوودێکی باشمان لەو برادەرانە وەرگرت کە کوردی باش دەزانن ، ئاشکرایە ئەو ئەرکە تەنیا بە کارگێڕانی دەزگاکەمان ناکرێت ، بۆ ئەم ساڵیش نەخشەیەکی وورد ترمان بۆ گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ هەیە هەروەها بۆ بەیانیش لەوانەیە پاشان باسی لێوە بکەم .

(هاوکاری) یش ئەوی راستی بێت دەبێت ڕۆژانە بێت ، چونکە ڕۆژنامەیە ، لەبەر ئەوەی باری هاوکاری لەگەڵ بەیان‌و ڕۆشنبیری نوی‌دا جیاوازە ، ئەوا گەلێك لە برادەران ، نووسەرو ئەدیبان ، دەڵێن دەبێت هاوکاری زیاتر شتی ئەدەبی بلاوبکاتەوەو باسی مەسەلەی تر نەکات ،ئەم شتە لە ئارادا نی‌یە چونکە هاوکاری ڕۆژنامەیەو گۆڤار نی‌یە ، بەڵام بۆچی هەفتانە دەری‌دەکەین ، لەبەر ئەوەیە توانامان نی‌یە ڕۆژانە دەری‌بکەین ، نە کادری ئەوتوو نە چاپخانەمان هەیە هاوکاری ڕۆژانە دەربکەین ، با تەنگ‌وچەڵمەی چاپەمەنی کوردیش لەو لاوە بووەستێت کە تەنگ‌وچەڵمەیەکی ئاڵۆزە ، نەك لەچاو ئێمەدا بەتەنیا بەڵکوو لەچاو هەموو دام‌و دەزگا ڕۆشنبیری‌یەکانی تریش‌دا . .

شتێکی ئاشکرایە ڕۆژنامەی (هاوکاری) نزیکەی ١٠ تا ١١ ساڵە بەردەوام بە ڕێك‌وپێکی دەردەچێت ، ئەمەیش بۆ کورد دەستکەوتێکی چاکە کە ڕۆژنامەیەکی هەبێت ئەو ماوەیە دووردرێژە بەبێ پچڕان دەربچێت .

هەر لەبەر ئەوەشە ئێستا حەفتەی جارێك دەری‌دەکەین ئەگەر لەتواناش‌دا هەبوو بیکەین بە دوو جار یان لاپەڕەکانی زیاتر بکەین ئەوا دەیکەین سەرەڕای ئەوەی پرۆگرامێکیووردمان بۆ ساڵی ١٩٨١ بۆ داناوە ، هەروەکو دەزانن لە ماوەی ئەم دوای‌یەدا هاوکاری هەفتەی دووجار دەردەچوو بەڵام بە چوار لاپەڕە ، ئەویش بۆ ئەوەی بتوانین دەنگ‌وباسی جەنگ‌و پێداویستی‌ی ڕاگەیاندن بلاوبکەینەوە دەشمان‌ویست بە هەشت لاپەڕەو دوو جار بێت بەڵام چاپخانەی (دار الحریة) بۆی نەکرا ، ئیتر بیروڕای ئەدیب‌و نووسەرانمان کە پێ دەگەیشت تا دووبارە لاپەڕەکانی بگەڕێنینەوە ، ئەوەبوو (هاوکاری) مان گەڕاندەوە دۆخی جاران‌و لاپەڕەی یەك‌و دوو بۆ دەنگ‌وباسی ناوخۆوو دەرەوەو ووتارەکانی سەرۆکی بەڕێز ، ئەوانی تر وەکو جاران بۆ مەسەلەی گشتی . .

ئەو پەرەپێدانەی بۆ هاوکاری دامان ناوە کردنەوەی لاپەڕەی تازەیە وەکوو لاپەڕەی زانست کە باسی دوا هەواڵی زانستی‌و تەکنەلۆژی‌و پزیشکی‌و ئەو شتانەی زۆرتر پەیوەندیان بە خوێنەران‌و ڕۆشنبیرانی کوردەوە هەیە تێدا بلاو دەکرێتەوە هەروەها لاپەڕەی توێژینەوە کە باسی مەسەلەی ئابووری‌و ڕاپۆرتی دەوری دەکات . . هەروەها لاپەڕەی هونەر کە بڕیارمان داوە بەردەوام بەگوێرەی توانا مانگی دوو جار دەربچێت‌و ئێستا هونەرمەند محمد عارف لێپرسراوی ئەو لاپەڕەیە . . هەروەها لاپەڕەی ئەدەب‌و ڕۆشنبیری کە ئەوسا ئەدەب‌و ژیان بوو کە کاك عبدالرزاق بیمار سەرپەرشتی‌ی دەکات‌و پەرەپێدانێکی تێدا هاتووەتە گۆڕی‌و بەرنامەیەکی تایبەتی‌ی بۆ دانراوەو کەمەکەمە لە جێبەجی‌کردندایەو ئەو بەرنامەیە لە لاپەڕەی هەمە ڕەنگ‌و ریپۆرتاج‌دا ڕێك‌دەخەین سەرەڕای لاپەرای ئافرەت کە هەوڵ‌دەدەین شتی نوی‌ی تێ‌دا بلاوبکرێتەوە . . بە کورتی خەریکی ئەوەین هاوکاری بکەینە ڕۆژنامەیەك بتوانێت هیواو خواستی هەموو ناوەندی ڕۆشنبیری‌و ئەدەبی‌و ڕۆشنبیران بهێنێتە دی .

هەروەها لاپەڕەی وەرزش ، ئەوسا مانگی جارێك لاپەڕەی وەرزش هەبوو سەیرمان کرد ئەو خوێنەرانەی بایەخ بە وەرزش دەدەن یان بەدوا هەواڵی وەرزش دا دەچن زۆرن ، لەبەر ئەوە بڕیارمان دا هەفتەی جارێك گۆشەی وەرزش هەبێت ، نیو لاپەڕە بێت یان لاپەڕەیەکی تەواو یان جارەکە لاپەڕەیەك بەگوێرەی توانای خۆمان .

ئەوە دەربارەی ڕۆژنامەنووسی لەبارەی کاروباری ڕۆشنبیری‌یەوە کاك محمد أمین هەورامانی ، ئێستا بەڕێوەبەری کاروباری ڕۆشنبیری‌یە . . . ئاشکرایە نەخشەیەکی دووروودرێژمان لە ساڵی ١٩٨١دا بۆ کاروباری ڕۆشنبیری داناوە ، بەپێ‌ی توانای دەزگاکە کەوا لە ساڵێك‌دا تەنیا توانی چاپکردنی ٣٠٠ مەلزەمەی هەیە واتە نزیکەی ٢٥–٣٠ کتێب .

ئەوساکە کاری ڕۆشنبیری لە دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی‌دا پرۆگرامی نەبوو ، بەڵام ئێستا لەو بارە ڕزگاری بووە ، بەڵام تا ئێستا هیواو ئاواتێکە هەمانە نەتوانراوە ئەنجام‌بدرێت ئەویش لەبەر ئەوەی دەزگاکەمان دەورێکی بنەڕەتی‌ی لەم کارەدا نەبووە هەمیشە چاوەڕی‌ی بەرهەمی ڕۆشنبیرو ئەدیبانی کورد بووە بەو نیازەی بیهێنن‌و هەڵیان بسەنگێنێت‌و چاکەکەی بلاوبکاتەوە ، بەڵام بەپێ‌ی ئەو نەخشەیەی بۆ ئەم ساڵ دانراوە هەوڵ‌دەدەین هەموو بەرهەمەکان بەرهەمی ئەدەبی نەبن با ٦٠٪ ئەدەب بێت ئەو ٤٠٪ یش بۆ مەسەلەی زانست‌و زانستی مرۆڤایەتی وەك زمان‌و مەسەلەی هونەرو سیاسەت بێت .

ئەوی ڕاستی‌بێت نەخشەکە دووروورێژەو ناتوانرێت هەمووی لێرەدا بخوێنرێتەوە بۆیە سەرباسەکان باس‌دەکەین .

ئەو کۆڕەی لە بەغدا بەستمان بۆ ئەو دکتۆرو ئەدیبانە بوو کە زۆربەیان خەبیربوون‌و ویستمان باسی تەنگ‌و چەڵمەی چاپەمەنی‌ی کوردی بکەین ، واتە بیروڕایان دەربارەی چۆنیەتی هەڵبژاردن‌و چاپ‌کردنی کتێب‌و هەڵەی چاپ‌و ڕێنووس‌و رادەی باشی‌ی ئەو کتێبانەی بلاودەکرێنەوە ، لەگەڵ پێشنیار بۆ پێشختنی رادەی کتێبەکان .

لەم کۆڕەدا سوودێکی باشمان لە بیروڕاو پێشنیارەکان وەرگرت‌و زۆر بە ڕاشکاوی باسی مەسەلەکان کرا . . پوختەیەکی باسی ئەو کۆڕە لە هاوکاری‌دا بلاوکراوەتەوە .

سەبارەت بە قۆناغەکانی چاپ‌کردنی کتێب لە لایەن دەزگاکەمانەوە . . ئەوا ئەو دەستنووسانەی بۆمان دێن، لیژنەیەکمان پێك‌هێناوە بەناوی لیژنەی خوێندنەوەی سەرەتای ئەو دەستنووسانە دەخوێننەوە بۆ ئەوەی ئەو

کۆڕی دووەمی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی
کوردی لە هەولێر بۆ لێدوانی کۆلێژەوە لە دەحسەنی سێی
١٩٨١

شتەی ڕادەی بەرز نەبێت یان لەگەڵ نەخشەی ئێمەدا نەگونجێت خۆمان و لایەنی تری پێوە خەریك نەکەین ، خۆمانیش لە ڕەخنەی ناسیاوی و نەناسیاوی دووربخەینەوە .

کاری چاپکردن و وەرگرتنی ئەو دەستنووسەی لە ئەدیبانەوە دێت بە چەندین قۆناغدا تێدەپەڕێت پاش ئەوەی لیژنەکە دەیخوێنێتەوە کە ڕادەیەکی ناوەندی‌ی تێدابێت وەردەگیرێت پاشان دەدرێتە خەبیر ، خەبیرەکانیش زۆربەیان دکتۆری زانکۆن لە کوردەکان یان ئەو ڕەخنەگرو پسپۆڕە ناسراوانەی دەرەوی دەزگاکەمانن . .

پاشان کە دەستنوسەکە لەلای پسپۆڕ دەگەڕێتەوە دەینێرینە لای لیژنەی یارمەتی و بڵاوکردنەوەی ناوەندی لە وەزارەت کە خۆم ئەندامێکی ئەو لیژنەیەم و ئەوەی خەبیر بڵێت باشە ئێمە ناڵێین دەستنادات ، هەندێك جاریش بزانین ڕای خەبیرەکە دەرهەق کتێبەکە باش نی‌یەو هەقی خۆی پێ نەدراوە ئەوا دەدرێتە خەبیرێکی تر ئەنجا ئەگەر هەردووکیان ووتیان دەست نادات دوا بڕیاری لەسەر دەدرێت ، چونکە دەبێت ڕای خەبیر ڕەچاو بکرێت .

بێ گومان چەندین مەسەلە لەگەڵ شارەزاو پسپۆڕەکان لە بەغدا باس کرا ، یەکێك لەمانە ئەوەیە هەندێك جار پسپۆڕ (خەبیر) بە چاکی یان بە خراپی پەیوەندی کەسایەتی لەگەڵ ئەم ئەدیب یان ئەو نووسەرەدا کاری تێ دەکات ، ئەمەیش تەنگ‌وچەڵەمە بۆ ئێمە دێنێتە ئاراوە ، بۆیە دەبێت خەبیر مەوزووعی بێت و بەرهەمەکە چاك بخوێنێتەوەو ڕایەکەی ڕای کەسایەتی نەبێت بەڵکوو پێویستە وا بێت خاوەند کتێبەکە لەو هەلە بێبەش نەکات کە بۆی هەڵکەوتووەو زوڵمیش لە ڕۆشنبیری کوردی نەکات چونکە چاپ و بڵاوکردنەوە ئەرکێکی ئەستۆی ئێمەیەو شتی لاواز سوود بە خوێنەری کورد ناگەیەنێت و دەبێت شتی نوێ و بەرهەمی چاك و دروست و پەرەسەندوو پێشکەش بە خوێنەری کورد بکەین .

لەو تەنگ‌وچەڵەمانەی باس‌کران ، تەنگ‌وچەڵەمەی ئەوەی کە هەندێك کەس هەن یەکسەر دەزانن خەبیرەکە کێ‌یە . . ئەمەش لەوانەیە خاوەندی کتێبەکە پەیوەندی لەگەڵ خەبیرەکەدا بکات . . ئەمەیش تەنگ بە خەبیرەکە هەڵدەچنێت کە ڕەفزی کرد دەزانێت ڕەفزی کردووە . . بەڵام ئێستا کارێکی وامان کردووە نووسەر نەزانێت خەبیر کێ‌یە .

ئامۆژگاری و ڕێنوێنیشمان بۆ ئەو خەبیرانەی کە لەوانەیە لێرەش‌دا هەبن ، ئەوەیە کە ڕێبازو دەستووری دووروودرێژ هەن کە دەبێت پەیرەو بکرێن ، خەبیریش بە نووسەر نەڵێت دەستنووسەکەی تۆم لایە چونکە ئەم کارە بۆ ئەوو بۆ ئێمەیش چاکە .

هەڵسەنگاندنی کتێب توانای دەوێت ، بۆیە دەبێت خەبیر ئەو شتەی دەخوێنێتەوە بەچاکی بیخوێنێتەوە ، ئێمەیش بۆ ئەو کەسەی دەنێرین کە شارەزایی تێدا هەبێت ، پێش من دیوانی شیعریان بۆ شاعیر ناردووەو بەڵام مەرج نی‌یە شاعیر ڕەخنە گر بێت ، ئێستا ئەگەر دیوانی شیعردا شارەزا بێت ، ئەوەیش لەبەر ئەوەیان بوو کە پیشەی هەردووکیان هەر شیعرە . . . بۆیە هەوڵی ئەوە دەدەین شتێك بۆ ئەو کەسە بنێرین کە شارەزایی تێدا هەبێت ئێمە خەریکی ئەوەین ئەمە ڕەچاوبکەین و لە هەمان کاتیش‌دا لەوانەیە گەلێك دەستنووس هەبن هەموویان خراپ نەبن . . . بەشێکیان خراپە بۆیە خەبیر یان دەڵێت هەموو خراپە یان دەڵێت هەموو باشە . . واتە ڕاپۆرتی دووروودورێژ ئەوەیە باس هەڵەی ڕێنووس و زمان و باسی ناونیشانی کتێبەکەو ناونیشانی بەشەکەی بکات و خەبیر بیروڕای خۆی دەربارەیان دەربڕێت . . .وەك بەنموونە دەڵێن ئەم ناونیشانە لەگەڵ ئەم باسەدا دەست نادات . .

لەبەر ئیشکی ئەمەیباس‌کرا ، ئەگەر هاتوو خەبیر بەو چەشنە کتێبەکەی خوێندەوە ئەوا سوودی لێ وەردەگرین و ئەو کاتە بە دانەری کتێبەکە دەڵێین تۆیش دووبارە بە کتێبەکەی خۆدا بچۆرەوە . . پێشی دەڵێین کتێبەکەت وەرگیراوە ئەگەر ڕەچاوی سەرنجەکانی خەبیر بکەیت . . ئێمە ئەم ڕێبازە بەکاردێنین . . واتە ئەگەر بزانین کتێبەکە دەستدەدات ئەوا بۆ دانەرەکەی دەگێڕینەوە بۆ ئەوەی پێی‌دا بچێتەوەو تێبینی‌یەکان خەبیر جێبەجێ بکات ، کە کتێبەکەمان بۆ گەڕایەوە تەماشای دەکەین ئەگەر دەستکاری‌ی کردبوو تێبینی‌یەکانی خەبیری جێبەجێ کردبوو ئەوا کتێبەکەی بۆ چاپ‌دەکرێت .

ئێستایش هەل‌ومەرجی ووردمان داناوە بۆ ئەوەی بەرهەمی لاوازو کز بڵاونەبێتەوەو ئەگەر توانای زۆرترمان هەبوایە ئەوا لەباتی ٣٠٠ مەلزەمە ٦٠٠ مەلزەمەمان چاپ‌دەکرد چونکە هەڵبژاردنی دەستنووسی کتێب پەیوەندی‌ی بە توانای چاپکردن و بڵاوکردنەوەو بەرهەمی ئێمەوە هەیە .

لەبارەی پاداشتیشەوە حەز دەکەم بڵێم ئەو نووسەرو ئەدیبە ناسراوانەی ناوو ڕێبازو دەنگی خۆیان هەیە ئەوا بەرزترین پاداشتیان دەدەینێ یان ئەو چیرۆکنووسە ناسراوەی کە چیرۆکێکمان بۆ دەنێرێت ئەوا ڕادەی بەرزی خەڵاتی پێ دەدەین . . هەروەها شاعیرێکی باشیش . بەڵام هەیە ئچەند دێڕێك شیعر دەنێرێت ئێمە بە ئەنقەست بۆی نانووسین تاکو جارێکی دی شتی وامان بۆ نەنێرێت . . چونکە زۆر کەس هەن دەست دەدەنە پێنووس و لاپەڕەیەك ڕەش دەکەنەوەو بۆمانی دەنێرن . ئێمەیش لێپرسراوی‌یەکی مێژوویی‌یانەمان لەسەر شانە . ئەو شتانەی بڵاویان دەکەینەوە دەبێت خوێندەوار سوودیان لێ وەربگرن . مەبەستیشمان ئەوەیە ئەدیب و ڕۆشنبیران تۆزێك خۆیان ماندووبکەن و شتی نوێ پێشکەشی خوێندەوار بکەن و . . ئێمە ئێستا زۆر بایەخ بە بزووتنەوەی وەرگێڕان دەدەین و ئەو کەسەی شتمان بۆ وەردەگێڕێت پاداشتەکەی ڕاناگرین تاکوو بەرهەمەکە بڵاوبکرێتەوە بەڵکوو ڕاستەوخۆ دەدرێتە دەستەی نووسەران و دەخوێنرێتەوەو ئەگەر ئەو کەسەی ڕای‌دەسپێرین وەرگێڕانەکەی ڕەوان بوو . لەگەڵ دەقەکەدا گونجاو بوو . ئینگلیزی بێت یان عەرەبی یان هەر

زمانێکی تر ، ئەوا پاداشتی خۆی بە تەواوەتی وەردەگرێت ئیتر ئەمە پەیوەندیی بە ئەوەوە نی یە بلاوبیێتەوە یان نەبێتەوە .

بێ گومان سوودێکی زۆرمان لەم کارە وەرگرتووەو لە بەغدا کۆمەڵێکی زۆری رۆشنبیرە کوردەکان هاریکاریمان لەگەڵ دەکەن . . بگرە ئەوانەی کە ئەوساکە لە دەزگاکەماندا ئیشیان دەکردو ئێستا لە دەزگاکەماندا نەماون ئەوا هەروەکوو جاران دێن‌و بە دەزگای خۆیانی دەزانن‌و ئیشی خۆیان دەکەن‌و ئێمەیش سوپاسیان دەکەین .

لەگەڵ ئەوەیش‌دا ریتوێتمان بۆ نووسینگەی هەولێرو سلێمانی ناردووە ، ئەو کەسانەی لەوێن وەرگێران باش دەزانن‌و زمانێکی تری وەك عەرەبی یان ئنگلیزی یان هەر زمانێکی تر دەزانن‌و ئێمە سوودیان لێ وەردەگرین . . ئەوا چەند ووتارێك دەست‌نیشان دەکەین‌و بۆیانی دەنێرین یان ئەوان دەتوانن بەرهەمەکان دەست‌نیشان‌بکەن بەتایبەتی ئەوانەی بەچاکیان دەزانن . . زانست بێت یان ئەدەب یان شیعر یان چیرۆك لە ئەدەبی جیهانی بەلام بە مەرجێك رای ئێمە وەربگرن .

مەسەلەی وەرگێران ئەم ساڵ بایەخێکی زۆری پێ دراوەو لیستەیەکی دوورو درێژمان بە ناوی ئەو کتێبانە ئامادە کردووە کە دەمانەوێت وەریان بگێرین لە چیرۆك‌و شیعرو شانۆیی‌و کەلەپوورو لێکۆڵینەوەو رەخنەو رۆمان‌و . . هتد چ لە عەرەبی‌یەوە بێ یا لە ئینگلیزی‌یەوە . . ئەو لیستەیەیش لە چاپدایەو بەتامایین کتێبی رەسمی بۆ ئەدیبان بنێرین‌و تکا لە هەر یەکێك بکەین لیستەکە بخوێنیتەوەو پێنج کتێبمان بۆ دەست نیشان بکات کە بەرای ئەو برادەرە بۆ وەرگێران دەشێن .

ئەو لیستانەی کە بلاودەکرێنەوە لە پاشان‌دا لێیان دەکۆڵینەوە هەر کتێبێك زۆرتر رای لەسەر بوو ئەوا وەری‌دەگێرین . . نەك خۆمان لە دەزگاکەدا وەری‌دەگێرین . . بەڵکوو بەو ئەدیب‌و رۆشنبیرانە دەدرێت کە ئامادەن وەری‌بگێرن .

نەخشەی ئێمە ئەوەیە پشت بە وەرگێران دەبەستین بە مەرجێك وەرگێر کوردی زانێکی چاك بێت باشترە لەوەی بدرێتە لیژنەیەك هەر کەسەو بەجۆرێك وەری‌بگێرێت پاش ئەوە نازانین چۆن دەردەچێت ، پاشان دەیدەینە یەکێك پێیدا بچێتەوەو پەیتا پەیتا بلاوی دەکەینەوە بۆ ئەوەی بتوانین بزووتنەوەی داناو بلاوکردنەوە لە کێژەنگەی سەرپیی‌ی‌و ریکەوت دەربێنین‌و پرۆگرامێکی ئەوتۆ دابنێین‌و رۆشنبیری‌یەکی هەمە جۆر بلاوبکەینەوەو ئاوات‌و هیوای رۆشنبیرانی کوردی پێ پربکەینەوە جگە لەمانە هەرکەسێك کتێبێکی وەرگێرابێتە سەر کوردی یان کتێبێك پێشنیار بکات کە لە لیستەکەدا نی‌یە تا بیکا بە کوردی ، ئەگەر بەگوێرەی پێوانەی ئێمە بێت ئێمە پەسندی دەکەین .

نەخشەی ئێمەیش بۆ یەك ساڵ نی‌یە ئەوەی ئەم ساڵ پێمان نەکرا بۆ ساڵی تازەی دادەنێین هەروەها بە دەستانەوەیە نووسەرانی شارەزا راسپێرین کە لە مەیدانی پسپۆری خۆیاندا کتێبمان بۆ دابنێن ، ئەگەرچی ئەم کارە کەمێك سەرکەوتووانە نی‌یە بگرە لە عەرەبیشدا سەرکەوتوو نی‌یە بەلام ئێمە وەکوو هەوڵدان‌و پێشنیارێك پیشانی دەدەین

ئێستاش حەزدەکەین رای ئێوەو باری سەرنجتان بزانین . . فەرموون :

کریم شارەزا :

## هەندێ لە پێشنیارو تێبینی‌یەکانی یەکێتی نووسەرانی کورد – لقی هەولێر

بەناوی خۆم و دەستەی بەرێوەبەری لقی یەکێتی‌یەکەمان لە هەولێر پر بەدڵ بەخێراهاتێکی گەرمی بەرێز بەرێوەبەری گشتی‌ی دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی مامۆستا ئیسماعیل رەسووڵ دەکەین‌و هیوادارین هەردەم سەرکەوتوو بێ لە خزمەتگوزاری ئەدەب‌و رۆشنبیری گەلی کوردمان‌و دەزگاکە بکات بە سەرچاوەو مەڵبەندێکی سەرەکی بۆ جووڵانەوەی رۆشنبیری لە ریگەی دەست‌گرتنی ئەدیبی کورد بۆ چاپ‌و بلاوکردنەوەی بەرهەمەکانی‌و وەرگێرانی بەرهەم و شاکاری ئەدیبەکانی جیهان لە زمانە بێگانەکانەوە بۆ سەر زمانی کوردی‌و بە پێچەوانەوەش بە وەرگێرانی شاکاری ئەدیبە ناسراوەکانی کوردمان بۆ سەر زمانی عەرەبی‌و زمانە بێگانەکان بۆ ناساندنی ئەدەبی کوردی‌و ئەدیبی کورد بە نەتەوەکانی تر .

لێرەدا چەند پێشنیارێك دەخەینە بەر دەستی بەرێز بەرێوەبەری گشتی بەلکوو سوود لە هەندێکیان وەربگرن بۆ پێشخستنی دەزگاکەیان‌و ئەوەی کە بۆیان ناچێتە سەرو لە سەرووی وزەی ئەوانە با جاری چاوەروانی جێ‌بەجی‌کردنی دوا رۆژ بن .

١ – مەسەلەی بوونی چاپخانەیێکی تایبەت بە دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کورد مەرجێکی گرنگی‌و سەرەکی‌یە بۆ هەستانی دەزگاکە بە ئەرکی سەرشانی بە جۆریکی ریکوپێك‌و تەواو . وەك زانیومانە لە پلانی پێنج ساڵەی وەزارەتی راگەیاندن‌دا هەیە ئەو چاپخانەیە دابمەزرێت . ئایا تا ئەمڕۆ چ قۆناغێکی بریوەو گەیشتۆتە کوێ ؟

٢ – ئەگەر چاپخانەکە دوا دەکەوێ بۆ لە (دار الحریة) یا (دار الجماهیر) خەتێکی بەرهەم هێنانی چاپەمەنی دابین ناکەن تاکو بە ریکوپێکی بلاوکراوەکانتان لە هاوکاری‌و بەیان‌و رۆشنبیری نوێ‌و کتێبەکانتانی لێ چاپ‌و بلاوبکەنەوە ؟

٣ – هەوڵێکی باش‌بدرێت بۆ زۆرکردنی ژمارەی کتێبی چاپکراوتان وەك بڵێی ساڵێ چاپکراوە کوردی‌یەکان بەقەد سێ‌یەك یا چواریەکی تێکرای چاپکراوەکانی وەزارەتی راگەیاندن بن .

٤– هەوڵیکی زۆر بدرێت تاگوڤارەکانی (بەیان) و (رۆشنبیری نوێ) هەموو مانگێك بە ریکوپێکی و بەبێ دواکەوتن دەربچن .

٥ – ژمارە چاپکراوی هەر کتێبێکی دەزگاکەتان لە ٨ هەزار دانە کەمتر نەبێ ، چونکە هەرزانن بۆیە زوو سەرف‌دەبن‌و لە بازاری چاپەمەنی کوردی‌دا تەواودەبن‌و ناگەنە دەست هەموو خوێندەواریکی کورد .

٦ – دەزگاکەتان خۆی بەرهەمەکانی خۆی بلاوبکاتەوە نەك لە ریکای دار وطنیەوە پەخش‌بکرێن . چونکە خۆتان دەزانن هەر شارە چەندی لی سەرف‌دەبی‌و چۆن بلاوی‌دەکەنەوە .

٧ – کاری سەرپەرشتی‌کردنی چاپەمەنی‌یەکانیان بدرێ بە مشرف کوردی‌زان و وریا تاکو بێ هەڵەو بە جۆریکی راست‌و تەواو

چاپ بکرێن و جێگای رەزامەندی دەنەرو خوێنەران بن .

۸ – ژمارەی زنجیرەی چیرۆکی منداڵانمان زیادبکەن و ژمارەیێکی باشیان لێ چاپ بکەن تاکو زیاترین ژمارە لە منداڵانی کورد بگاتە دەستیان . دوو چاپکراوە وەرگێڕدراوەکەی «جاریکیان» و «باپیرەم گوتی» کاریکی باش بوو ، هیوادارین ساڵێ دە پانزدە چیرۆکی ئاوایان لێ بلاوبکرێتەوە .

۹ – گرنگی زۆر بدرێت بە وەرگێڕانی راستەوخۆ لە زمانە بێگانەکانەوە بۆ سەر زمانی کوردی .

۱۰ – پاداشتی بەرهەمی نووسەران بە هیچ جۆرێك لە ۱۰ دینار کەمتر نەبێ

۱۱ – پاداشتی بەرهەمی نووسەران لەسەر حیسابی ژمارەی ووشەو کورتی و درێژی نەبێ بەلکو لەسەر حیسابی باشی و پتەوی بابەتەکان بێ .

۱۲ – پارەی پاداشتی نووسەران بە چەك بنێردرێت بۆیان . لە رێگەی نووسینگەی دەزگاکەتان لە پارێزگاکاندا . تاکوو مەسرەفی چوونە بەغداو هاتوچۆیان لە کۆڵ بێتەوە .

ئەمانە بوون چەند پێشنیارو تێبینییەك لەبارەی پەیوەندی نێوان رۆشنبیری کوردو دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی . هیوادارین بەپێی تواناو باری دارایی و هونەری دەزگاکەتان سوودیان لێ وەربگیرێ و ئامانجی هەموو لایێکمان هەر خزمەتگوزاری رۆشنبیری و گەل و نیشتمانە .

**مامۆستا حسین رەشوانی :**

دوای بەڕێوەبەری گشتی چەند سەرنج و تێبینییەکی پیشان دا کە دەتوانین لەو چەند خاڵەدا پوختەیان بکەین :

۱ – ئایا هەر کتێبێك چەند دانەی لێ چاپ بکرێت و ئەو کتێبەی زوو لە بازاردا نامێنێ هەوڵ بدرێت چاپی دووەمی لێ چاپ بکرێتەوە .

۲ – زۆر کتێب هەیە نەوەکانی ئێستا نەیان دیتووەو وەکو سەرچاوە پەنجەیان بۆ رادەکێشرێت و بەردی بناغەی رۆشنبیری مێژووی نەتەوەکەمانن پێویستە چاپ بکرێنەوە .

۳ – بۆ چارەکردنی گیروگرفتی (خەبیر) وا چاکە دەزگا مەرج و پێوانەو (مواصفات)ی دیاریکراوی خۆی بۆ دابنێ و هەڵسەنگاندن لە لایەن ناوەرۆك و شێوەوە بەگشتی بێت .

**مامۆستا اسماعیل رسول :**

دەربارەی تێبینییەکانی کاك حسین . . مەسەلەی چاپ کردنەوەی کتێب . . لە راستیدا ئێمە لەگەڵ دانەر رێك دەکەوین و مافی چاپ و بلاوکردنەوەی تا سێ ساڵ لێ دەکرین . . واتا دەتوانین دووبارە چاپی بکەینەوە . بەڵام ئەمڕۆ لەو بڕوایەداین کە مادام کتێبێك چاپ کرا ئیتر با هەل بۆ کتێبێکی تریش برەخسێنین چاوی لە دنیای بلاوکردنەوەو چاپدا بکاتەوەو کتێبەکەی یەکەم با زۆر لە برەویشدا بوو بێت بای خۆی سوودی گەیاندووە . بەو مانایە شان بەشانی جۆرو چەشنی چاك دەمانەوێ ژمارەیەکی زۆرتریش کتێب چاپ بکەین . ساڵی پار (۱۹۸۰) توانیمان ۲٤ کتێب چاپ بکەین . کە ساڵی پێرار تەنیا چوار کتێب چاپ کرابوو .

لەسەر ئەوەشەوە توانای ئێمە لەڕووی چاپخانەوە ساڵی لە ۳۰ کتێب تێناپەڕێت . ئیتر بۆیە دەبێ کتێبێك کە چاپ کرا رێگە لە دەرکەوتنی کتێبێکی تر نەگرێت .

بەڵام مەسەلەی ئەو کتێبانەی نرخی مێژوویی و رۆشنبیری و کەلەپووریان هەیە . . حەزدەکەین ناوەکانیان بزانین . ئێمەیش ئامادەین ئەو کتێبەی نرخێکی زانیاری و ئەدەبی ی هەیە یان کەلەپوورە یان لەبازاردا نەماوەو ئەوە دێنێت نووسەری نەوەی ئێستا بیخوێنێتەوە ئەوا ئامادەین کە دانەرەکەی یان وەرەسەکەی قابیل بوو چاپی دەکەین .

دەربارەی مەرج و مواسەفاتی کتێب ئەوەی راستی بێت لیستەیەك هەیە بۆ خەبیر دەچێت ئەو مەسەلانەی تێدایەو بە خەبیر دەڵێت رات بەرانبەر نرخی زانستی ی ئەو کتێبە چی یە ؟ نرخی ئەدەبی ی چی یە ؟ کە باش بوو بۆچی باشە ؟ ئایا داهێنانی تێدایە ؟ ! رەسەنایەتی ی تێدایە ؟ کە بڕیاری لەسەر دا بۆچی بڕیاری لەسەر دا ؟

**ممتاز حەیدەری :**

دوای ئەوە باسی باری رۆشنبیری کوردی کرد کە بەلای ئەوەوە : (ئەوەندە هەژارو لاوازە بە کۆبوونەوەو هەڵچوون و هەڵڕشتنی دەروونی دڵسۆزان و ئێوە چارناکرێت) هاتە سەر باسی رۆژنامەی هاوکاری کە بەڕای ئەو : (ئەگەر دەستەی نووسەرانی رێنوێنی بکرێن زیاتر هۆشیار دەبن و هەڵەی رێنووس و چاپ نامێنێت) .

**بەڕێوەبەری گشتی (مامۆستا اسماعیل)**

بۆ روون کردنەوەی شێوەی رێنوێنی کردنەکە گوتی :

لە دەزگاکەی ئێمەدا هەموو شتێك بە شێوەیەکی دیموکراتییانە لێی دەکۆڵرێتەوەو دەستەی نووسەران دەسەڵاتی تەواویان هەیە . دەوری من تەنیا ئاراستەکردنە . من لەگیاندا بەشدارمو موتابەعەیەکی رۆژانە دەکەم . ئەگەر سکرتێری نووسین بانگ بکەین بۆ جێبەجێ کردنی پێشنیارێکی ئێوەیە کە بە تەلەفۆن و نامە یان نووسەران خۆیان بەکەسەر زۆر شت پێشنیاردەکەن .

**ممتاز حەیدەری .**

پار پێشنیارکرا هاوکاری مانگی جارێك لاپەڕەیەکی بۆ لاوان بێت و شتی نوێی تێدا بلاوبکرێتەوە . بەڵام ئەم پێشنیارە پشتگوێ خراوە .

**بەڕێوەبەری گشتی (مامۆستا اسماعیل)**

نەخێر پشتگوێ نەخراوەو ئەو لاپەڕەیە هەیە . بەڵام دواکەوتنی دەرچوونی جاروبار سەبارەت بە هۆی هونەری و رای سەرپەرشت و نووسەرانی رۆژنامەکەیە . هەروەها جۆری ئەو بەرهەمانەی لە بەردەست دان .

ئەمە هەمان دەردی لاپەڕەی ئەدەبی

بادینانە ، دەستەیەك لە برادەرانی بادینان عەرزو حاڵێکیان پێ داین‌و گوتیان لاپەرەی بادینی نەماوەو ، ئێمە بایەخ بە بلاوکردنەوەی بەرهەمی برا بادینانەکان نادەین عەرزوحاڵەکەیان گەیاندبووە ئەمینداری گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوان ، پاشان ئەمینداری‌گشتی کاروباری ناوەخۆیی ناوچەی ئەتۆنۆمی .

— کاك محمد أمین تەلەفۆنی بۆ کردم ووتی پێم ووتوون کاك اسماعیل خۆی بەدوای بادینیەکاندا دەگەرێت ، ووتم کاکە تۆ بیاننێرە لای من ، ئەوانیش هاتن‌و لەگەڵیان دانیشتن ئێمەیش تێیان‌گەیاندن کە بەرهەمیان بۆ بێنن ئەگەر لاوازیش بێت بلاوی دەکەینەوە بەلام ئەگەر نەبوو خۆ ئێمە لەجیاتی ئێوە نانووسین . . ئەمە مەسەلەی ئەدەبە . . بەلام لەو رایەدا نیم کە لاپەرەیەکی تایبەتی بەناوی بادینان هەبێت چونکە کوردی یەك زمانەو ئەمە مەسەلەی شێوەیەو برایەوە بەلام ئامادەین لە لاپەرەی ئەدەب‌و رۆشنبیری‌دا لە مادەیەکەوە تا سێ مادەیان بۆ بلاوبکەینەوە ، هەروەها لەم رۆژانەدا چاومان پێیان کەوت‌و پێم راگەیاندن کە کۆڕو ووتار خوێندنەوە ئەنجامبدەن مەسەلەی پارەکەشی لەسەر ئێمە . . بەلام ئەوان ئەنجامی نادەن . . هەر کەسێکیش بەرهەمی هەبێت ئامادەین بلاوی بکەینەوە .

**ممتاز حەیدەری :**

بەراستی شتی زۆر باس‌کرا ، بە دووردرێژی باسی (رۆشنبیری) کرا ، باسی (بەیان) کرا ، ئەو بابەتانەی تێیاندا بلاوەکرێنەوە هەوڵ دەدرێت بەپێی ئاوات‌و رادەی بەرز بێت بەلام گەنجی کورد بەتایبەتی خوێندەواری کورد بەگشتی تینوو تامەزرۆیە ، رۆژ بەرۆژ رادەی هوشیاریی بەرز دەبێتەوە ، عەرەبی‌یەکەی خراپەو کوردی‌یەکەی باشە ، بەلام لەگەڵ ئەوەش‌دا هەوڵ نادرێت بابەت بە ئارەزووی ئەو خەڵکە بلاوبکرێتەوە . ئەوە مەرج نی‌یە تەنیا نووسەرانی کورد بەرهەم بنێرن بەڵکوو دەبێت دەزگای رۆشنبیری بەتایبەتی (بەیان) و (رۆشنبیری) دەستەی نووسەرانیان فراوانتر بکرێن‌و ئەوەندە کارامەبن بتوانن نەخشە بۆ خۆیان دابنێن ئەگەر خەڵکی شتیان نەنارد بتوانن خۆیان شت بنووسن‌و شت ئامادە بکەن . . بەلام زیاتر شێوەیەکی راستەقینە وەربگرێت . . بگرە لەبارەی (هاوکاری)یشەوە دەبێت لیژنەیەك هەبێت ، سێ کەس شارەزای زمانی کوردی بن ئەوجا دەتوانن بەحەفتەی جارێك مادەیەك دابەزێنن یان دای نەبەزێنن . . من ناڵێم وەکوو رۆژنامەکانی جیهان بکات چونکە بگرە رۆژنامەکانی عەرەبی بەتایبەتی عیراق دواکەوتوون لەچاو رۆژنامەکانی ئەوروپاو جیهاندا بەلام رۆژنامەی — الثورة — لاپەرەی — رۆشنبیری —ی هەیە . . جا بۆ نموونە ووتارێکی ئابووری لە هاوکاری‌دا لەوە ناچێت بە گوێرەی ئاوات‌و خواستی خوێندەواری کورد بێت چونکە ئابووری گاڵتە نی‌یەو نووسین بە کوردی گاڵتە نی‌یە ، دەبێت چوار کادری چاك لە مەیدانی ئابووری‌و رۆشنبیری‌دا هەبن .

**مامۆستا اسماعیل رسول :**

قسەکانت بەجێن ، بەلام ئەگەرەی کادر ، کادری رۆشنبیر ئەگەرەیەکی سەرەکی‌یە ، بۆ چارەسەرکردنی ئەم خاڵە پەنامان بردووەتە بەر نووسەرانی دەرەوە کە بە پاداشت بێت یان بە ووتار ناردن یان بە پارچە بێت ئیش‌بکەن‌و یارمەتیمان بدەن .

**ممتاز حەیدەری :**

مامۆستا شتێکی چاکە هەوڵ دەدەن لە دەرەوەی دەستەی نووسەرانی هاوکاری‌و رۆشنبیری نوی‌و بەیان خەڵکی کۆ بکەنەوەو شتتان بۆ بنووسن بەلام رۆژنامەکە بارێکی بەردەوامی وەرناگرێت‌و ئەمە دەستوورێکەو راناوەستێت .

**مامۆستا اسماعیل رسول :**

دەبێت ئەوەش بزانن کە ئەوانە لە رۆژنامەنووسی‌دا سەریان دەردەچێت لە کورددا کەمن . دەبێت ئەو راستی‌یە لەبارەی رۆژنامەنووسی کوردی‌یەوە بزانن کە کادیری رۆژنامەنووسی زۆر نی‌یە . بەلام ئەدیب‌و نووسەر شاعیر هەن لەگەڵ ئەوەیش‌دا ئەوە ناگەیەنێت لە رۆژنامەنووسی بزانن . رۆژنامەنووسی هونەرەو توانای دەوێت .

**ممتاز حەیدەری :**

دوو سەرنجی سەرنێیم سەبارەت بە هەڵە بژێری کتێب هەیە ، ئێوە مەرجتان داناوە بۆ ئەو کەسەی سەرپەرشتی‌ی دەکات کە سەد ئیشی هەیەو چاك خۆی ماندوو ناکات لەگەڵیا رێك دەکەون ئەگەر هەڵەی تێدابوو ئەوا لە پارەکەی کەم بکرێتەوە ؟

**مامۆستا اسماعیل رسول :**

ئەوە راستە لی‌ی کۆڵراوەتەوە ، بیرم لەوە کردبووەوە کە رێککەوتنێکی تایبەتی دابنێم .

**ممتاز حەیدەری :**

زنجیرەی چیرۆکی منداڵان کە بە عەرەبی دەردەچێت با هەمان نووسین بکرێت بە کوردی‌و بە هەمان وێنەوە بە ئۆفسێت چاپ‌بکرێت بۆ منداڵانی کورد . . واشبزانم مەسەلەی نەخشەو وێنەگرتن‌و بەرێوەبردن ئەوەندەی ناوێت .

**مامۆستا اسماعیل رسول :**

ئەم ساڵ وا دەکەین . پرۆژەیەکمان لەگەڵ دایەرەی رۆشنبیری منداڵاندا هەیەو کەرێك‌کەوتووین ئەو زنجیرە زانیاری‌یە رۆشنبیری‌یانەی کە بۆ منداڵ دەست‌دەدەن هەڵیانبژێرین‌و وەرگێران بۆ کوردی‌و بەراوورد کردنەکەی بکەوێتە سەر ئێمەو ئەوانیش چاپیان بکەن چونکە ئەوان هەموو شتێکیان ئامادەیەو ئێستا نۆ نامیلکە لەو زنجیرانەی کامل الدباغ نووسیونی کراون بە کوردی ئێستا ئێمە خەریکین بەراووردیان دەکەین‌و لەگەڵیان رێك‌کەوتووین‌و کتێبیان بۆ نووسیون‌و دەڵێن لەگەڵتان بەشداری دەکەین . مەسەلەی وەرگێران‌و ئامادەکردنی لەسەر ئێمەو مەسەلەی هونەری‌و چاپکردنی لەسەر ئەوان .

**ممتاز حەیدەری :**

تکام وایە لایەك لە مێژووی کوردو ئاسەواری کورد بکەنەوە ، ئەوەندە شیعرو کۆمەڵە چیرۆکتان چاپ‌کرد تا چەند ساڵێکی تر بەشیان دەکات ، لەوەتی دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی هەیە تەنیا مێژووی «مادیەکانی» بەچاپ گەیاندووە ، ئەو کۆمەڵە شیعرانەی بە چاپتان

کۆڕی دووەمی دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی لە هەولێر بۆ لێدوان و کۆڵینەوە لە نەخشەی ساڵی ١٩٨١

گەیاندووە هەندێکیان ئەوەندە لاوازن کەس توانای خوێندەوەیانی نی یە . . ئەو کۆمەڵە چیرۆکانەی چاپ دەکرێن رێژەی گەلەکەمانی تێدا نی یە . . هیوام وایە زیاتر بایەخ بە مێژووو ئاسەواری کورد بدرێت و داوا لە رۆشنبیران بکرێت لەم رووەوە بەرهەم بهێنن و ئەوەیش بۆیان چاپ بکەن .

**مامۆستا اسماعیل رسول :**

قسەکانی بەرێزت لە جێی خۆیاندان ، ئێمە لە نەخشەی ئێستاماندا ٥٠٪ بۆ ئەدەب دادەنێین و ئەوی تر زیاتر بۆ کتێبی مێژوویی و زانستی و رۆشنبیری تەرخان دەکەین ، چاوەڕوانی ئەوەیشین نووسەرو ئەدیبان بەرهەمەکانیان بۆ بنێرن و تەماشایان بکەین و پشتگیری‌ی دەکەین . .

هەروەها شتی مێژوویی هەبێت لەسەر کورد نووسرابێت ئەوا ئێمە ئامادەین بیکەینە کوردی . جا ئێوە دەزانن چی کتێبی وا هەیە پێشنیار بکەن و ئەوەی پێشنیاری هەیە کە بە زمانێکی تر شت نووسرابێت و بڵاونەکرابێتەوە ئێمە دێین دەیکەین .

**مامۆستا عز الدین فیضی :**

دوو تێبینی‌ی بچووکم هەیە ، یەکەمیان لەبارەی چاپکردن و پارەتی‌ی چاپکردن لە لایەن دەزگاکەتانەوە ، دیارە گیروگرفتی زۆریان بڵێین قۆناغی زۆرە تا دەگاتە جێی خۆی کە بۆی چاپ بکرێت یان پارەتی بدرێت .
مەبەستمان ئەو قۆناغانەیە کە پێیدا تێ دەپەڕێت ، لەوانەیە ماوەیەکی زۆری بوێت تاکوو بڕیاری لەسەر دەدرێت . . بۆیە ئەگەر بێتوو ئەو ماوەیە کەم بکرێتەوە لەوانەیە ئیشەکە زووتر بڕوات و زوو جێبەجێ بکرێت .

**مامۆستا اسماعیل رسول :**

ئەوی راستی بێت ، ئەم مەسەلەیە کێشەیی سەرەکی ئێمە نی یە واتە ئەو بابەتانەی ئێمە بڕیاریان لەسەر بدەین لیژنەی پارەتیدان و بڵاوکردنەوەی ناوەندی نێت . ە پلەی بنەڕەتدا پشت بە رای ئێمە ئەمەستێت . .

تاکوو ئێستایش رووی نەداوە خەبیر ووتبێتی کتێبێک باشەو رەت کرابێتەوە . . کە خەبیر ووتی ئەو کتێبە لە لایەنی زمان و رێنووس و رەوانی‌یەوە باش نی یە . . ئیتر ئێمەیش ناتوانین پارەتی‌ی بدەین . . لەبەر ئەوە لیژنەی ناوخۆی دەزگاکەمان کە بەرهەمێک رادەی ناوەندی‌ی هەبێت و ئەو مەرجانەی تێدا بێت وەری دەگرێت . . ئەگەر بێتوو ئەگەرەی چاپکردنیشم نەبێت بیست دەستنووسی ساغم دەست بکەوێت منیش بە ساغی چاپیان بکەم . . ئەگەر نەکەومە وەرگێران واتە ئەگەرەی ئێمە ئەوە نی یە ئێستا بڵێین کتێب زۆرە ، هەیە ماوەتەوەو چەند قۆناغێک دوایان خستووە .

لەلایەن ئێمەوە ئەوە ئەگەرە نی یە ، چونکە ساڵی ١٩٨٠ هیچ دەستخەتمان لا نەماوەتەوە کە فریای چاپکردن نەکەوتبن ، لە راستیشدا پێویستە ماوەی وەرگرتن و هەڵسەنگاندن . هاتوچۆی کتێبێک ماوەیەکی دوورودرێژ نەخایەنێت و دەبێ بە نموونە لای خەبیر لە مانگێک زیاتر راگیر نەکرێت .

**عز الدین فیضی :**

مەسەلەی هەڵبژاردنی خەبیریش هەڵوێستێکی پێ دەوێ . لام وایە رەوا نی یە هەر ئەدیبانی بەغدا بین بە خەبیرو ئەوانی شارانی تر بێ بەش بکرێن .

**بەڕێوەبەری گشتی :**

بەڵێ . قسەکەت بەجێیە .

**عز الدین فیضی :**

ئەمەش نەک بەهۆی مەسەلەی یاداشتەکەوە . بەڵکو بەهۆی زیادبوونی پەیوەندیی دەزگاکەتان بە نووسەرو ئەدیبانی شارانەوەو بۆ سەر سووک کردنی شارەزاو ئەدیبانی بەغدا . دووری‌ی شارەکانیش نابێتە بەرهەڵست . چونکە دەتوانن چ بە دەست و چ بە پۆستە بە زووترین کات ئەمە جێبەجێ بکەن .

خاڵی سێیەم دەربارەی هۆی نەبوونی نووسینگەیەک لە دهۆک . نازانم ئەمە بۆچی وایە ؟ .

**بەڕێوەبەری گشتی :**

. ئێمە هەوڵمان زۆر داوە ، بەڵام تا ئێستا نەمانتوانیوە . پەیامنێرێک لەو شارە پەیدابکەین . بەڵام هەمیشە لەگەڵ نووسەر ئەدیبانی بادینان لەو گیروگرفتە دەکۆڵینەوەو هیوادارم بتوانین چارەیەکی بۆ دابنێین ، بەتایبەتی من زۆر لایەنگری ئەوەم کە بزووتنەوەی ئەدەبی و رۆشنبیری‌ی کورد لەو ناوچەیە پەرەبستێنێ و هەمیشە داوایان لێ دەکەم کۆڕو کۆبوونەوە ومیهرەجانی ئەدەبی و رۆشنبیری رێک بخەن و بەرهەمی ئەدەبی‌ی جوانمان بۆ بنێرن .

**مسعود پەریشان :**

پێشنیاری ئەوەی کرد کە بۆ پێگەیاندنی کادیری رۆژنامەنووس چەند کەسێک لە نووسەرو شاعیران بنێرنە دەرەوەی عێراق . پاشان باسی (هاوکاری) کردو داوای زیاتر بایەخدانی بە ئەدەب و رەخنەو لێکۆڵینەوە کرد .

**بەڕێوەبەری گشتی :**

(دوای ئەوەی باسی ئاستی راستی رۆژنامەی هاوکاری کرد لە لایەن ناوەرۆکی ئەدەبی و رۆشنبیری و رووخساری هونەری‌یەوە . ئەو هەوڵ و کۆششانەی روون کردەوە کە هەمیشە بۆ پەرەپێدان و بەرزکردنەوەی ئاستی رۆژنامەکە بەخت دەکرێ بەتایبەتی دوای ئەوەی لە رۆژانی سەرەتای شەڕدا بوو بە چوار لاپەڕە . پاشان کرایەوە بە ٨ لاپەڕەو بەو ئومێدەین کە بێ بە ١٢ لاپەڕە . . جگە لە دەرکردنی چەند ژمارەیەک بەبۆنەی ئادارو نەورۆزو نیسان هەوڵ دەدەین ئەو بەرنامەیەک لە پلانی ئەم ساڵ بۆ کاری رۆژنامەکە دامان ناوە بەجێی بهێنین . ئنجا هاتە سەر باسی چالاکی‌یەکانی دەزگای رۆشنبیری لە مەیدانەکانی رۆشنبیری گشتی داو گوتی پار میهرەجانی یەکەمی

رۆشنبیریان له هەولێر سازکردو ئەمساڵیش خەریکی ڕێکخستنی دیداری نوێی چیرۆکی کوردیو دیداری شیعری کلاسیکین ، هەروەها له ڕێگەی نووسینگەکانمانەوەو له بواری هاوکاری لەگەڵ دەزگاو کۆمەڵە رۆشنبیریو ئەدەبی یه کوردی یەکاندا ئامادەین کۆڕی فراوانی ئەدەبیو رۆشنبیریی له شارەکانی کوردستانو له بەغدا ببەستینو سەرپەرشتی گەلێك جۆره چالاکی ی هونەریو ئەدەبیی نووسەرو هونەرمەندانی کورد بکەین . هەروەها دەمانەوێ بیرەوەریی شاعیرانو ناودارانی کوردیش لەیاد نەکەینو بەپێی توانا یادیان نوێ بکەینەوه . بۆ گورپێدانی بزووتنەوەی چیرۆکنووسی کوردیش که پێویست به بایەخدانێکی زیاتر دەکات ، گرەوێکی کورته چیرۆکمان داناوه .

**نزار جرجیس :**

گوتی رۆژنامەی هاوکاری ڕوویێکی رۆشنبیریو ڕوویێکی دیکەی ڕاگەیاندنەو وای بۆ چوو که لەم کۆڕەدا لایەنی دووەم زۆر بایەخی پێ نەدراوه ، جا لەم ڕووەوه داوای پێگەیاندنی کادیری رۆژنامەنووسیی کوردی کرد ، رۆژنامەنووس به مانای هونەریو پیشەیی . ڕای وایه که له رۆژنامەکه لایەنی ئەدەبیو رۆشنبیری باڵەپەستۆ له لایەنی ڕاگەیاندن دەکات . روخساری ئەدەبی بەسەر روخساری رۆژنامەنووسیو ئیعلامیدا زاڵه ، ئەمەش چونکه سەرپەرشتانی رۆژنامەکه ئەدیبن !

**بەڕێوەبەری گشتی :**

ئێمه وای تێ ناگەین ، ئەوەی رۆژنامەکه بۆ ئەدەبو رۆشنبیریی تەرخانی کردووه دوو لاپەڕەیه ، دوو لاپەڕەش بۆ تاقه رۆژنامەیەکی کوردیی حەفتانه زۆر نی یه ، له کاتێکدا هەندێك داوای ئەوەمان لێ دەکەن که هەر هەشت لاپەرەکه بکەین به ئەدەب ، له لایەکی تریشەوه دەپرسین کام رۆژنامەی سیاسی رووت ئەدەبی بەلاوه ناوه ؟ له هەموو لایەنێکیشەوه ئەگەر پێوانەی خۆمان بکەین بوونی دوو لاپەڕەی ئەدەب بۆ رۆژنامەی هاوکاری بایسی خێرەو له چاکەی لایەنەکانی تره .

بەڵی (هاوکاری) تەنیا ئەرکی رۆشنبیریی پێ نەسپێردراوه ، ئەرکی رۆژنامەنوسیو ئیعلامیی دیاری خۆی هەیەو بێ درێغانه جێبەجێی کردووه . ئێمه تێ دەکۆشین هەنگاوی چاکتر بەرەو پێشەوه بهاوێین له پێناوی پێش خستنو گەشەپێدانی تاسەری رۆژنامەکەدا له هەموو گۆشەو لاپەڕەکانیدا ، وه لەسەر بناغەی نەخشەدانانی ئەنجامی وتوویژو لێکۆڵینەوەی شارەزایانو نووسەرانو بۆچوونی تایبەتی خۆمان له بازنەی (ڕێکەوت) رزگاری بکەین ، بەڵکو حەزدەکەین بازێك بداو چەند هەنگاو بکا به یەك . ئەگەرچی کورد گوتەنی کەس به دۆی خۆی نالێ ترشه بەڵام وابزانم له باری ئێستایدا خراپ نی یه ، ئێمەش لەناو خۆماندا سەرنجی خۆمان دەربارەی شوێنی کزیو لاوازی دەردەبرینو بۆ چارەسەریشی هەوڵ دەدەین .

**نزار جرجیس :**

لەچاو کاروباری رۆژنامەنوسیی واتا دەنگوباسو هەواڵەکان ، (هاوکاری) له ٨٠٪ پشت به هەواڵەکانی ئاژانسی دەنگوباسی عیراق (ئا . د . ع) دەبەستێت ، ئەگەرچی (ئا . د . ع) سەرچاوەیەکی سەرەکیی دەنگوباسه بەڵام رۆژنامه ئەگەر نوێنەرو پەیامنێری خۆی هەبێت له کۆڕی دەنگوباسەکانداو بەپێی باری دەروونی خوێندەواری کورد دەتوانن هەواڵ بنێرن .

ئەگەرچی رۆژنامەکەش حەفتانەیه بەڵام مەرج نی یه له ڕووداوو هەواڵ دوابکەوێت چونکه ئەگەر پەیامنێری تایبەتی خۆی هەبێ دەتوانی شتی دیاریکراوی خۆی له هەواڵەکان پیشان بدات .

**بەڕێوەبەری گشتی :**

سەرنجەکانی تۆ بەجێیه ، ئێمه لەم ڕووەوه پەیامنێرمان بۆ بەرەی شەڕ ناردووەو سەرمان له محەممەرەو قەصری شیرین داوه . مەسەلەی پەیامنێریش له پارێزگاو قەزاکانی کوردستاندا ئەوا دەبێ ئەو جۆره کەسانه لێهاتوو بنو بتوانن کارەکه به بەهرەو خۆنواندنەوه بەجێبگەیەنن ، لێرەشدا دووباره دەبێ بگەڕێینەوه سەر مەسەلەی کادیرو رۆژنامەنووس . . هەرچۆنێك بێت ، ئێمه بۆ ئەم باسه پلانی تازەمان هەیەو لەگەڵ وەزارەتو لەگەڵ نەقابەی رۆژنامەنووساندا وتووێژمان کردووه که هەر جاره چەند کەسێك له رۆژنامەنووسانی کورد بۆ خولی ڕاهێنانو سەردانی دەزگاکانی ناوەوەو دەرەوەی وڵاتو شارەزایی پەیداکردن بانگ بکەن . لەم ماوەیەدا وا بزانم سێ کەسمان لەم خولانەدا بەشداربوون ، یەکێك بۆ دەرەوەی عیراقو دووانیش له بەغدا بوو .

**ئازاد جندیانی :**

هەمیسان باسی دروست کردنو پێگەیاندنی کادیری رۆژنامه نووسیی کردو دەستی بۆ ئەوه ڕاکێشا که دەزگای رۆشنبیریی به هاوکاری لەگەڵ ئەمانەتی رۆشنبیریو لاوانو داموددەزگاکانی تر هەوڵ بدەن به نموونه له بەشی (ئیعلام) ی کولیجی ئادابی بەغدا دوو قوتابیی کورد لەوانەی له رۆژنامه ئیش دەکەن وەربگرن تا ببن به کادیری رۆژنامەنووس .

پاشان باسی ئەو کتێبانەی کرد که دەزگای رۆشنبیری چاپیان دەکاتو بڵاویان دەکاتەوەو داوای کرد لایەنی (چۆنی) بەسەر لایەنی (چەندی)دا زاڵ بکرێتو نموونەی به چەند کتێبێك هێنایەوه که لای وایه ئاستێکی هونەری بەرزیان نی یه و بڵاوکراونەتەوه .

**بەڕێوەبەری گشتی :**

زۆرم پێ خۆشه ئێوه دەربارەی ئیشو کاری ئێمه ئاگایی یەکی ووردتان هەبێت ، گوتراوه ئەوەی لەناو گۆنگەڵی ڕووداوێكدا بژی لەو کەسه جیاوازه که له دەرەوه سەیری دەکات . . دەربارەی نەخشەی ئێمه بۆ پەرەپێدانو پێگەیاندنی کادیری رۆژنامەنووسی کورد ئەوه بیرولێکدانەوەی ئێمەی داگیرکردووەو چەند کۆبوونەوەی بۆ کراوەو هەنگاوی بۆ هەڵ هێنراوه . له (ملاکی) دایەرەدا وەزیفەی نووسەرو بەجێهێنەرو وەرگێڕو نەخشەکێشو جێگری سەرەك نووسەرانو تاد . . دانراوەو سێ چوار جار له رۆژنامەکاندا جارنامه بڵاوکراوەتەوەو داوای کادیرمان کردووه بێن لەو وەزیفانه کاربکەن ، ئەمه جگه له کاری بەرۆژانەو دوای دەوامی رەسمی . . من خۆم رووم له گەڵی نووسەرو رۆشنبیران ناوه که بێن له

دەزگاکە کاربکەن . بەڵام هەر هەستێ هۆی لەو لاو لەم لا نەهەتوون . . ئێمە خەریکی ئەوەین سوود لە توانای ئەدیب‌و رۆشنبیران وەربگرین‌و لە دەرەوەی دایەرە هەندێ کاریان پێ بسپێرین بۆ نووسین‌و تەرجەمەو . . تاد . . لە لایەکی تریشەوە وەکو سەرنجمان داوە نووسەران‌و ئەدیبان بەغدا بەجێ‌دەهێڵن‌و زوربەیان وان لە شارەکانی کوردستان دا دەنیشن .

ئێستا من ئەگەر دەرگا بکەمەوە لەوانەیە زوربەی کادیرانی دەزگاکەمان هەوڵی چوونەوە کوردستان بدەن .

پێشنیار کرا بۆ پێ‌خوێندنی چەند قوتابی‌یەك لە کولیجی ئاداب – بەشی رۆژنامەنووسی ، ئەمەش لەسەر چەند مەرجێك وەستاوە ، یەکەم ئارەزووی ئەو قوتابی‌یە کوردەی کە لێ وەردەگیرێ‌و دووەم پەیوەندیی دەزگاکەی ئێمە بە زانکۆوە جۆرێکی تایبەتی نی‌یە تا بتوانین کار لە وەرگرتنی قوتابییان بکەین ، تەنیا ئەگەر لە فەرمانبەرانی دەزگاکەمان هی وا هەبن مەرجی وەرگرتنیان تێدا هەبێت دەتوانین کارێکیان بۆ بکەین .

بڕواتان هەبێت ئێمە لە هەموو کۆڕو کۆبوونەوەیەکماندا ، دەستەی نووسەران‌و لیژنەکانی دەزگاکەمان هەوڵی ئەوەمانە کادیر پەیدابکەین‌و لە ئەوانەی لای خۆمان ئیش دەکەن تەقەلا دەدەین کادیری رۆژنامە نووسیان لێ پەیدابکەین . . بەڵام ئەگەر ئاگاداری حاڵی ناو دەزگاکە بن ، دەزانن لایەنی چەندیی بەسەر لایەنی چۆنیدا زاڵە ، سەیر دەکەی ژمارەیەك دەرچووانی بەشی کوردی کۆلیجی ئادابمان هەیە کوردی‌زان نین ، ناتوانن بەچاکی لە کاری رۆژنامەنووسیدا بەشداری‌بکەن‌و بەرهەمیان هەبێت .

بۆ مەسەلەی ئاستی ئەو کتێبانەی کە ئێمە چاپمان کردوون من دەمێکە داوام لە نووسەران کردووە تا یەك بەیەك هەڵیانبسەنگێنن‌و ووتاری رەخنەییان لەسەر بنووسن ، واتا هەر ئەوەندە بەس نی‌یە بەکێك بڵێ فلان کتێب نزمەو ئەوی تر بەرزە ، وا چاکە رایەکانمان بەشینەیی‌و بە پشوو لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەو گۆڤارەکان بخەینە روو .

به نموونە دەربارەی (دیوانی خادم) گەلێ رای جیاوازمان بیستووە ، تا دوا جار داوام لە کاك کریم شارەزا کرد کە تێبینی‌یەکانی خۆی بنووسێت‌و ئەوەتا بوو بە گەلاڵەی ووتارێك کە کۆڕێکی ئەدەبی بۆ دەبەستین .

تا ئێستا نەبووە کۆمەڵە شیعری شاعیرێکی چاکمان رەت‌کردبێتەوە . ئەوەی کە چاپیشمان کردووە ، ئەگەر لە بابەتی تەشجیع‌دابینێین یان حیسابی ئەوەمان کردبێت کە رێگەی لەچاپ‌کردنی کتێبێکی تر نەگرتووە کە لەو باشتر بێت ئەوا چی تیا بەستە نی‌یە .

**حسێن عارف :**

بەڕاستی ئەم دایەوە کوردی‌یە حەوت رۆحی هەیەو کێشەو گیروگرفتی ئەوەندە زۆرە هەتا وەکو مامۆستا اسماعیل دەڵێ تێیدا نەزێت نازانی چۆنەو چی هەیە . . ئەم بارەش وەنەبێ تەنیا پەیوەندیی بە دایەرەکە خۆیەوە هەبێت بەڵکو کۆمەڵە پەیوەندی‌یەك کە بە دوخی ئەدەبی‌و رۆشنبیری‌یەوە بەستراون ئەم بارە دروست‌دەکەن .

● کاری دەزگاکە ئەوەی پەیوەندیی بە رۆژنامەوە هەیە کارێکی تایبەتی‌یەو ئێوە رەنگێ نەزانن ئەو شەوەی کە بۆ بەیانی (هاوکاری)ی تێدا دەردەچێت چەند کێشەو بێنەو بردە دێنە پێشەوە ، جاری وا هەیە تا لە پەنجەرەکانەوە رووناکی دەردەکەوێت .

یەك دوو کەس شەونخوونی لە چاپخانە دەکەن . . ئنجا مەسەلەی ئامادەکردن‌و وەرگرتنی نوێنەری دار الوطنیةو کێشەی ئەوو دواکەوتن‌و شتی ناکاوو . . تاد .

● دەربارەی ئاستی لاپەڕەی ئەدەبی (گوتی) هەڵبژاردنی بابەتەکان پشت بە باری رۆژگارو رێبازی رۆژنامەکە دەبەستێ لە لایەکەوەو لە لایەکی تریشەوە پشت بە بەشداریی نووسەران‌و ئەدیبان دەبەستێ . ئیتر لە کاتی نەبوونی ماددەی شیاودا زۆر جار بیر لەوە کراوەتەوە کە لاپەڕەکە بە سپی دەربچێت تا لەم حاڵەتە کەس گلەیی نەکات‌و نەڵێن لاپەڕەکە لاوازە !

● ئەم رۆژنامەی هاوکاری‌یە لە بنەڕەتەوە بڕیاری بۆ درابوو کە رۆژنامەیەکی ڕاگەیاندنی سیاسی بێت . بەڵام رۆژگاری وای بۆ هاتە پێشەوە کە ساڵی یەکەم‌و دووەم‌و سێیەمی هاتە سەر ئەوە کە ئەدەبی‌یەکی رووت بێت‌و ئەمەش بوو بە بەماڵ لای خوێندەوارانی کورد کە هەر دەبێ تا سەد ساڵی تریش هەر وەکو ساڵی یەکەم‌و دووەمی بێت . بەڵام ئێستا باری حەقیقەتێکی وەرگرتووەو رۆژنامەیەکی ڕاگەیاندنی سیاسی‌یە . هەروەکو چۆن (رۆشنبیری نوێ) نەشرەیەك بوو کرا بە گۆڤارێکی مانگانەی رێك‌وپێك . ئنجا من دەڵێم ئێمە دەبێ وا بێتە بەر نەزەرمان ئەوەی ساڵی یەکەم نووسیمان (هاوکاری) بگۆڕین چونکە ئەمە باری حەقیقەتەکەیە . منیش هەتا لەگەڵ ئەو رایەدام بۆ رۆژنامەیەکی دەنگوباسی سیاسی ڕاگەیاندن نەبێ ؟ یەعنی کورد پێویستی بەوە نی‌یە کە رۆژنامەیەکی لەو بابەتەی هەبێت ؟ بەڵام کە وەزعەکەی بە جۆرێکە ئەوە حیسابێکی ترە . ئەوە حیسابەکەی لە لایەکی ترە ئەگەر وەزعەکەی نەوعێك بێ یەعنی بەو کادیرەی رۆژنامەی هاوکاری ببێتە رۆژنامەیەکی دەنگوباسی ، سبەی رۆژ بتوانێ وەك هەر رۆژنامەیەکی تر رۆژانە دەرچێ . بۆچی کادیری تەواومان نەبێت . کادیرێك کە هەواڵەکانمان بۆ دابڕێژێت‌و دەزگای گوێ‌گرتن هەبێ‌و یەکسەر هەواڵ بگرێ لە دەزگاکانی ڕاگەیانی جیهانی‌یەوە . یەکسەر وەکالەتی دەنگوباسی عیراق وەری‌گرێت‌و دانی‌بڕێژێتەوە . چونکە رۆژێ لە رۆژان پێویستمان بە کادیرێك دەبێت کە رۆژنامەی سیاسی دەربکات .

ئێمە وەختی خۆی هەوڵمان دا دەنگوباسی ناوچەی کوردستان خۆمان دایبڕێژین‌و خۆمان لە لە وەکالەتی ئەنبای عیراق وەری‌دەگرین بیکەین بە کوردی‌و (بیکوردێنین !) . [illegible] پەیامنێرەکانمان وەربگرین . بەڵام ئەمەش گیروگرفتی تێ‌دەکەوت بەهۆی باری چاپخانەکانی گەیشتن‌و وەرگرتنی هەواڵەکان . هەروەها ویستمان لاپەڕەی دووەم بکەین بە لاپەڕەی

لێکۆڵینەوەی سیاسی ی جیهانی و ووتارو هەواڵی سیاسی و ڕووداوە تازەکان .

**بەڕێوەبەری گشتی** :

ئەوە ساڵێکە دەمانەوێت بیری ئەو لاپەڕەیە زیندوو بکەینەوەو بە چڕی لی ی دەکۆڵینەوە . لێرەشدا گیروگرفتی چاپخانە دەوری گەورە دەگێڕێت . بەتایبەتی مەسەلەی دەنگوباس کە دەبێ تا دوا کاتی پێش چاپ بیاندەیتێ .

**حسین عارف** :

بەڵێ کەس ئاگاداری کاتو بەڵێنی دانو وەرگرتنی چاپکردنی لاپەڕەکان نی یە ؟ بەتایبەتی کە لە ناکاوێکدا هەواڵی تازەی وا دێتە پێشەوە لەوانەیە ماددەیەکی زۆر تێكبدات . ئیتر کێشەی چاپخانەش دەبێ حیسابی تەواوی بۆ بکرێت .

**(لە دواییدا کاك حسین گوتی)** هەموو ئەو گیروگرفتانەو ئەو کەندو کۆسپانەش پێویستی بە هەوڵو کۆششی هەموو لایەك هەیە . بەتایبەتی شەخسی بەڕێوەبەری گشتی خۆی کە دەورێکی باڵای هەیەو دەتوانێت کارێکی وا بکات کە وەك دایەرەیەك هەڵسوورێتو دەستکەوت بداتە دەستەوە بەتایبەتی لە تێپەڕکردنی هەندێ مەسەلەدا کە لە دەستەڵاتی دائیرەکە خۆیەتیو رۆتین گیری نەکاتو لە سنووری پەیڕەوو دەسەڵاتدا هەوڵبدات زۆرترین کردەوە پێشکەش بکات . لە مەسەلەی (خواحافیز) لای ئەوپەڕەکەی بگرێتو لە هەولو مەرجی گشتی دا دەرفەتی کار بەکاربهێنێ .

**بەڕێوەبەری گشتی** :

زۆر سوپاس

**دارا محمد علی** :

داوای دەرکردنی گۆڤارێکی تایبەتی کرد بە فۆلکلورو هونەری میللی بۆ ئەوەی هونەرمەندان بتوانن بە وێنەو نیگاری کوردەواری بەشداری تێدا بکەنو نەریتو دابو دەستووری میللیشمان بپارێزرێت .

**بەڕێوەبەری گشتی** :

لە وەڵامی کاك دارادا دەری بڕی کە ئێمە ئیستا بایەخ بە فۆلکلۆرو کە لەپووری میللی دەدەین ، چ لە لاپەڕەی هونەری هاوکاری دا بێت ، یان لە ووتارو لێکۆڵینەوەکانی گۆڤاری (بەیان)و (رۆشنبیری نوێ) .

بەم جۆرە کۆڕەکە دوایی پێ هێندرا .

Roshinbiry Nwe
General Cultural Monthly Magazine
Issued by: Kurdish Culture and Publication House
Ministry of Culture and Information
Baghdad - Iraq

رۆشنبیری نوێ
مجلة ثقافية شهرية عامة
تصدر عن : دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام
بغــداد

رئيس التحرير
اسماعيل رســـول

نائب رئيس التحرير
فائــق جميــل

ناونیشان : دار الثقافة والنشر الكردية . ساحة الحلاني بغداد
تەلەفون ٨٨٧٥٧٩٥ پێنج خەتە

نرخی ٥٠ فلسە

ئەم ژمارەیە ٨٠٠٠ دانەی لێ چاپکراوە

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ١١٢ لسنة ١٩٧٩

مسجلة بدائرة البريد برقم ١١٩

مطبعة الاديب البغدادية | هاتف 8881232